# ناوەڕۆک

تەوەری ژمارە:



بابەتی گشتی:





تەوەری داهاتوو

# ئایدۆلۆژیا، ناسیۆنالیزم، کۆڵۆنیالیزم

## هەرەسی ناوەندە کلتوورییەکان لە سەردەمی نوێدا

یەکێک لەو گۆڕانکارییانەی بەسەر فیکری هاوچەرخدا هات و بەدوای خۆیدا ڕەنگدانەوەی لە هەموو کایەکاندا هێنا لێدان و هەژاندنی بناغەی ناوەند و سەنتەرە کلتوورییەکان بوو کە سەردەمانێک ڕەگیان لە کۆمەڵگەکان و جیهاندا داکوتابوو، بەڵام دوای پیربوونی تێزەکانی مۆدێرنە و لەقبوونی بناغەی ناوەندە کلتوورییە جێگیرەکان گوتار و مومارەسەی نوێ هاتنەکایە کە دیارترین سیمایان پەرتبوون و نەرمی و مامەڵەی پڕاگماتیکییانەیە لەگەڵ ڕووداو و پێشهاتەکانی ژیاندا، لەم سۆنگەیەوە دەپرسین:

ـ ئایا ڕۆڵی ئایدۆلۆژیا چی لێهاتووە لە سەردەمێکدا کە تاکگەرایی و فرەکلتووری باڵادەستە؟

ـ ئایا چیدی سیستمێکی بیرکردنەوەی دیاریکراوی تەسک دەتوانێت لە بەرامبەر ڕەشەبای سۆشیالمیدیا و ڕێگا زۆرەکانی دەربڕین خۆی بگرێت؟

ـ ناسیۆنالیزم و سنووری قایمی نەتەوە کە بەهۆی جیهانگیرییەوە تووشی هەڵتەکان بووە دەتوانێت لە سەردەمی شۆڕشی تەکنۆلۆژیدا بمێنێتەوە؟

ـ ئایا هەستی نەتەوەیی هیچ کاریگەرییەکی دەمێنێت لەسەر نەوەیەک کە تەنانەت بە زمانەکەی خۆشی نامۆ بێت لە سایەی بچوکبوونەوەی جیهاندا؟

ـ هۆکارەکانی پشت لاوازبوونی شوناسە توندڕەوەکان چین کەوادەکەن پێچەوانەی مێژووی سەدەیەکیان هەڵسوکەوت بکەن؟

ـ ئایا پەرەسەندنی پۆپۆلیزمە یان گەڕانەوەیە بۆ سروشتی مرۆڤ و فیترەت کە ئایۆلۆژیا دژ بە ئایین و نامۆ بە سروشتی مرۆڤەکان بەخۆیاندا دەچنەوە؟

ـ قەیرانی کۆڵۆنیالیزم و سەرابی نەتەوە سەردەستەکان ئەنجامی چییە؟

ـ ئایا کۆڵۆنیالیزم و ناسیۆنالیزم هەرەسیان هێناوە یان بە بەرگێکی نوێوە خۆیان دەنوێنن؟

ـ گۆڕانی ئایدیای کەمالییەکان و عوروبەی حیزبە عەرەبیە ڕادیکاڵییەکان و هەرەسی ئایدۆلۆژیای چەپ بۆچی دەگەڕێتەوە؟

ـ داواکارین لە نوسەرانی بەڕێز، لێکۆڵینەوەکانیان لەسەر ئەو تەوەر و بوارانەی کە ئاماژەیان پێدراوە تا ڕێکەوتی (٢٠٢٣/٧/١) بنێرن بۆ گۆڤارەکەمان.

تەوەری ژمارە

# پرسی گەنج لە کۆمەڵگەدا

ناوەندەکانی توێژینەوە جەخت لەوە دەکەنەوە مرۆڤایەتی بەرەوپێشەوە هەنگاو دەنێت و جیهان لە گەشەسەندندایە، بێگومان پشکی شێری ئەم پرۆسەیەش دەکەوێتە سەرشانی گەنجانی کۆمەڵگە، وڵاتی ئێمەش ڕێژەی گەنج تیادایە بەرزە، کەواتە پێویستە بچێتە ڕیزی ئەو کۆمەڵگانەوە کە بەرەو پێش دەڕوات و گەشە دەسەنێت. بەڵام ئایا هاوکێشەکە بەوشێوەیەیە؟ یان کۆمەڵێک مەرج و بنەما هەن بۆئەوەی گەنجەکانمان ئەوانە بن کە کۆمەڵگە پشتیان پێ دەبەستێت بۆ ئەو پێشکەوتنە؟

لەم سۆنگەیەوە گۆڤاری (خاڵ) تەوەری ئەم ژمارەی تایبەت کرد بە پرسی گەنجان لە کۆمەڵگەدا و ئاڵنگارییەکانی ئێستا و داهاتوویان، (خاڵ) دەیەوێت بپرسێت ڕۆڵی گەنجانمان لە کۆمەڵگەدا چییە؟ ژیانی هاوچەرخ چ کاریگەرییەکی لەسەر گەنجان داناوە؟ بۆچی ئینتیمای گەنجان بۆ خاک و وڵات کاڵ بۆتەوە؟ لێشاوی کۆچی گەنجان بەرەو هەندەران بۆ؟ چ کاریگەرییەکی لەسەر کۆمەڵگە هەیە؟

ئەم پرسیارانە و زۆر بابەتی دیکەمان لەسەر گەنج لای کۆمەڵێک توێژەر و نووسەری بەڕێز وروژاند، بەو ئومێدەی بتوانین خزمەتێک بە پرسی ئەم توێژە هەستیارەی کۆمەڵگە بکەین. ئەوانیش بەسوپاسەوە هەریەکەیان لە گۆشەیەکەوە قەڵەم و زیهنیان لەو بارەوە خستەگەڕ، کە لە ئەنجامدا ئەم تەوەرەی لێ پێکهات، بەوئومێدەی ئێوەی خوێنەری بەڕێزیش سوودی لێوەربگرن.





د. دانا فاضل محەمەد، ڕاهێنەر و کۆمەڵناس

# گەنجان[١] لە نێوان جیهانی خەیاڵی و جیهانی واقیعیدا

(١) لەم نوسینەدا کاتێک وشەی گەنج بەکاردەهێنین مەبەستمان تەمەنی (١٢-٣٩) ساڵە و، دەکرێت بە (٣) قۆناغەوە:
یەکەم/ لە تەمەنی (١٢–١٨) پێی دەوترێت تەمەنی نەوجەوانی.
دووەم/ لە تەمەنی (١٩–٢٩) قۆناغی ناوەندیی گەنجانە.
سێیەم/ لە تەمەنی (٣٠–٣٩) قۆناغی پێگەیشتن و کامڵبوونی گەنجانە.

## دەستپێک:

سەرەتای تەمەنی گەنجی کە بە تەمەنی نەوجەوانی ناسراوە قۆناغێکی گرنگە لە ژیانی تاک و کۆمەڵدا و بریتییە لە قۆناغی پێگەیشتنی (هزری، جەستەیی، کەسێتی) کەسەکان، بەشێک لەو پێگەیشتنە خودییە و بەشێوەیەکی سروشتی کەسەکان پێیدا گوزەر دەکەن و دەیبینن، بەشێکی تری کۆمەڵایەتییە و دەوروبەر ئاڕاستەی دەکات، هەردوو بەشەکەش کاریگەری ڕاستەوخۆ لەسەر پرۆسەی پێگەیاندنەکە دادەنێن، بەواتایەکی تر تا چ ئەندازەیەک هۆشیاری کۆمەڵایەتی و هزریی و زانستی و دەروونی لە کۆمەڵگەدا لە ئاستێکی بەرزدا بێت، ئەوەندە کرداری پێگەیاندنەکە سەرکەوتوو تەندروست دەبێت.

یەکێک لە بوارەکانی پێگەیشتن بریتییە لە تێگەیشتن لە بیرکردنەوەی گەنجان و شێوازی دروستبوونی قەناعەت و بیرۆکە و بەهاکانە، کە دواتر ڕێڕەوی ژیانیان ئاڕاستە دەکات و بەو شێوازە هەڵسوکەوت و ڕەفتارەکانیان ڕێک دەخەن، ئەو دوو چەمکەی لەم نوسینەدا تەرکیز دەکەینە سەری بریتییە لە چەمکی (جیهانی واقیعی و جیهانی خەیاڵی) چۆن دروست دەبێت، پاشان چۆن وا بکرێت تەندروست کردارەکە بە پایان بگات.

## جیهانی خەیاڵی چیە و چۆن دروست دەبێت؟

مرۆڤ هەر لە سەرەتای تەمەنیەوە زانیاریی و داتاکان دەربارەی جیهانی دەرەوەی خۆی کۆدەکاتەوە، پاشان پۆلێنی دەکات، دواتر بەشێوەی خۆی دایدەڕێژێتەوە، بەواتایەکی وردتر لە وێنە و واتا کۆنەکان، واتا و وێنەی نوێ دروست دەکات، بەمەش جیهانی خەیاڵی خۆی پێکدەهێنێت.

ئەگەر نموونەیەک لەسەر هەستی کەسەکان بۆ ڕەگەزی بەرامبەر وەربگرین، کارەکە لەو کاتەوە دەستپێدەکات کە منداڵەکان تێدەگەن ڕەگەزیان جیاوازە، سەرەتا هەرکەسێک لە ڕەگەزی بەرامبەر کەوتە بەر دیدەیان پارچەیەکی جوانی لێ وەردەگرن، چاو لە یەکێک و لوت لە یەکێکی تر هەتا دەگاتە قەد و باڵاو قژ و ڕوو، لەو پارچانە کە سەرسام بووە پێی وێنەیەکی نوێ دروست دەکات و هەندێک جار ناودەبرێت بە بووکی خەیاڵەکان، یان شۆڕەسواری خەونەکان، ئەم وێنایە دوای ئەوەی لە ڕووکەشدا تەواو بوو هەروەک چۆن وێنەکێشێک وێنە دەکێشێت، دەست دەکات بە زیادکردنی تایبەتمەندی دەروونی و ویژدانی و هزریی و کۆمەڵایەتی ... تاد بۆی.

منداڵ لە سەرەتای تەمەنی هەتا (١٢)ساڵی بەشێوەیەکی هەڕەمەکی داتا و زانیاری زۆر کۆدەکاتەوە، هەر لەگەڵ ئەو کۆکردنەوەیەدا دەست دەکات بە دروستکردنی جیهانە خەیاڵییەکەی بەشێوەیەکی سادە و سەرەتایی، بەڵام کاتێک دەگاتە تەمەنی (١٢) ساڵی نەوجەوان دەست دەکات بە کشانەوە لە پەیوەندییە کۆمەڵایەتییەکان (جیهانی واقیعی)

و له‌ به‌رامبه‌ردا جیهانی ناوه‌وه‌ (خه‌یاڵی) و لایه‌نی ده‌روونی گه‌شه‌ پێده‌دات، پاشان له‌ زانیارییه‌ کۆکراوه‌کان وێنایه‌کی ته‌واو له‌ جیهانێکی خه‌یاڵی بۆ خۆی دروست ده‌کات، دوای ئه‌وه‌ حه‌ز و خولیا و ئاواته‌کانی له‌وێدا جێ ده‌کاته‌وه‌، هه‌تا وای لێدیت چێژ له‌و خه‌یاڵانه‌ وه‌رده‌گرێت، به‌مه‌ش وێناکه‌ی ته‌واو ڕوون و ئاشکرا ده‌بێت و به‌شێک له‌ ژیانی بۆ ئه‌و جیهانه‌ ته‌رخان ده‌کات، له‌ به‌رامبه‌ردا له‌ جیهانی کۆمه‌ڵایه‌تی ده‌وروبه‌ری به‌ ئه‌ندازه‌یه‌کی گه‌وره‌ پاشه‌کشه‌ ده‌کات، له‌به‌رئه‌وه‌یه‌ ته‌مه‌نی نه‌وجه‌وانی به‌ قۆناغی داڵغه‌ و خه‌یاڵی قوڵ ناسراوه‌ و که‌سه‌کان که‌مێک گۆشه‌گیر ده‌بن و ده‌چنه‌وه‌ ناو خۆیان و له‌گه‌ڵ ئه‌ندێشه‌ و حه‌ز و جیهانه‌ ناوخۆییه‌کانی خۆی تێکه‌ڵاو ده‌بن.

جیهانی خه‌یاڵی ته‌واوی حه‌زه‌کانی نه‌وجه‌وانی تێدایه‌ به‌ (حه‌ز، ئاوات، ڕه‌نگ، ئاواز، په‌یوه‌ندییه‌کان ... تاد)، ژیان له‌و جیهانه‌دا زۆر جوان و به‌تام و ڕازاوه‌یه‌، بێ ئه‌رک و ئیشکردنه‌، فه‌رمان و توڕه‌بوونی تێدا نیه‌، هه‌موو شتێک ئاماده‌یه‌، خۆشه‌ویستی و هه‌سته‌کان له‌وپه‌ڕی به‌رزیدان، که‌سه‌کان له‌ پێگه‌یه‌کی به‌رز و شایسته‌دان، ئه‌گه‌ر پرسیار بکه‌ین بۆچی ئه‌وه‌نده‌ جوان و بێ کێشه‌یه‌؟ وه‌ڵامه‌که‌ی ئاسانه‌ له‌به‌رئه‌وه‌ی نه‌وجه‌وان له‌ جوانترینی حه‌ز و خه‌ونه‌ ئاڵتونییه‌کانی دروستی کردووه‌.

### بیبینی جیهانی واقیعی:

له‌ به‌رامبه‌ر جیهانی خه‌یاڵی جوان و ڕازاوه‌، جیهانێکی واقیعی هه‌یه‌، که‌ که‌سه‌کان تیایدا ده‌ژین، ده‌یبینن و ده‌یبیستن و هه‌سته‌کان تیایدا داتا و زانیاری وه‌رده‌گرێت، هه‌ڵسه‌نگاندن و پۆلێن، شیکردنه‌وه‌ و لێکدانه‌وه‌ ده‌که‌ن، دوای ئه‌مانه‌ چیمان ده‌ست ده‌که‌وێت؟ به‌شێوه‌یه‌کی گشتی و یه‌ک پارچه‌یی ئه‌و جیهانه‌ چۆن دێته‌ به‌رچاوی نه‌وجه‌وان؟

بۆ وه‌ڵامی ئه‌و پرسیاره‌ با هه‌ندێک نموونه‌ له‌ جیهانی واقیعی وه‌ربگرین:

- خوێندنی ئه‌کادیمی:- خوێندن بۆ ماوه‌ی (١٦) ساڵ، با بڵێین (١٠) ساڵی ڕۆیشتووه‌ له‌ ژیانی نه‌وجه‌وان و (٦) ساڵی ماوه‌، خوێندنی زۆر و پاداشتی که‌م، دوای ته‌واوکردنیش زۆربه‌یان چاوه‌ڕوانی پاداشتی ماددی ناکه‌ن، ته‌نها هه‌ستێکی مه‌عنه‌وی هه‌یه‌ که‌ خاوه‌نه‌که‌ی خاوه‌نی بڕوانامه‌یه‌، ئایا ئه‌مه‌ ئه‌وه‌یه‌ گه‌نج چاوه‌ڕێی ده‌کات و حه‌زه‌کانی تێر ده‌کات؟

- به‌رپرسیارێتی ناو خێزان:- خێزان دامه‌زراوه‌یه‌کی پیرۆزه‌، به‌ڵام گرنگییه‌که‌ی لای نه‌وجه‌وان هێشتا ده‌رنه‌که‌وتووه‌، له‌ناویدا وه‌کو هه‌موو دامه‌زراوه‌یه‌کی کۆمه‌ڵایه‌تی پێویسته‌ ئه‌ندامه‌کان به‌رپرسیارێتیان هه‌بێت، واتا نه‌وجه‌وان کوڕ بێت یان کچ پێویسته‌ یارمه‌تی دایک و باوک بده‌ن له‌ ڕاپه‌ڕاندنی ئه‌رکه‌کانیان، له‌م کاره‌شدا هه‌ست به‌قورسی

دەکەن هەرچەندە ئەرکەکەش کەم بێت، لەبەرئەوەی لای ئەو هێشتا بۆی دەرنەکەوتووە خێزان گرنگییەکەی چەندە، بگرە هەندێک جاریش بە ڕێگر دەیبینێت لەبەرامبەر حەز و کارەکانی.

- بەدەستهێنانی پارە و کەلوپەلەکان:- حەزی بەدەستهێنانی ئەو کەلوپەلانەی بەدەست گەورەکانەوەیە وەک (جلوبەرگ و مۆبایل و سەعات و سەیارە و پارە و ... تاد) خولیای هەموو نەوجەوانێکە، بەڵام خێزان و کۆمەڵگە کەمترین ئاستی بۆ دابین دەکات، لەبەرئەوەی بەڵگە نەویستە لای هەمووان کە کەسەکان دەبێت خۆیان ئەوانە بۆ خۆیان پەیدا بکەن و دایک و باوک هەر دەتوانێت ڕۆژانەیەکی کەم و سنوردار لە کەلوپەلەکانیان بۆ دابین بکات، ئەی چی بکات؟ لەلایەکەوە دەبێت بخوێنێت و زۆرینەی کاتەکانی لەوەدا بە خەرج ببات، لەلایەکی تریشەوە دەوترێت هەر کات نەوجەوان کاری کرد و پارەی بینی خوێندن پشتگوێ دەخات.

- بەدیهێنانی ئاواتەکان:- هەموو ئەوانەی نەوجەوان دەیەوێت لە (هاوسەرگیریی، کار و پیشە، خانوو، پارە، ناو و نازناو، سەیارە، کەلوپەلی جۆراوجۆر، ئازادی ... تاد) هەموو ئەوانە لە ئێستادا بۆ ژیانی نەوجەوان نزیکە مەحاڵە، نەک هەرئەوەندە بەڵکو بەدەستهێنانیان لە ماوەی چەند ساڵی داهاتووشدا هەر لە مەحاڵ دەچێت.

ئەوەی باسکرا کورتەیەکە لە جیهانی واقیعی کە نەوجەوان تیایدا دەژی، بەڕاستی ئومێد بەخش نیە، لەم حاڵەتەدا جێگرەوەیەکی ئاسانی لەبەردەستە ئەویش جیهانی خەیاڵییە، کە هەموو حەزەکان بەبێ ئەرک و زەحمەت بەجوانترین شێوە بەردەستە، لە جیهانی واقیعی دەرەوە سەرزەنشت هەیە، لە جیهانی خەیاڵی پاداشت هەیە، لە یەکەم ئەرک هەیە لە دووەم ماف هەیە، لە یەکەم بێ ئومێد بوون هەیە لە دووەم یەک پارچە ئومێدە.

لەم بارودۆخەدا نەوجەوان چی دەکات، بەدڵنیایی لە ژیانی کۆمەڵایەتی پاشەکشە دەکات و بەشێکی باش لە هزر و ژیان و کات و بیرکردنەوەکانی دەبات بۆ جیهانە خەیاڵییەکە.

### لەم بارودۆخەدا چی ڕوودەدات؟

گەنجان لە نێوان جیهانێکی واقیعی بە ئەرک بەراورد بە جیهانی خەیاڵی جوان و ڕازاوە، زیاتر حەزەکانی بەرەو جیهانی خەیاڵی دەیبات، ئەمە ئاسوودەییەکی کاتی پێ دەبەخشێت و هەموو هیوا و ئاواتەکانی لەوێدا دەهێنێتە دی، کورد وتەنی (خەیاڵ پڵاو) دەکات، ڕاستە بۆ ماوەیەک چێژ و خۆشی وەردەگرێت و هەناسەیەک دەدات و هەست بە ئاسوودەیی دەکات، بەڵام کێشەی ئەم خەیاڵانە ئەوەیە هەتا زیاتر بچێتە ناوی زیاتر حەزی لێدەکات و زیاتر ئالودەی دەبێت، بەوشێوەیەش زۆربەی کاتەکانی لەگەڵ خەیاڵ

و ئەندیشەدا بەسەر دەبات و لە پرۆسەی پێگەیاندن و بنیادنانی خۆی پاشەکشە دەکات، وەکو پەندی پێشینان دەڵێت:- (شوان تا دانیشێت مەڕەکانی دوورتر دەکەونەوە) و کۆکردنەوەیان ئەرک و ماندووبوونی زیاتری دەوێت.

گرنگترین تەمەن بۆ بنیادنانی تواناکان بریتییە لە تەمەنی نەوجەوانی واتا (١٢ – ١٨) ساڵ، لە خوێندن و فێربوونی زمان و پیشە و کارامەییە کۆمەڵایەتییەکان، لەبەرئەوەی بەرپرسیارێتی کۆمەڵایەتی و دارایی لەسەر نیە و توانای هزریی و جەستەیی لە بەرزترین ئاستدایە، هەموو ئەمانە وادەکات ئەو کارەی لەو قۆناغەدا دەکرێت ئاستی سەرکەوتنی کەسەکە لە داهاتوودا دیاری بکات، بەڵام کاتێک زۆرینەی بە خەیاڵ کردن بەسەر دەبات ئەو هەلە لەدەست دەدات و لە کاروانی سەرکەوتن دوادەکەوێت و قەرەبووکردنەوەی زۆر ئەستەم دەبێت. بەواتایەکی تر ژیان کردن لە جیهانی خەیاڵیدا وەکو دەرمان وایە، کەمێکی سوود بەخشە و گرفتێک چارەسەر دەکات، زۆرەکەشی دەبێتە ژەهر و کوشندە دەبێت.

## پێکهێنانی بەهاکان لە نێوان جیهانی خەیاڵی و جیهانی واقیعیدا:

بەشێک لە سەرکەوتنی گەنجان پەیوەندی بە بیروڕا و بیرکردنەوە و بەها تایبەتییەکانەوە هەیە، بۆ نموونە کەسانێک پێیانوایە دەبێت کەسوکار و خێزان پێویستییەکانی بۆ دابین بکات، ئەمە لە سەرەتای تەمەن ڕاستە، بەڵام تا چەند دایک و باوک دەتوانن خزمەتی منداڵەکانیان بکەن، هەندێک جار نەوجەوانان خۆیان بەراورد دەکەن بە هاوڕێکانیان کە باوکیان دەوڵەمەندە و دەتوانێت بەشێکی زۆر لە حەزەکانیان بەدیبهێنێت، بەڵام باوکی ئەم ئەو توانا داراییەی نیە، یان هەندێک لە دایک و باوکان بۆ منداڵی یەکەمیان زۆر شت دەکەن، بەڵام دواتر ناتوانن ئەوە بۆ هەموو منداڵەکانیان ئەنجام بدەن، لەم بارودۆخەدا چی ڕوودەدات؟ گەنجەکە خۆی هەوڵ نادات و باوکیشی ناتوانێت کارێکی ئەوتۆی بۆ بکات، لەم حاڵەتەدا گەنجەکە تووشی بێئومێدی و ڕەشبینی و دەستەوسان بوون دەبێت، کەواتە هەڵەکە لەکوێدایە؟ بەدڵنیاییەوە لە بیروڕا و بەها تایبەتییەکانەوەیە، ئەگەر هەر لە سەرەتاوە بە تەمای خۆی بووایە هەوڵێکی دەدا و خۆی پێ دەگەیاند.

هەندێکی تر لە گەنجان پێیانوایە حکومەت دەبێت هەموو پێداویستییەکانی بۆ دابین بکات و میدیا و سۆشیالمیدیا و ڕێکخراوە مەدەنی و پارتە سیاسییەکان ئەم قەناعەتە دەچەسپێنن، هەتا وای لێدێت گەنجەکە هەر چاوەڕوان بێت بەبێ ئەوەی هیچ ئاماژەیەک بەدەربکەوێت، حکومەتیش هەر جارەی بە بیانوویەک خۆی لە بەرپرسیاریەتییەکان دەبوێرێت، سەرەنجام گەنجەکان شوێنی دروشم و پیاهەڵدانەکان دەکەون و لە قەناعەتیاندا دروست دەبێت، کە ئەگەر حەق نەدرا دەبێت بسەنرێت، ئەمە زۆر باشە

ئەگەر توانرا بسەنرێت، بەڵام ئەگەر وادەرنەچوو، گەنجەکە دەستبەتاڵ دەمێنێتەوە، نەخۆی کارێکی کرد و نە حکومەت هیچی بۆ دابین کرد، کەواتە هەڵەکە لەکوێدایە؟ بەها و قەناعەتەکان دەرفەتی گەڕانەوە و هەڵسەنگاندن و ئەگەرەکانی بۆ نەهێشتووەتەوە، ئەم حاڵەتە دیاردەی وازهێنان و دوورکەوتنەوە لە هاوسەرگیریی لێدەکەوێتەوە، لەبەرئەوەی سەقفی داواکاریی و چاوەڕانییەکان ئەوەندە بەرزبووە ئەستەمە لەوێوە دابەزێتە ئەو ئاستەی کوڕان و کچان بەبێ هیچ پێداویستییەکی ژیان ئامادەی پێکهێنانی ژیانی خێزانی بن. کەواتە گرنگە بزانین، ئەو بەها و قەناعەتە تایبەتییانەی گەنج لە کوێوە دروست دەبێت؟

بەکورتی دەتوانین لەم خاڵانەی خوارەوە کورتی بکەینەوە و ئەم کەناڵانە سەرچاوەیەکی گرنگن بۆ پێکهێنانی قەناعەت و بەهاکان، کەناڵەکانیش بریتین لە:-

- ڕای گشتی.
- پڕوپاگەندە.
- میدیا و سۆشیالمیدیا.
- قسەی ناو گرووپی هاوڕێیان.
- دروشم و داواکارییە جەماوەرییەکان.
- هاندانی کەس و لایەنەکان بە ئاڕاستەیەکی دیاریکراو.
- بیروڕای کەسە دەرکەوتووەکان، لەگەڵ چەندین کەناڵ و کەس و دامەزراوەی جۆراو جۆری تر.

ئەوەی جێی تێبینییە دوو کەس لەناو ئەم گرووپ و کەناڵانەدا بوونیان لاوازە، یەکەمیان خودی گەنجەکەیە، دووەم کەسە بە ئەزموونەکانە، کەواتە چی ڕوویدا؟ قەناعەت و بەهاکان دروست بوو بەشێوەیەکی هەڕەمەکی و بێ بەرنامە، ئەمەش وادەکات ئەو قسانە جیهانێکی تەواو خەیاڵی لە مێشکی گەنجەکەدا دروست ببێت کە ئەوەندە بەرز و خەیاڵی و نموونەیی بێت بەدیهێنانی لە خەون و خەیاڵ بچێت، ئەمەش سەرئەنجام هەردوو جیهانی خەیاڵی و جیهانی واقیعی لای گەنجانی لەیەکتر دوورتر دەخاتەوە.

بەکورتی و بە پوختی بەهاکان لەو شوێنەوە دروست دەبن کە حەز و خەون و ئاواتەکانی تێدا جێگیرە و کەسەکان کەسێتی و بوونی خۆیانی تێدا دەدۆزنەوە، ئەم بەشەش جیهانی خەیاڵی نوێنەرایەتی دەکات، بەڵام ئەوەی دەگوزەرێت و دەبینرێت و هەڵسوکەوتی پێدەکرێت جیهانی واقیعییە کە بوونێکی بەرجەستە و بینراوی هەیە.

### ئەنجام:

پرسیارێک دێتە پێشەوە و دەوترێت باشە ئەگەر جیهانی خەیاڵی و واقیعی نێوانیان

زۆر بێت چی ڕوودەدات؟ یان ئەگەر هەموو بەهاکان لە جیهانی خەیاڵییەوە دروست بووبێت گرفتی چیە؟

بۆ وەڵامی ئەو پرسیارە نموونەیەک دێنینەوە، لە بەها تایبەتییەکاندا هەیە، هەرکەسێک زانیاریی و ئەزموون و توانای زۆرتر بێت و دڵسۆزانە و چالاکانەتر هەوڵیدا، بەدڵنیایی دەستکەوت و ماف و پلەی باشتری دەست دەکەوێت، بەڵام لە جیهانی واقیعیدا ئەم بەها و بۆچوونە چەند ڕاستە؟ یان چی ڕوودەدات کاتێک کەسێکی بێ ئەزموون، کەم زانیاری، نا دڵسۆز، نا چالاک، پێش ئەو گەنجە دەکەوێت لە دەستکەوتنی کار و پیشەدا؟ لێرەدا شەڕ دروست دەبێت لە ناخی کەسەکەدا، لەبەرئەوەی پێوانەکان پێچەوانە دەبنەوە، ئەوەی کە دەبوو ڕووبدات، پێچەوانەکەی بینرا، کەسەکان لەم بارودۆخەدا تووشی نائومێدی دەبن.

گەنجێک لە جیهانی خەیاڵی خۆیدا بۆ ژیانی هاوسەری داهاتووی وێنایەکی جوانی کێشاوە، هاوسەرێکی نایاب، جوان، زیرەک، خاوەنی کەسێتی بەهێز، پاشان خانوویەکی خۆش، سەیارەکی گرانبەها، منداڵی جوان و ژیکەڵە، هەموو شتێک لە شوێنی خۆیەتی، وەک بڵێی خۆی وێنە کێشەکەیە، هەمووان دەزانن کە ئەمە بەوشێوەیە نایەتەدی، بەڵام هەموو گەنجەکان ئەم وێنەکە دەکێشن، دواتر کاتێک بەوشێوەیە بۆیان جێبەجێ نابێت، تووشی بێ ئومێدی و نیگەرانی گەورەیان دەکات و ژیانیان لێ تاڵ دەبێت.

**بەهاکان لەو شوێنەوە دروست دەبن کە حەز و خەون و ئاواتەکانی تێدا جێگیرە و کەسەکان کەسێتی و بوونی خۆیانی تێدا دەدۆزنەوە.**

جیهانی خەیاڵی و واقیعی ئەگەر زۆر لەیەک دوور بوون ئەوە نیشانەی ئەوەیە خاوەنەکەی لە کێشەیەکی گەورەدایە و ئامادەیە بۆئەوەی گرفتی دەروونی بۆ دروست ببێت، هەر ئەوەند نا، بەڵکو هەست کردن بە بێزاریی و نارەزایەتی لەوانەیە لە ژیانی کۆمەڵایەتی دووری بخاتەوە و لە هەوڵ و تێکۆشان ساردی بکاتەوە، لەجیاتی ئەوەی خۆی بۆ خۆیی و دەوروبەر بسەلمێنێت، هەستی پشتبەستن بە دەوروبەر وەک دایک و باوک و کەسە نزیکەکان بۆ دروست دەبێت و تا تەمەنێکی گەورە لەگەڵی دەمێنێتەوە، لەوانەشە تا کۆتایی تەمەن لەگەڵی بەردەوام بێت.

## چارەسەر:

دروستبوونی بیرۆکەی جیهانی خەیاڵی نموونەیی لای گەنجان حاڵەتێکی ئاسایی و تەندروست و باشە، بەڵام زیادەڕەویی و نقوم بوون تیایدا کێشە دروست دەکات و لە ژیانی واقیعی دووری دەخاتەوە، لە جیهانی واقیعدا چاوەڕێی کار و بەرهەم و دەستکەوت و سەرکەوتن لە گەنج دەکرێت، بەڵام ئەو خەریکی نقوم بوون و مەلەکردنە لە جیهانی خەیاڵیدا و کەمترین وزە و توانا بۆ جیهانە واقیعییەکەی بە خەرج دەدات، بەوەش نەک هەر سوودی بۆ دەوروبەر نابێت، بەڵکو دەبێتە بار بەسەر کەسوکار و دەوروبەر و کۆمەڵگەوە، بۆ تێپەڕاندنی ئەو بارودۆخ و حاڵەتە ئەم پێشنیازانە دەخەینە بەردەست بەئومێدی کەم کردنەوەی کاریگەرییە خراپەکانی زۆر خەیاڵ کردن و ئالوودەبوون پێیەوە...

## ١- نەوجەوان:

وەکو پێشتر باسمان کرد نەوجەوان لە تەمەنی (١٢) ساڵی بە دواوە وردە وردە لە ژیانی کۆمەڵایەتی پاشەکشە دەکات و لەگەڵ جیهانە خەیاڵییەکەی خۆی تێکەڵ دەبێت، تا ئێرە باشە، بەڵام ئەوەی کە خراپە پەیوەندییە کۆمەڵایەتییەکانی بەتەواوی بپچڕێنێت و چالاکی کرداری نەمێنێت، لەو حاڵەتەدا جیهانی خەیاڵی و واقیعی زۆر بەخێرایی لەیەکتر دوور دەکەونەوە، چارەسەر بریتییە لەوەی گەنج لەو بارودۆخەدا نەهێڵرێت پەیوەندی لەگەڵ کەسوکار و هاوڕێی و دەوروبەر بەتەواوی بپچڕێنێت، کێشە نیە کەم ببێتەوە، بەڵام نەگاتە ئاستی ئەوەی نەیمێنێت، ڕۆڵی خێزان لێرەدا دەردەکەوێت کە قەرەبووی پەیوەندییە پچڕاوەکانی بە پەیوەندی تر بۆ بکاتەوە، لەوانە دەتوانرێت سەرقاڵ بکرێت بە هەندێک هیوایات و کار و پیشە و وەرزش و بۆنە و ئاهەنگی خێزانی ڕێکبخرێت و بەڕێوەبردن و ڕێکخستنی بدرێتە دەست گەنجەکان، لەبەر دوو هۆکار، یەکەمیان هەست بە بوون و ڕۆڵی خۆیان دەکەن، لە لایەکی ترەوە پەیوەندییەکانیان بە زیندوویی دەمێنێتەوە، دەرفەتی ئەوەشی بۆ دەڕەخسێت بیروڕاکانی لەگەڵ کەسانی بە ئەزموون تاووتوێ بکات.

## ٢- دایک و باوک:

دایک و باوک گرنگە خولی تەندروستی دەروونی پەروەردەی نەوجەوان و شێوازی هەڵسوکەوت لەگەڵیاندا وەربگرن، پاشان بواری بزنس و هیوایات و دۆزینەوەی بەهرەکان بۆ نەوجەوانان فەراهەم بێنن، بەمەبەستی ڕێکخستنی پەیوەندییەکانیان لە ژیانی واقیعدا.

### ٣- مامۆستا و پەروەردەکاران:

ئەو کارامەییەی زۆر پێویستە بۆ مامۆستایان و پەروەردەکاران بریتییە لە هونەری دروستکردنی پەیوەندی سەرکەوتوو لەگەڵ نەوجەوان، ئەویش بە پێدان و بەخشینی خۆشەویستی بێ مەرج، کاتێک ئەو پەیوەندییە سۆزدارانەیە دروست بوو، پردی پەیوەندییەکان ئەوەندە بەهێز دەبێت دەتوانرێت بیرۆکە و ڕەفتار و هەڵسوکەوتی بە ئاسانی بۆ بگوێزرێتەوە.

### ٤- ڕێکخراو و دامەزراوە کۆمەڵایەتییەکان:

ئەو کارامەییەی پێویستە ڕێکخراو و دامەزراوە کۆمەڵایەتییەکان هەیانبێت بریتییە لە هونەری بەگرنگی زانینی ئەم قۆناغە و بەگەڕخستن و دۆزینەوەی بەهرە و تواناکان، هەروەها زیادکردنی کارامەیی و شارەزایی جۆراو جۆرە بۆ نەوجەوانان و ڕەخساندنی هەلی خۆ سەلماندن و ڕۆڵ بینینی چالاکانەیە.

### ٥- کۆمپانیا و دامەزراوە قازانج ویستەکان:

خاوەن کارەکان لە قازانجیانە سوود لە وزەی ئەم تەمەنە وەربگرن لە چەند ڕوویەکەوە، یەکەم وزە و توانای زۆریان هەیە، دووەم کرێی کەمیان دەوێت، سێیەم وابەستەییان کەمە و مۆڵەتیان پێویست نیە، چوارەم هەموو جۆرە کارێک دەکەن، بێجگە لەوەی کە ئەگەر ئەو کارەیان کرد بەرپرسیارێتییەکی کۆمەڵایەتی گەورەیان لەئەستۆگرتووە، کۆمەڵگەیان لە کاری ناپەسەند پاراستووە و گەنجانیان بەکاری بونیادنەرەوە سەرقاڵ کردووە.

### ٦- کۆمەڵگە و حکومەت:

کۆمەڵگە و حکومەت کاری زۆریان پێ دەکرێت و بەرپرسیارێتی گەورە لە ئەستۆی ئەوانە، لەبەر ئەوە دەتوانن ئەم کارانە ئەنجام بدەن، کە بە قازانج و سوودی هەمووان کۆتایی دێت، کارەکان بریتین لە:-

- کردنەوەی یانەی وەرزشی و دۆزینەوەی بەهرە و توانا جەستەییەکان.
- کردنەوەی سەنتەری دەسترەنگینی و زانستی و پیشەیی.
- ئەنجامدانی پێشبڕکێی جۆراوجۆر بەمەبەستی سەلماندنی خۆیان.
- ڕەخساندنی هەلی کار و بزنس کە گونجاو بێت لەگەڵ خوێندن و تەمەن شارەزاییاندا.
- بەرنامەی جۆرارجۆری میدیا و سۆشیالمیدیا بۆ دابینکردنی حەز و ئارەزووەکانیان.
- دروستکردنی بۆنە و ئاهەنگ بۆ کۆکردنەوەی گەنجان و ناساندنی توانا و بەهرەکانیان.
- هۆشیارکردنەوەی خێزانەکان لەڕێی خول و سیمیناری جۆراوجۆر سەبارەت بەو تەمەنە و پێداویستییە دەروونی و بایۆلۆژییەکانیانەوە.

## قسەی کۆتایی:

جیهانی واقیعی ئەوەیە کە تیایدا دەژین، بەڵام جیهانی خەیاڵی ئەوەیە بە خێرایی لە مێشکی نەوجەواندا دروست دەبێت، کاتێک ئەو دووانە نێوانیان زۆربوو کێشە دروست دەکات، بەڵام ئەگەر نێوانیان زۆر نەبوو، ئەوا دەبێتە پاڵنەرێکی گەورە بۆ سەرکەوتن و گەورەبوونی گەنجان و خۆسەلماندنیان لە بواری کرداریدا، ئەو کار و سەرکەوتنەش بەشە گەورەکەی بە دایکان و باوکان و مامۆستایان دەکرێت، تا چەند شارەزا و کارامە بن ئەوەندە بەرهەمەکەیان جوان و ڕازاوە و گەشەسەندوو دەبێت.

## سەرچاوەکان


١- دانا فازیل محەمەد: ڕۆڵی پێگەکانی پەیوەندیی کۆمەڵایەتی لە پێکهێنانی هۆشیاریی سیاسیدا، تێزی دکتۆرا، زانکۆی سەڵاحەددین/ هەولێر، ٢٠٢٠.

٢- محمد أحمد بيومي: علم إجتماع القيم، دار المعرفة الجامعية، القاهرة، ٢٠٠٢.

٣- ماجد الزيود: الشباب والقيم في عالم متغير، دار الشروق للنشر والتوزيع، عمان، ٢٠٠٦.

٤- جيل الأنترنيت، دون تابسكوت، ترجمة: حسام بيومي، كلمات عربية للترجمة والنشر، القاهرة، ٢٠١٢.

٥- تقدير الذات والثقة بالنفس، حقيبة تدريبية، مركز (تنمية) لإخراج الحقائب التدريبية، الجزائر، ٢٠٢٠.

6- Family and School Understood as Agents of Socialization, Lonut Anastasiu, Bucharest University of Economic Studies, Bucharest, 2011.

7- The Impact of Social Media on Social Movements, Amandha Rohr Lopes, Creighton University, USA, NE, Omaha, 2014.

لەم پوختە نوسینەدا دەمەوێ بە کورتی تیشک بخەمە سەر پێکهاتەکانی شوناس. ئەگەر پرسیار بکەین؛ ئەوەی کە مرۆڤێکی پێدەناسرێتەوە بریتییە لە چی؟ دەتوانین بڵێین شوناس، چونکە شوناس ئەو هێمایانەن کە، کەسێکیان پێدەناسرێتەوە و، ناسێنەری مرۆڤن. بەڵام مرۆڤ بە تەنیا ناتوانێ ئەو هێمایانە بەرهەم بهێنێ، بۆ وێنە زمان (کە هێمایەکی جیاکەرەوەی شوناسە) بۆ دروستبوونی و بۆ ئەزمونکردنی پێویستی بە کۆمەڵێک کەس هەیە، ئەمە بۆ هەموو هێماکانی دیش کە لەم کورتە نوسینەدا ئاماژەیان بۆ دەکەم هەر دروستە، مرۆڤ دروستکراوێکی جڤاکییە؛ تەنها کۆمەڵێک مرۆڤ پێکەوە ژیان پێکدێنن. تاکەکەس هەڵگری هێماکانی شوناسە، دەگونجێ بەرجەستەکەریشیان بێ، بەڵام داهێنەریان نییە. بەو ئەندازەیەی کە تاکەکەس ئەندامە لە کۆمەڵێکی خاوەن شوناس لەو کۆمەڵەوە چەند هێمایەکی جیاکەوەرە وەردەگرێ، بە بەراورد لەگەڵ مرۆڤێکی دی کە ئەندامە لە کۆمەڵێکی دی و خاوەن شوناسێکی جیاوازن.

دەتوانین هێما جیاکەرەوەکانی شوناس پۆلێن بکەین بۆ دوو بەش؛ بەشی یەکەم کە هێما بنەڕەتییەکانن، بریتین لە کلتوور، باوەڕ، لەگەڵ کردەپەرستش. بەشی دووەمیان بریتین لە پۆشاک، زمان، لەگەڵ شێوەو ڕەنگ (مانین ناش ١٩٩٦: ٢٤). ئەگەر هەڵوەستە لەسەر هەریەک لەوانە بکەین دەتوانین بەپوختی و گوشراوی بڵێین کلتوور بریتییە لەو ڕێسایانەی کە پەیوەندی نێوان مرۆڤەکان ڕێکدەخەن، شێوازی مامەڵەیان لەگەڵ یەک دیار دەکات (بەرجەستەبووی ژیانی ڕۆژانەیانە). باوەڕ، ئەو ڕێکارەیە کە مرۆڤەکان بەهۆیەوە مانای بوونی خۆیان دەکەن؛ قسە لەسەر کۆمەڵێک نەبینراو دەکەن؛ ئەوە کە لەکوێوە هاتوون بۆ ناو ژیان، مەبەست لە هاتنیان بۆ ژیان چییە، لەدوای ژیان بۆکوێ دەڕۆن - ئەوەش مرۆڤ دەبەستێتەوە بە هێزی نەبینراو (بەڵام هەست پێکراو)ەوە و پەیوەندی مرۆڤ بە دوای ژیانەوە پێناسە دەکات و دەبێتە پێناسی. کردەپەرستش، لەژێر ڕۆشنایی باوەڕ، جا ئەو باوەڕە زەمینی بێ یا ئاسمانی، پەیوەندی کەسەکان بەیەکەوە ڕێکدەخات. بۆ وێنە، ئەگەر بەشێک لە کلتوور بریتی بێ لە مامەڵەکردن لەگەڵ کەسێکی نزیکتدا، کردەپەرستش، لەژێر ڕۆشنایی باوەڕدا پێت دەڵێ کە چۆن هەڵسوکەوت بکەی و لەبەرانبەریدا پاداشت و سزایەک دەناسێنێ.

هێما لاوەکییەکان بریتین لە پۆشاک، چ جۆرە جلوبەرگێک لەبەر دەکەی، (بۆچی بەمانە دەڵێم هێمای لاوەکی، چونکە، پۆشاک و زمان و شێوە و ڕەنگ دەبنەوە بە بەشێک لە کلتوور). زمان، کاتێک کە بە کوردی دەدوێی، ئەمە تۆ جیا دەکاتەوە لە کەسێک کە بە زمانی فارسی، عەرەبی یا تورکی دەدوێ. زمان گرنگییەکی ناوەندی هەیە لە

دروستکردنی بیری هاوبەش و تێگەیشتنی هاوبەش، کەئەمانەش پێشمەرجەی کاری هاوبەش و پێکەوەیین. شێوە و ڕەنگ، ئێمە شێوە و ڕەنگمان دیارە زیاتر بەو ڕەنگ و شێوەی کە هەمانە ناسراوین و ئەوەش جیامان دەکاتەوە لە کەسێک کە بەڕەچەڵەک خەڵکی ئەوروپا یا ئەفریقایە. ئەم بنەمایانە، وەک هێمای جیاکەرەوەی شوناس پێمان دەڵێن کە کێ بەشێکە لە کۆمەڵێکی نەتەوەیی، و کێ دەکەوێتە دەرەوەی بازنەی ئەو کۆمەڵە نەتەوەییە.

بۆیە ئەو نیشانانە، چ هێمای بنەڕەتی بن چ هێمای لاوەکی، دەبێ بەرجەستە بن (وەک کردەپەرستش)، بەرهەست بن (وەک باوەڕ)، بینراوبن (وەک پۆشاک)، بیستراو بن (وەک زمان) و ئەزمونکراوبن (وەک کلتوور)، ئەمانە دەبێ بە بەردەوامی ئامادەییان هەبێ بۆئەوەی ببن بە بەشێک لە ژیان. چونکە ئەو نیشانانە نەک هەر دەبن بە پێناسی کۆمەڵێکی نەتەوەیی، بەڵکو ئەو نەتەوەیە دروست دەکەن. بۆ وێنە، ئەو هێمایانە نەک هەر ئەوەی کە کوردێک جیادەکەنەوە لە تاکێکی فارس یا تورک لەڕێگەی ناساندنییەوە وەک کەسێکی جیا لەوان، بەڵکو بوونێکی تایبەتیش دەدەن بە تاکی کورد ئەو بوونە لە دابونەریت و زمان و پۆشاکیدا بەرجەستە دەبێ – بەواتایەکی دی بوونی کلتووری کۆمەڵایەتی دەدەنێ. لە کۆتایی ئەم نوسینەدا هەڵوەستەیەکی لۆژیکی لەسەر ئەم بوون مانەوەیە دەکەم.

سەرچاوەی ئەو هێمایانە لە کوێیە و لە کوێوە دێن؟ بەدڵنیاییەوە سەرچاوەیەکەیان لە مێژوودایە (هۆبزباوم ١٩٩٢: ١٦)؛ ئەوەش بەشێوەیەک کە کۆمەڵێک کەس بڕیاریانداوە لە سەرزەمینێکدا پێکەوە بژین، مامەڵە لەگەڵ یەک بکەن (کلتوور) و قسە لەگەڵ یەک بکەن و لێک تێبگەن (زمان) شێوازێک پۆشاک بپۆشین کە گونجاو بێ بۆ ئەو ناوەندە جوگرافییەی کە تێیدا دەژین (پۆشاک) (بڕوانە، مانین ناش ١٩٩٦؛ بندکت ئەندرسن١٩٨٣ ؛ ئەنتۆنی دی سمس١٩٩١). بڕیاریانداوە پێکەوە بەرگری لەو خاکە بکەن کە تێیدا دەژین، کۆچ نەکەن و جێی نەهێڵن، بەتێپەڕینی کات هەستی هۆگرییان بۆ یەکدی وەک تاکەکەس، و هەستی هۆگرییان بۆ خاک وەک کۆمەڵ زیادی کردووە و بوون بەیەک نەتەوە. هەموو پێکەوە بوونە بەرجەستەبووی ژیانێکی هاوبەش؛ (ئێرنێس ڕێنان ١٩٩٦، نەتەوە بە گیانی هاوبەش پێناسە دەکات) ئەمەیە شوناس – خەڵکی کورد، لە خاکی کوردستاندا. واتە شوناس دوو ڕەهەندە هۆگری بۆ خاک و هۆگری بۆ خەڵک، هەر ئەمەشە دەبێتە پێشمەرجەی بوون بە دەوڵەت و نەتەوە، کاتێک کە سنوورەکانی نەتەوە لەگەڵ سنورەکانی دەوڵەت دەبن بەیەک، تا کوێ نەتەوە درێژ بۆوە تا ئەو شوێنەش سنووری دەوڵەت درێژ دەبێتەوە (بڕوانە؛ ئێرنێست گێڵنەر ١٩٨٣).

له هەرشوێنێک کۆمەڵێک کەس هەبن، چوارچێوەیەکی کۆمەڵایەتیان دەبێ، له هەر جێگایەکیش چوارچێوەی کۆمەڵایەتی هەبێ کۆمەڵێک ئامراز هەن بۆ پاراستنی -- ئەو ئامرازانه هێمای جیاکەرەوەی کەلتوورن؛ کەواته، جیاوازی نێوان چەند کۆمەڵێک ئەو هێمایانەن که هەریەک لەو کۆمەڵانەی پێ دەناسرێتەوە، بۆیه ئەو هێمایانه دەبێ به ڕوونی بەرجەسته بکرێن و ببینرێن، چونکه ئەو هێما جیاکەرەوانه پێمان دەڵێن کێ ئەندامه لەو کۆمەڵەیه و چ پێشمەرجەیەکی کلتووریی پێویسته بۆ بوون بەئەندام (بڕوانه؛ مانین ناش ١٩٩٦: ٢٦). مەبەست لەو هێمایانەش دروستکردنی کۆمەڵێک و پاراستنیەتی، ئەو هێمایانەی که شوناس دیار دەکەن، هێمای پاراستنی سنووری شوناسن. ئەگەر ئەو سنوورانه بەشێوازێکی بەردەوام، لەلایەن ئەندامانی کۆمەڵه نەتەوەییەکەوه ببەزێنرێن شوناس دەکەوێته ژێر هەڕەشەی لەناوچوون – بۆ وێنه، پۆشاک، تۆ هەمیشه بیکەی به نەریتی ژیانت لەجیاتی پۆشاکی نەتەوەییت پۆشاکێکی دی بپۆشی، واته پۆشاکی شوناسێکی دی پێناسەت بکا؛ یا ئەگەر به بەردەوامی به زمانێک بدوێی زمانی دایک نەبێ، زمانی ئەندامانی کۆمەڵه نەتەوەییەکەت نەبێ، ئەوا دەبێ بەزمانێک بدوێی که زمانی شوناسی نەتەوەیەکی دیکەیە. ئەگەر بۆ هەموو هێما جیاکەرەوەکانی شوناس دووباره بێتەوه، ئەو کۆمەڵه نەتەوەییه له بوون دەکەوێ، له کلتووری نەتەوەیەکی دیدا دەتوێتەوه و دەبێت بەبەشێک له شوناسێکی دی. واته، نەتەوه بەلەدەستدانی شوناسی، بوونی خۆی لەدەست دەدا، ئەمەش پێی دەگوترێ خۆکوژی شوناس.

ئەمه چی لێ دەفامرێتەوه، هەڕەشەی نەمان بۆ سەر کۆمەڵێکی نەتەوەیی بریتییه له بەزیندوویی ڕانەگرتنی شوناسەکەی. بەڵام خاڵی گرنگ لێرەدا ئەوەیه بەو ئەندازەیەی که تاکەکەس هەڵگری شوناسه و سەرەتا لەودا خۆی بەرجەسته دەکات (گوتمان که تاکەکەس هەڵگری شوناسه)، ئەوا زیندووڕاگرتنی هێماکانی شوناس لەلایەن تاکەوه دەبێته هۆی زیندووڕاگرتن و مانەوەی ئەو نەتەوەیە، پێچەوانەکەشی ڕاسته، واته ئەگەر تاکەکانی ئەو نەتەوەیه هێماکانی شوناسی نەتەوەییان له خۆیاندا بەرجەسته نەکەن و له ژیانی ڕۆژانەیاندا ئەزموونی نەکەن ئەو تاکانه شوناسی خۆیان کۆتایی پێدێنن، وەک پێشتریش ئاماژەمان بۆ کرد؛ به کۆتایی هاتنی شوناسه کلتوورییەکەی ئەو کۆمەڵه نەتەوەییەش کۆتایی پێ دێ. ئەوەی جێی ڕامانه ئەوەیه، بەرپرسیارێتی پاراستنی شوناس دەکەوێته سەر تاک تاکی ئەندامانی کۆمەڵێکی نەتەوەیی؛ بەتایبەت چینی لاو و گەنج.

کەواته ئەگەر هێما جیاکەرەوەکانی شوناس، کلتوور و باوەڕ و کردەپەرستش، لەگەڵ زمان و پۆشاک و شێوه و ڕەنگ بپارێزرێن، ئەوا شوناسی ئەو گرووپه دەپارێزرێت، بەو

واتایە، شوناس بریتییە لە خودی کۆمەڵە نەتەوەییەکە. ئەمە باسێکی گرنگی وجوودییە، ئێستا ئێمەی کورد لە بەرانبەر هەڕەشەیەکی بەردەوامداین و، لە جەنگێکی کلتووریی بەردەوامداین، لە مەیدانی جەنگیشدا مرۆڤ ناتوانێ بێلایەن بێ؛ بۆ وێنە کاتێک کە پۆشاکی نەتەوەیەکی دی دەپۆشی، بڕیاری خۆتت داوە، خۆویستانە بەشێک لە شوناسی نەتەوەییت لە خۆتدا کوشتووە، (بەشێک لە شوناسی کۆمەڵێکی نەتەوەیی دیکەت لەخۆتدا زیندوو ڕاگرتووە). ئەگەر بڕیاربێ بە زمانێک جگە لە زمانی کوردی بدوێ بەهەمان شێوە، ئەگەر لە شێوازی مامەڵەتدا بڕیارت دابێ کە لەگەڵ کلتووری خۆتدا ئاشت نەبیەوە و شانازی پێوەنەکەی، ئەوا کلتوورێکی دی بۆت دەبێ بە شانازی، یا شانازی بە کلتووری نەتەوەیەکی دیکەوە دەکەی ... ئەگەر ئەمە دووبارە بێتەوە بۆ هەموو هێما جیاکەرەوەکانی شوناسی نەتەوەییت، دەرەنجامەکەی ئەوەیە کە تۆ بووی بە ئەندامی کۆمەڵێکی نەتەوەیی دی و شوناسی نەتەوەیی خۆتت لەدەست داوە و شوناسی نەتەوەکەت لە مەیدانی تۆدا دۆڕاندویەتی.

> **ئەگەر هێما جیاکەرەووەکانی شوناس، کلتوور و باوەڕ و کردەپەرستش، لەگەڵ زمان و پۆشاك و شێوە و ڕەنگ بپارێزرێن، ئەوا شوناسی ئەو گرووپە دەپارێزرێت.**

ئێمەی کورد وەک نەتەوەیەک، لە جەنگێکی بەردەوامداین بۆ مانەوە، تۆی گەنج هەستی پێبکەی یا نەکەی، لە جەنگێکی بەردەوامدای بۆ مانەوە، لە مێژووی دوورەوە تا ئێستا، کوردبوون و شوناسی کورد (پەیوەست بەو شەش هێمایانەی شوناس) وەک سپاردە گەیشتۆتە دەستی تۆ، چونکە بابوباپیرانت و دایکوداپیرانت بڕیاریاندابوو کە لە نەتەوەکانی دیدا نەتوێنەوە، وەک کورد لە نیشتمانی خۆیاندا کە کوردستانە ژیان ئەزموون بکەن (هەربۆیەش ئێستا خەڵکێک هەن پێیان دەگوترێ کورد و خاکێک هەیە پێی دەگوترێ کوردستان). بەڵام لێرە بەبەرەوە، بەرپرسیارێتی یەک بەیەکی ئەندامانی نەتەوەی کوردە بەتایبەت گەنج و لاو لەگەڵ یەک پرسیاری گرنگدا دەستەویەخەن؛ ئایا دەیانەوێ ئەو سپاردەیە بگەیەننە داهاتوو یا بڕیاریانداوە لەواندا بمرێ؟

هەستی بەرپرسیارێتی دروست ئەوەیە کە بەرپرسانە مامەڵە لەگەڵ ئەو سپاردەیە بکەن و لە ئێستادا شوناس بەزیندوویی ڕابگرن، تەنها ڕێگەی زیندووڕاگرتنیشی ئەزمونکردنیەتی و، بەزیندوویی ئەو سپاردەیە ڕادەستی ئەو لاوانەی دی بکەن کە لەدوای ئەوانەوە دێن و پێکەوە نەتەوە و کلتوورەکەی ڕوو بەرەو داهاتوو ئاڕاستە بکەن. گەنجانی سەردەم دەتوانن ببنە هۆی مردنی نەتەوەکەی خۆیان و دەشتوانن ببنە هۆی بەزیندوویی هێشتنەوەی؛ چاوەڕوانی نەتەوە لە گەنجان ئەوەیە کە ببنە ژیانی نەتەوە و گیانی کلتووریی بە بەردا بکەنەوە.

## سەرچاوەکان


Anderson, Benedict.1983. Imagined Communities: Reflections on the Origin and Spread of Nationalism. London: Verso.

Ernes Renan, 1996. “The Nation” in John Hutchinson and Anthony D. Smith Ethnicity, Oxford reader, Oxford: oxford university press.

Gellner, Ernest.1983. Nations and Nationalism. Ithaca: Cornell University Press.

Hobsbawm, E.J. 1992 Nations and Nationalism Since 1780: Programme, Myth, Reality. Cambridge: Cambridge University Press.

Manning Nash, 1996. “The Core Elements of Ethnicity” in John Hutchinson and Anthony D. Smith Ethnicity, Oxford reader, Oxford: oxford university press.

Smith, Anthony D. 1991. National Identity. Reno: University of Nevada Press.



د. سەلمان نادر

## بیرکردنەوەی ڕەخنەگرانە

# قەڵای پاراستنی گەنجان

## لە پۆپۆلیزم و توندڕەوی



## لەبری پێشەکی:

ڕۆژێک کوڕەکەم هاتەوە بۆماڵەوە، وتی بابە چ گیانداریک بکوژین خێرمان دەگات؟ لەڕاستیدا پرسیارەکە بەلامەوە سەیربوو، چونکە چەند ڕۆژێک لەوەو پێشتر، لە خانەباخێکدا دووپشکێکم پیشان دان تا بیناسن، دواجار ویستم بیکوژین، ئەو زۆر بەتوندی دژی بوو، پێی وابوو کوشتنی هیچ گیانەوەرێک ڕەوا نیە، چۆن بەخێرایی ئەمەی لادروست بوو؟

منیش وتم نازانم، وتی قومقومە، لەڕاستیدا هەمان دۆخی منداڵی خۆم کە هەمان شتم پێوترابوو، لێرەوە ویستم بیخەمە ناو دۆخی ڕەخنەگرانەی ناوەکییەوە، پرسیم بۆچی خێرمان دەگات بیکوژین؟ وتی ئاخر کاتێک ویستویانە حەزرەتی ئیبراهیم بسوتێنن، هەموو ئاژەڵەکان، ویستویانە ئاگرەکە بکوژێننەوە، تەنها ئەو نەبێ فووی لە پشکۆکان کردووە و هەڵیگیرساندوون.

نەمویست ئەوەی خۆم باوەڕم پێیەتی بەسەر ئەویدا بسەپێنم، بەڵام ویستیشم پێوەری عەقڵی هەبێت بۆ هەڵسەنگاندنی هەر شتێک دەیبیستێت. بۆیە پرسیم: ئەگەر باپیرە گەورەی ئێمە تاوانێکی ئەنجامدابێت، ئایا دروستە کەسێک بێت ئێمە سزا بدات؟ یەکسەر وتی نەخێر، وتم ئەی بۆ ئێمە ئامادەین نەوەکانی ئاژەڵێک قڕکەین لەسەر تاوانی باپیریان؟ هەستم کرد کەوتە دۆخێکی سەختەوە، ئەڵبەتە من چەند پرسیارێکی دیکەی عەقڵیم لێکرد، کە لێرەدا کات ڕێگەنادات بیان وروژێنین، چونکە تەنها نمونەیەکمان مەبەست بوو.

ئەمە پرسیارێکی بنەڕەتییە، ئایا ئێمە بۆئەوەی بتوانین خۆمان بین و ڕێز لە عەقڵی خۆمان بگرین و نەبینە بوکەڵەی دەستی کەلتوور، مێژوو، زۆرینە، هەستەکانمان، ئامادەین، بیروباوەڕەکانمان بخەینە ژێر پرسیارەوە؟ تاوەکو بزانین چەندیان مەعقولن و چەندیشیان نا مەعقول؟ ئایا ئێمە دامەزراوەکانمان: ماڵ، قوتابخانە، زانکۆ، مزگەوت، ڕێکخراوی مەدەنی، حیزبی سیاسی، ئامادەن نەوەیەک پەروەردە بکەن حەکایەتەکان بخەنە ژێر پرسیارەوە؟ یان نەخێر هەر خۆمان پێش ئەوانی تر، دەترسین بیر بکەینەوە، نەوەک دەربکەوێت هەڵەبووین، ئەوانی دیکەش دەترسن بیر بکەینەوە بۆمان دەرکەوێت ئەوان هەڵەبوون.

ئەڵبەتە بیرکردنەوەی ڕەخنەگرانە، حاڵەتێکی سایکۆلۆجیی و دژەباوی نیە، بەڵکو پرسیاری وردن لە ناخی مرۆڤدا، لەبارەی باوەڕەکانەوە، بەتایبەتی لەمڕۆدا، کە بەردەوام مرۆڤ لەلایەن زانیارییەوە دادەپۆشرێ، هەربۆیە لەمڕۆدا زانیاری گرنگ نیە، چی زۆرە زانیاری، بەکلیکێک زانیاری لەڕادەبەدەر دێنە مۆبایلەکانماوە، هەربۆیە زانیاری

ئەمڕۆ خاڵە بنەڕەتییەکە نیە، بەڵکو پرسیارکردن لە زانیاری گرنگترە، ڕووگە بەخشین بەزانیاری گرنگە، چونکە شەپۆلی زانیارییەکان بێ ئیرادەی خۆمان دێن بەرەو ڕوومان، هیچ قۆناغێک هێندەی ئەمڕۆ مرۆڤ لەلان زانیارییەوە تەنگی پێهەڵنەچنراوە، وەگەر نا مرۆڤی ئەمڕۆ بیەوێت یان نا، هەر دەزانێ، وەلێ ئەگەر خۆی ئیختیاری نەبێ، ئەوانی دیکە بڕیار دەدەن چی دەرخواردی بدەن، ڕێک هاوشێوەی خواردن، کاتێک خواردن کەمە مرۆڤ ناتوانێ بڕیار بدات چی دەخوات، وەلێ کاتێک زۆرە دەبێت بزانێ چی دەخوات، وەگەر نا تووشی نەخۆشی دەبێت، ئەمەش تەنها بە پرسیارکردن لەبارەی زانیارییەوە بۆی فەراهەم دەبێت، لێرەوە بیرکردنەوەی ڕەخنەگرانە، لێرەدا مرۆڤ ڕزگار دەکات لە گیرۆدەبوون بەدەس شەپۆلی زانیارییە پەرت و بڵاو و ڕێکنەخراو و نمونەییەکانەوە، ڕزگاری دەکات لە عەوامفریویی و توندڕەوی.

بیرکردنەوەی ڕەخنەگرانە دژە کۆمەڵایەتی بوون نیە، دەرچوونیش نیە لە پرانسیپی لۆجیکی بۆ پرسیارکردن، بەڵکو پرسیارکردن و گومان دروستکردنی لۆجیکییە لە بیروباوەڕەکان، زانیارییەکان، پێکەوەگرێدانی زانیارییەکان لە چوارچێوەی سیستمەکاندا، ڕێگری کردنە لەوەی هەستەکانی مرۆڤ لەبری ئەوەی پاشکۆی باوەڕەکان بن، ببنە سەروەری باوەڕەکانی.

پرسیاری بنەڕەتی لێرەدایە، ئایا مرۆڤ دەیەوێت زانیارییەکان بەکاربهێنێ، یان زانیارییەکان دەبێت مرۆڤ بەکاربهێنن، ئەوەی ئێمە دەمانەوێت بیڵێین ئەوەیە مرۆڤ پێوەری دامەزراوی هزری هەبن، تا لە بەردەم ڕەشەبای زانیارییەکاندا سەرگەردان نەبێت، تاوەکو زانیارییە ژمارەییەکان بەرەو هەڵدێری نەبەن. وەک ئاماژەمان پێدا، لە سەردەمی نوێدا هەبوونی زانیاری گرنگ نییە، هێندەی شیکار و ئەزموون و ڕێکخستنی زانیارییەکان لەچوارچێوەی سیستمی مەعریفیدا گرنگن، هێندەی پرسیار کردن لە چیەتی و چۆنیەتی زانیارییەکان گرنگن. ئەمەش خاڵی بنەڕەتی ئەوەیە ئێمە دەمانەوێت بیڵێین، لەکاتێکدا کە ئەمە برەوی پێنادرێت، بگرە لە بەردەم هەڕەشەی زۆری زانیارییەکاندا گوزەری زانیاری پێدان برەو دەسێنێت، لەگەڵ ئەوەشدا زانستە بنەڕەتییەکانی وەک لۆجیک، فەلسەفەی زانستەکان فەرامۆش دەکرێن، هەرئەمەش وایکردووە مرۆڤی بیرکەرەوە کەمتر بن و مرۆڤی بەکاربەری زانیاری زۆرتر بن. ئەمڕۆ زانیاری ئێمە لەڕووە ئاینیشەوە زۆر زیاترە لەڕابردوو، وەلێ میتۆدمان لاوازە.

لە سەردەمی نوێدا سێ مەترسی گەورە هەن بەتایبەتی لەسەر گەنجان لە وڵاتانی ئێمەدا، چونکە ئەوان زۆرتر بەر دونیای نوێ دەکەون، ئەوانیش:

١. زۆربوونی زانیاری تەکنیشیانی و کەمبوونەوەی مەعریفەی بنەڕەتی.

٢. زۆربوونی توانای دەرەکی و کەمبونەوەی کۆنترۆڵی ناوەکی.

٣. گەشەکردنی دژەهاتنەوە لە نێوان بیروباوەڕ و ڕەفتاردا.

ئەمە لە گەنجەکاندا زۆرتر دەردەکەوێت، من وەک خۆم بەدواداچوونی ئەم سیانەم کردووە لە تۆڕەکانی سۆشیاڵمیدیادا، کە چەند نمونەیەک لەمە دەخەمە ڕوو.

نمونەی یەکەم، ئەلف پزیشکێکە، بڕوانامەی پزیشکی لە کۆلێجێکدا وەرگرتووە کە میتۆدەکەی زانستی نوێیە کە زانستێکی ئیستقرائی تاقیگەییە، لەو میتۆدەشدا هەرشتێک بە قۆناغەکانی زانستیدا تێپەڕ نەبێت، زانست نیە، بەڵام بانگەواز بۆ بابەتی پزیشکی کلاسیک دەکات بەناوی زانستەوە، بۆ؟ چونکە بنەمای زانستی پزیشکی ناناسێت).

نمونەی دووەم، خۆی کارمەندی کەناڵێکی ڕاگەیاندنی عەلمانییە و بەباشترین شێوە دەرهێنان بۆ بەرنامەکانیان دەکات، لە کۆمێنتدا دەنووسێت ئەوەی وەلائی عەلمانیەت بۆ بێت کافر دەبێت.

بیرکردنەوەی ڕەخنەگرانە لە بنەڕەتەوە بۆ کارکردنی ناوەکی مرۆڤە لەسەر ئەو سێ مەترسییە، کە تێکڕایان دەرئەنجامی مەترسیداری پۆپۆلیستی بەرهەم دەهێنن.

بۆ نمونە پزیشکەکانی ئێمە تەکنیشیانن، جەڕاحی باشن، ئاگاداری تەکنیکە پزیشکییەکانن، بەڵام کەمترین پرسیاری بنەڕەتی پزیشکی لە خۆیان دەکەن، کەمترینیان کتێبێکی سەرەتاییان لەسەر چیەتی زانستی پزیشکی، فەلسەفەی پزیشکی خوێندووەتەوە، بۆیە زۆرجار لە هەناوی پزیشکیدا ڕاستڕەوییەکی توند خۆی دەنوێنێ، ئەوە کۆلێژە پزیشکییەکانی ئێمە دوور و نزیک بەلای ئەو پرسانەدا ناڕۆن. هێشتا لێرە فەلسەفەی زانست باس نیە، لەکاتێکدا لە ڕابردوودا ڕیشەی قوڵی فەلسەفی لەگەڵ زانستەکاندا خوێنراون، ئەمەش وادەکات، پزیشکێک لێی بپرسیت چ شتێک زانستییە و چ شتێک زانستی نیە؟ وەڵامێکی پێ نیە؟ بۆیە دەکەوێتە هەڵەی ڕوونەوە، ئەمە تەنها لە پزیشکیدا نیە زۆر بواری دیکەش ئالودەی بوون، بۆ نمونە لە ڕابردووی ئێمەدا لە حوجرەکاندا ئادابی بەحس و مونازەرەی گەلەنبەوی و بورهانی گەلەنبەوی و موغنی تولاب لە لۆجیکدا خوێنراون، لە کەلامدا عەقیدەی نەسەفی خوێنراوە، کە بورهانی عەقڵی تێدا بووە، مەقولات خوێنراوە لە فەلسەفەدا، بەڵام ئەمڕۆ ئەوانە جگەلەوەی کەمڕەنگ بوون و ناخوێنرێن، پرسی فیقهی لەڕادەبەدەر گەورەکراون، بابەتی تێپەڕاندنی ئصولیات بەهێز بووە، لەبری تەفسیر خەواتیر نووسین گەشەی کردووە، ئەمانە تێکڕایان تەکنیک بەهێزکردنن لە بەرامبەر لاوازبوونی مەعریفەی بنەڕەتی، زانینی ئیستدلال گرنگ نەماوە،

بەڵام بەحوجەت کردنی دەق بێ ئەوەی ئاگاداری حوجەسازی بین زۆر بووە، ئەمە زۆرتر لە گەنجەکاندا زەقترە.

بەشی دووەمی مەترسیەکە، بەهێزبوونی تواناکانی مرۆڤن بێ بایەخدان بە تەزکیە، لە ڕابردووی مرۆڤایەتیدا پرسی تەزکیە پرسێکی سەنتەری بووە، مرۆڤ چۆن کۆنترۆڵی ناوەکی خۆی بۆ ڕێگری کردن لە ئازاربەخش بوونی بەکارهاتووە، لە ئێستادا دونیای مەعریفە بەتەواوەتی جیابووەتەوە لە دونیای تەزکیە، بەشێکی گەورەی زادەی دونیا سیکۆلارەکەیە کە ئەیەوێت مەعریفە لەدەستی ئەخلاق ڕابماڵێت، بەڵام ئەمە بوارە دینییەکەشی گرتووەتەوە. بۆیە بیرکردنەوەی ڕەخنەگرانە لانیکەم دەیەوێت دوو مەترسی لەمانە کەم بکاتەوە، ئەگەرچی دەست بۆ سێیەمیش دەبات، ئەوانیش قوڵ بیرکردنەوە و ڕزگاربوونن لە نیفاقی مەعریفی.

**بیرکردنەوەی ڕەخنەگرانە لەکوێوە دەستپێدەکات؟ چۆن خزمەتمان دەکات؟**

کۆمەڵێک پرسیار لێرەدا جێی لەسەر وەستانن، بۆچی بیردەکەینەوە؟ ئایا دەکرێت لەڕێگەی بیرکرنەوەوە ژیانمان بگۆڕدرێت؟ ئایا دەکرێت لەڕێگەی بیرکردنەوەوە ئەو شتانە بگۆڕین کە نازانین پێویستە بگۆڕدرێن؟

لەگەڵ ئەوەدا دەبێت بزانین زۆرینەی کۆمەڵگە بیرکردنەوەیان هەیە، بە کۆمەڵگە سەرەتاییەکانیشەوە، بەڵام بیرکردنەوەی سیستماتیک خەسڵەتی کۆمەڵگە فەرهەنگییەکانە، خەسڵەتی مرۆڤە پەروەردەکراوەکانە، واتە تا ئاستێکی پێشکەوتووی کەلتووری ڕوونەدات مرۆڤ بیرکردنەوەی سیستماتیکی تێدا دروست نابێت، ژیانی پڕدەبێت لە دژهاتنەوە، کە ئەمەش لەو مەترسییانەدا ئاماژەمان پێدا بوونی هەیە، بیروباوەڕی پەرگیرانەیە، بەڵام ژیانی ئاسانگیرانە، ئەمەش خەسڵەتێکی سەردەمە، بۆ نموونە خۆی دەزانێت ژیان بێ وێنە ناڕوات بەڕێوە، بەڵام دەشڵێت وێنە حەرامە، لە بەردەم کامێرایەکدا وتار دەدات لەسەر حەرامبوونی وێنە، وێنەی پرۆفایلەکەی لە ئەنتالیا گرتوویەتی دەشڵێت بەڵێ بۆ بایکۆتکردنی کاڵای تورکی، کەڵکەڵەی ژیانی ئەورووپایەتی و دژایەتی ئازادی دەکات، خێزانی خۆی سافیرەیە و لە سۆشیاڵمیدیا ئیدعای سەپاندنی حیجاب دەکات ... تاد.

مرۆڤ بۆئەوەی لەو گرفتانەی ئاماژەمان پێدا قوتاری ببێت، پێویستە ڕەهەندە گشتییەکانی بیرکردنەوەی ڕەخنەگرانە پەیڕەو بکات، کە لێرەدا بەشێک لەو ڕەهەندانە دەخەینە ڕوو:

**ڕەهەندی یەکەم:** یەکەم ڕەهەندێک مرۆڤ دەستی بۆ ببات لە بیرکردنەوەی ڕەخنەگرانەدا، بەئامانجگرتنی بیروباوەڕەکانی خۆیەتی، دەوترێت ئەگەر کەچەڵ حەکیم

بێت، دەوای سەری خۆی ئەکات، مرۆڤی ڕەخنەگر، یەکەم کەسێک ورد و درشتی ژیانی بزانێت خۆیەتی، بۆیە پێش ئەوەی بپەرژێتە سەر دوورەکان، پێش هەڵسەنگانی ئەوانەی نایانناسێ، هەڵسەنگاندنی ئەوانە دەکات زۆرترینیان لەبارەوە دەزانێت، هەربۆیە دەوای دەردی خۆی دەکات، لە خۆشیدا لە ڕیشەییترین خاڵی خۆیەوە دەسپێدەکات، کە بیروباوەڕەکانیەتی، لە تێست کردنی باوەڕەکانی خۆیەوە دەیەوێ بزانێت ئایا باوەڕەکانی بەڵگەدارن، یان نەخێر تەسلیمی ئەوانی دیکە بووە، کوێرانە ڕادەستی کەلتوور و چاولێکەری بووە، دەیەوێ نەزانینەکانی خۆی کەشف بکات. زۆرینەی مرۆڤەکان لێرەدا تێدەکەوین، وادەزانن ئەوەی ئێمە باوەڕمان پێیەتی خودی حەقیقەتەکەیە، وادەزانین بەڵگەمان بۆ هەموو باوەڕەکانمان هەیە، وادەزانین بەدوورین لە خورافە، نا ئاگاین لەوەی ئێمە لەڕێگەی مەنزوومەیەکی فیکرییەوە حەقیقەت دەبینن و حەقیقەتیش جیاوازە لەوەی دەرکی دەکەن، وادەزانی هەموو باوەڕەکانمان لە دەرەوە بوونیان هەیە، هەربۆیە بیرکردنەوەی ڕەخنەگرانە لەخۆی دەپرسێت ئایا بەڵگەمان بۆ هەموو باوەڕەکانمان هەیە؟ یان نەخێر باوەڕەکانمان تەڵقینێکن و بەرئەنجامی مامەڵەی دیکە بۆمان دروستبوون، بۆیە کاتێک مرۆڤ فێری بیرکردنەوەی ڕەخنەگرانە دەبێت، لانیکەم ئەو باوەڕانەی کە کاریگەرییان لە چۆنیەتی بیرکردنەوەی، چۆنیەتی ژیانکردنی، چۆنیەتی هەڵسوکەوتی هەیە لێیان دەپرسێتەوە، هەوڵ دەدات بزانێ بەڵگەی هەیە بۆیان، یان لانیکەم هێندە مەعقولیەتیان تێدایە، شایستەی داکۆکی لێکردن بن.

**ڕەهەندی دووەم:** دووەم هەنگاو مرۆڤ لەوە دەپارێزێت بکەوێتە داوی سێ مەترسییە بەرجەستەکەی سەردەمی نوێوە، کە دەرهاویشتەی خولقاندنی دۆخی عەوامفریویان هەیە، کەمکردنەوەی پانتایی جیاوازییە لە نێوان باوەڕ و کرداردا لەڕێگەی بیرکردنەوەی ڕەخنەگرانەوە، چونکە دواجار زۆربەی گوتارە پۆپۆلیستییەکان تاک بەئاڕاستەیەکدا دەبەن داوای شتێکی نمونەیی لە بەرامبەر یان کۆمەڵگە دەکەن، ئەمەش چەند پرسیارێکی سادەن مرۆڤ لەخۆی دەکات:.

١ـ ئایا ئەو پێوەرانەی بۆ ئەوانی دیکەی دادەنێم بۆ خۆمی دابنێم دەردەچم؟ ئەو مەرجانەی بۆ بیروباوەڕی ئەوانی تری دادەنێم، بیروباوەڕەکەی خۆمی پێ بپێوم دەرەچێت؟ پێشتر مامۆستایەک لە زانکۆی سلێمانی هەبوو، لەکاتی تەسیحکردنی دەفتەری خوێندکاردا لێی تێکچووبوو وەڵامە نموونەییەکەی خۆی تەسیح کردبوو، حەفتا لەسەدی هێنابوو، جا نازانم ئەم نموونەیە ڕاست بوو یان بۆیان هەڵبەستبوو؟ بەڵام وەک نموونە لەوانەیە زۆر گونجاو بێت بۆ ئەم پێوەرە، چونکە زۆربەی قەیرانەکان لەوێدان ئێمە ئەو

مەرجانەی بۆ بەرامبەری دادەنێین بەسەرخۆماندا بسەسپێنین دەرناچین، ئەمە تەنها لە ئاستی پراکتیکیدا نیە، بەڵکو ئەگەر بیشیگوازینەوە بۆ ئاستی تیۆری هەمان ئیشکالیەت دەخولقێت، بۆ نموونە ئێمە کاتێک باس لە پڕۆژەی فیکری بەرامبەرەکانمان دەکەین، مەرجگەلێک دادەنێین ئەگەر ئەو مەرجانە بەسەر پڕۆژەکەی خۆشماندا بەرجەستە بکرێن نەک سەختە لەژێر بارياندا بێتە دەرەوە، بەڵکو هیچی بەسەر هیچی ترەوە نامێنێتەوە، ئێمە کاتێک لەگەڵ ئایینەکانی دیکەدا گفتوگۆ دەکەین، عەقڵانیەکی توندڕەو و پەڕگیرین، هەندێک جار پۆزەتیڤیستێکی لۆجیکین، بەبیانووین لە بچووکترین پۆینتێک لەو ئایینانەدا ببێ و لەگەڵ عەقڵدا یەکانگیر نەبێت، بەڵام لە باسی ئایینی خۆماندا دەڵێین کاکە خۆ ئایین بە عەقڵ ناپێوڕێ، خەواریقولعادەکانی ئایینی خۆمان پەڕجوون و هی ئایینەکانی دیکەش خورافە، کاتێک مرۆڤ بەم چەشنە لەخۆی ڕاما سەختە بتوانێت، پۆپۆلیست بێت.

> **ئێمە پێش ئەوەی لەدایك ببین لەڕووی بایۆلۆجیەوە، کراسێکی کەلتووریمان بۆ دووراوە، دەبێت هێندەی کراسەکە گەورە ببین، نەك کراسەکە بە باڵای ئێمەدا ببڕن.**

٢. کاتێک لە سیاسەتی بانێکە و دوو هەواوە دێینە سەر باسی کردەکی بوونی مەرجەکانمان بۆ بەرامبەر لەگەڵ بنەمایەکدا دەست و پەنجە نەرمەکەین، ئەویش ئەوەیە: هیچ دۆخێک شایستەی داواکردن نیە، کاتێک بۆ خۆمان مومکین نیە. ئەویش لەو پرسیارەوە سەرچاوە دەگرێت، ئایا سەرکەوتوو بووم لە ژیانکردن بەرمەبنای ئەو پرانسیپانەی باوەڕم پێیەتی، بۆ نموونە من باوەڕم بە کۆمەڵگەیەکی نمونەییە، باوەڕم بەو حەکایەتانە هەیە باسی ئەوە دەکەن مرۆڤەکان لە هەرچی گوناهە پاک ببنەوە و گوناهـ نەکەن، بچووکترین گوناهـ لە بەرامبەرم دەکەمە دێوەزمە، پێموایە کۆمەڵگەیەک هەبووە خاڵی لە هەرچی خەوشی ئەخلاقییە، داوا دەکەم ئەوانەی دەوروبەریشم وابن، داوا دەکەم سیاسییەکان ئەنانی نەبن، ململانێ نەکەن، هەزاران مەرج، بەڵام خۆم ئەوەم پێناکرێ، ناتوانم بەرمەبنای ئەو باوەڕەم بژیم بەڵام دەمەوێ ئەوان وابژین، ئاخر ئێمە

خۆمان ئەوەی پێماننا‌کرێ دەمانەوێ ئەوانی دیکە ئەنجامی بدەن، هەربۆیە دەمانەوێ واقیعی ژیانی ئەوان بە خەیاڵی خۆمان بپێوین، ئەمە تەنها دیوی مەعنەویی و ئەخلاقی نییە، قوڵایی مەعریفیشی هەیە، قوڵاییەکەی لەوێدایە، ئەوەی مومکین نیە بکرێ لەڕووی مەعریفیشەوە شایستەی باوەڕ پێ بوون نییە، باباتاهیری هەمەدانی چوارینەیەکی جوانی هەیە، لێرەدا زۆر کەڵکگیرە و دەڵێت:

| |
|---|
| **مو آن رندم که عصیان پیشه دیرم** |
| **بدستی جام و دستی شیشه دیرم** |
| **اگر تو بیگناهی رو ملک شو** |
| **من از حوا و آدم ریشه دیرم** |

ئەو عاشقەم لە گوناهدا ڕیشەدارم، لەلایەک عاشقی عەشقی باڵاو لەلایەکیش مەینۆشم، تۆ ئەگەر بێگوناهی ببەرە فریشتە، من لە ئادەم و حەواوە ئەم کیسمە فێربووم.

ئەمە بانگەوازی گوناهکردن نیە، بەڵکو بانگەوازی بەواقیعی سەیرکردنی مرۆڤە، چاوەڕوانی فریشتە بوون لە مرۆڤ هەڵەیە، گواستنەوەیە لە مرۆڤی کامڵی ئیبنوعەرەبییەوە بۆ کاملەن مرۆڤ بوون.

٣. پرسیاری سێیەم ئەوەیە ئایا ئێمە پێوەری عەقڵانیمان هەیە بۆ هەڵسەنگاندنی ئەوانەی خۆشمان دەوێن؟ دژهاتنەوەکانیان لەگەڵ خۆیان دەبینین، دژیەکەکانی گوتارەکانیان هەست پێدەکەین؟ یان نەخێر ئێمە بۆ بینینی خۆشەویستانمان پێوەرە عەقڵانی و لۆجیکییەکان وەلا دەنێین، بەڵام بۆ ئەوانی دی نەخێر، ئەم سێ بنەمایەی پێیان دەوترێت ڕێگرییەکانی نیفاقی مەعریفی، بەربەستێکی گەورەن لە بەردەم ڕووکاری بووندا، لە بەردەمی بوونە کۆیلەی زۆرینە و پۆپۆلیزمدا، چونکە لە زۆربەی دۆخەکاندا گوتاری ئینفعالی لەم ڕەهەندانە پێکدێن.

**بنەمای سێیەم: ئاگایی لە بەرامبەر سنوورداریيەکانمانەوە**

لەوانەیە دیارترین پەیامی هێرمنۆتیکای نوێ ئەوە بێت، ئێمە لەناو چوارچێوەیەکی مەعریفیداین، ئەو چوارچێوەیە ناوی ئاسۆی مێژووییە، ئەو ئاسۆ مێژووییە کاریگەری وجودی لەسەر تێگەشتنەکانمان هەیە، واتە ناتوانین لێی قوتار ببین، کاتێک مرۆڤ ئەم ئاگاییەی بۆ دروست دەبێت، بەدور دەبێت لە توندڕەویی و دەمارگیری، دەزانێت بەشێکی گەورەی جیاوازییەکانمان جیاوازی ئەو ئاسۆ مێژووییەیە ئێمەی لەناودا دەژین، جیاوازی

پێشگریمانەکانمانە، جیاوازی چاوەڕوانی و جیهانبینییەکانمانە، ئەمانەش زۆرجار مرۆڤ ئیختیاری تێیدا نیە، ئێمە پێش ئەوەی لەدایک ببین لەڕووی بایۆلۆجیەوە، کراسێکی کەلتووریمان بۆ دووراوە، دەبێت هێندەی کراسەکە گەورە ببین، نەک کراسەکە بە بالآی ئێمەدا ببڕن، دەکرێت هەنێک جیاوازیمان ببێ لەوانی دی کە ئەوەش هەر خودی کەلتوورەکان ڕێی پێدەدەن، وەلێ سنوری بیرکردنەوە و بەهاکانمان کۆنترۆڵ دەکات، پێش ئەوەی لەدایک ببین، بەها جیهانییەکان داگیرمان دەکەن، هەربۆیە ئەم ئاگاییە سەرەتای قبوڵکردنی جیاوازییەکانە، ئەوانەی ئاگاییەکەیان هەیە و ئەوانەش نیانە هەر سنووردارن، وەلێ ئەوانەی ئاگاییەکەیان نیە، وادەزانن ئەوان پەییان بە حەقیقەتە پەتییەکە بردووە، ئەمەس وادەکات توند و تاک ڕەهەند بن.

**ڕەهەندی چوارەم : قبوڵ نەکردنی بابەتی بێ بەڵگە**

ئەڵبەتە ئەوە گومان هەڵنەگرە زۆرینەی ئەوەی دەوترێت بەڵگە ناخرێتە ڕوو، هەربۆیە هەنگاوی یەکەمی بیرکردنەوەی ڕەخنەگرانە بریتییە لەوەی مرۆڤ بزانێت ئەم باوەڕەی دەوترێت پشتی بە چ هزرێک بەستووە، ئایا بەڵگە و ئارگومێنتێک لە پشتییەوە هەیە یان نا؟ ئەمە تەنها بەس نیە بۆئەوەی مرۆڤ بکاتە خاوەنی بیرکردنەوەی ڕەخنەگرانە، بەڵکو ئەگەر بەڵگەشی هەبوون مرۆڤ دەست بکاتە گفتوگۆکردنی بەڵگەکان لەڕێگەی لێکجیاکردنەوەیان بۆ بەڵگە، بەڵگە وێژیی و ئەنجامگیری، لە خاڵی یەکەمدا پرسیار کردن لەسەر خودی بەڵگەیە، ئایا ئەو بەڵگەیە لە بنەڕەتەوە مایەی بە بەڵگەبوونی تێدایە؟ ئەگەر بەڵێ بەڵگەیە ئایا خاوەنی ئەو بۆچوونە وەک پێویست لەو بەڵگەیە تێگەیشتووە؟ پاشان ئایا زەرورەت لە نێوان بەڵگەکە و ئەنجامگیرییەکەدا هەیە؟ ئایا ئەگەری دیکە لە ئارادا نین بۆ ئەنجامگیری جیاوازتر؟ ئایا ئەنجامی جیاواز بوونیان نیە بەرمەبنای بەڵگەی بەهێزتر؟ کاتێک مرۆڤ بەمشێوەیە مامەڵە لەگەڵ باوەڕەکاندا دەکات بەدڵنیاییەوە دەرفەتی توندڕەویی و پۆپۆلیستی لەباردەچێت، خۆ ئەگەر بەڵگەی نەبوو پێویست بەکات کوشتن ناکات بۆ گفتوگۆ لەگەڵ کردنیشی.



ئیکرام کەریم

# ئەرك و مافی گەنج لە ڕوانگەی دینەوە

گەنجێتی لە ڕوانگەی دیندا بریتیە لە قۆناغی»هێز»، کە ئەکەوێتە نێوان دوو قۆناغی لاوازیەوە: (لاوازی منداڵی و لاوازی پیری). بۆیە ئیسلام ئەرکێکی زۆر ئەخاتە سەر شانی گەنجان، چونکە کەرەستەو ئامرازی زۆریشی پێداون بۆ ئەنجامدانی ئەو ئەرکانە، وەک: هێزی جەستە، هێزی بیرکردنەوە، هێزی داهێنان، ماندوونەبوون لە ئیش، لە خوێندنەوە، لە نووسین... دیارە ئەرکیش بە ئەندازەی ئەو ئامڕازو کەرەستانەیە کە پێتئەدرێت. تۆ کە ئەبینی پرۆژەیەک بڕی دەفتەرێک دۆلاری بۆ دائەنرێت تا ئەنجامی بدرێت و پرۆژەیەکیش صەد دەفتەری بۆ دائەنرێت بۆ جێبەجێکردن، ژیریت پێتدەڵێت کە حەتمەن پرۆژەی دووەم پرۆژەیەکی ستراتیژی و گەورەترە بە بەراوورد لەگەڵ پرۆژەی یەکەمدا. خوای گەورەش ئەو تواناو وزەی بەگەنجی داوە زۆر زیاترە لەوەی بە مناڵ یان بەپیرێکی داوە، بۆیە لۆژیک ئەوە دەرک ئەکات کە دیارە ئەرک و کاری گەنجەکە گەورەترو قورسترە لە ئەرک و کاری مناڵەکە یان پیرەکە.

بەکورتی گەنج ئەم ئەرکانەی لەسەرە لە ڕوانگەی ئیسلامدا:
* قوڵکردنەوەی ئینتیمای دینی و ڕێکخستنی ئەو غەریزەیە.
* خۆشارەزاکردن لەدیندا و دروستکردنی ئینتیما بۆ خەڵکی.
* کاراکردنی پرۆسەی زەواج.
* پێشکەوتن لە کایەکانی خوێندندا.
* ئینتیما بۆ میللەت و نیشتمان و بەرگریکردن لێیان.
ئەم پێنج ئەرکە ئەتوانین بە پێنج وشە دەرببرین:

ئینتیمـــاو شـــارەزایـی    خـوێندن و زەواجکردن
پێشخستنی میلـــەت و    نیشتیمان  خزمەتکردن
پێنج ئەرکی سەرەکییە و    بەکەڵکن بۆ پـاش مردن

**ئەرکی یەکەم: قوڵکردنەوەی ئینتیمای دینی.**

گەنج و مرۆڤەکان بە گشتی ئەگەر شیتەڵیان بکەین بریتین لە سێ دەزگای سەرەکی:
١- دەزگای غەریزەکان.
٢- دەزگای عەقڵ.
٣- دەزگای هەستەکان ( یان شوێنەوارەکانی هەستەکان»ڕەوشت»).

* غەریزەکان وەک : غەریزەی جنسی، غەریزەی خواردن و خواردنەوە، غەریزەی بەرگری لە خود، غەریزەی دینداری (تەدەییون)، غەریزەی موڵک پێکەوەنان(تملک)، خۆشەویستی، ڕق...

* عەقڵ یان: هێزی بیرکردنەوە و شرۆڤەکردن و هەڵسەنگاندن و بەراوردکاری و بڕیاردان.

* هەستەکانیش یان شوێنەواری هەستەکان کە بریتین لە ڕەوشت، وەک: ڕاستگۆیی، بێغەلوغەشی، دەستپاکی، ئازایەتی...

لەبەرئەوەی( تەدەییون)- بەپێی بۆچوونی زۆریک لە زانایان- غەریزەیە و ناخی مرۆڤ داوای مومارەسەکردنی ئەکات، بۆیە پێویستە ڕێگەی ڕاستەقینەی بۆ بدۆزینەوە تا لانەدات و نەبێتە بەڵا بەسەر خاوەنەکەیەوە. زانایان ئەڵێن: غەریزەکانی مرۆڤ ئەگەر ڕێگەی دروستیان بۆ دانەنرێت تا مومارەسەبکرێن بەو ڕێگایانە، ئەوە خاوەنی ئەو غەریزانە هەوڵ ئەدەن کە بە ڕێگە نادروستەکان مومارەسەی بکەن. بۆ نمونە غەریزەی (جنس)، ئەگەر گەنج خۆی یان سەرپەرشتیارانی گەنج: (دایک و باوک)، یان(مامۆستاو هاوڕێ)، یان (حکومەت و دەسەڵات) لەخەمی ئەوەدا نەبن کە گەنجان بە ڕێگەی دروست مومارەسەی (جنسی) بکەن، ئەوە گەنج -لەبەرئەوەی ناتوانێ تاسەر لەبەردەم فشاری

(جنسی)دا خۆی ڕابگرێ- پەنا بۆ ڕێگەی نادروست و ناشەرعی ئەبات وەک (ئیستیمنا= خۆڕەحەتکردن )، (موممارەسەکردنی جینس لەگەل ئاژەڵدا)، (زیناکردن)و...هتد.

نمونەیەکیتر، (غەریزەی موڵکداری) ئەگەر سەرپەرشتیارانی گەنج لەخەمی ئەوەدا نەبن بەڕێگەی دروست گەنجان فێری پەیداکردنی ماڵ و سامان بکەن، ئەوە ناچاریان ئەکەن بۆ تێرکردنی ئەو غەریزەیان پەنا بۆ ڕێگە نامەشروعەکان بەرن، وەک (ئیختلاس)، (گەندەڵی)، (دزی و چەتەی)، (فرت و فێڵ)، (قومارو کلاوبازی)...هتد چونکە تاسەر ناتوانێ ئەو غەریزەیە کپبکات و بە گیرفانی خاڵیەوە بسوڕێتەوە و داهاتوشی وەک مۆتەکە بەسەر سنگیەوە هەڕەشەی لێبکات.

نمونەیەکی تر، (غەریزەی دینداری و تێرکردنی ڕۆح)، سەرپەرشتیاران و خاوەنانی گەنج ئەگەر هەر زوو خەمی گەنجان نەخۆن و دەستیان نەگرن بۆ پیادەکردنی بەرنامەیەکی دروست بۆ پێڕەویکردن لە دینی ڕاستەقینە ئەوە گەنجان ناچاری ئەوە دەکەن بۆ تێرکردنی ڕۆحیان پەنا بەرنەبەر دەیان ڕێگەی لارو خوار ، وەک: قاوەگرتنەوە، فاڵچێتی، مەشقی ڕۆحی، بتپەرستی، بەخت گرتنەوەو دەست خوێندنەوەو ڕۆیشتن بەدوای سەرابی بورجەکان و خەونەکاندا! بۆ پڕکردنەوەی ئەو لایەنە خۆیان سەرقاڵئەکەن بە ئامادەکردنی گیانەکان و جادووگەری و خوێندنەوەی داهاتوو... هتد.

بەڵام ئەگەر ڕێگا کرایەوە بۆ گەنجان تا موممارەسەی دروستی غەریزەکانیان بکەن، ئەوە لەلایەک ئاسودە ئەبن و لە لایەکی تریشەوە ئەبنە سەرچاوەی خێرو خۆشی بۆ خۆیان و خانەوادە و کۆمەڵگەکانیان.

تێبینیەکی تریش هەیە ئەویش ئەوەیە وەک چۆن لادان لە موممارەسەکردنی غەریزەدا بە ڕێگا دروستەکان بەڵا دروستئەکات، هەروەها موبالەغە و ڕۆچوونیش لە بەکارهێنانی ئەو غەریزانەدا هەر بەڵا دروستئەکات: جنس پەرستی، یان پارەپەرستی، تەنانەت دین پەرستی...هتد، کاری ناشیاو و ناتەندروستن، پێویستە مرۆڤیان لێڕزگار بکرێت و بخرێنەوە سەر ڕێگە ڕاست و دروستەکە.

سەرنجێکی تریش هەیە ئەویش ئەوەیە کە دین و مەبەستیشمان دینی ئیسلامە باشترین ڕێنوێنی پێیە بۆ ڕاستکردنەوەی (لادانەکان)، ئەو لادانانە لە غەریزە جۆراو جۆرەکاندا بێت، یان لە لادانی ڕەوشتدا بێت، یاخود لە لادانە فیکری و عەقڵیەکاندا بێت[1].

لەبەر ئەمانە یەکەم ئەرکی گەنج ئەوەیە دەرگا بۆ دین بکاتەوەو فەرمووی لێبکات تا بێتە ناو ژیانی و چرای بۆ هەڵبکات و پێڕەوی لە ڕێڕوونیەکانی بکات، متمانەی وابێت کە

---

١. ئەم سێ کایە گەورەیەی کەینونەی مرۆڤ(غەریزە, عەقڵ, ڕەوشت) لەشریتێکدا بیریاری گەورەی ئێرانی کاک ئەحمەدی موفتی زادە لە ڕوانگەی فەلسەفەو دینەوە زۆر وردو شرۆڤەیانی کردوە.

تا لە ژێر ڕۆشنایی دیندا بێت دەستلەملانی خێرو خۆشیە و دوورە لە زیان و لە لادان، هاوڕێیە لەگەڵ دڵئارامی و ڕەوشتبەرزیدا.

بە پێچەوانەشەوە هەرکاتێ لەو چرایە دوورکەوتەوە ئەگەری تیاچوونی ڕۆحی و دەروونی و عەقڵی و تەنانەت جەستەیشی هەیە.

ئەم ئەرکە بە وەڵامی ئەم پرسیارە ئەنجامئەدرێت کە ئەڵێت : **«ماذا يعني انتمائي للاسلام»**.

واتە ئینتیمای من بۆ ئیسلام مانای چییە؟

وەڵامەکەی ئەوەیە : مادام من ئینتیمام کردووە بۆ ئیسلام ئەبێ:

١- عەقیدەیەکی موسڵمانانە و دروستم هەبێت.

٢- لە عیبادەتدا چالاک بم.

٣- لە هەڵسوکەوتدا بەڕەوشت بم.

٤- بەسەر دەروونی خۆمدا زاڵببم.

٥- بۆ ئیسلام بژیم و کاری بۆ بکەم.

بیرمەندی گەورەی لوبنانی (فتحی یکن) کتێبێکی هەیە بەو ناونیشانەی سەرەوە و زۆر بەووردی وەڵامی ئەو پرسیارە و چەند پرسیاری تر ی پەیوەند بە ئینتیمای دینی وەڵامداوەتەوە.

**ئەرکی دووەم: خۆشارەزاکردن لە دیندا.**

هەرئەوەندە بەس نیە کە مومارەسەی دینداری خۆت بکەی بەشێوەیەکی درووست و دوور لە کەمتەرخەمی و ڕۆچوون، چونکە ئەوە پلەی یەکەمی داواو ئەرکە ئیسلامیەکانی سەرشانتە، ئەرکی دوای ئەوە ئەوەیە کە خۆت شارەزابکەیت لە دیندا، لە قورئاندا، لە حەدیسدا، لە فقهدا، لە عەقیدەدا، لە مێژووی ئیسلامیدا، لە فقهی بانگەوازدا.

چونکە خێری تۆ لەوەدایە کە دەستبەخێر بیت بۆ خەڵکی، خەمیان بخۆی، چاکەیان بۆ جوان و شیرین بکەی، خراپەیان بۆ قێزەون و ناشیرین بکەی، ئەوەتا خوای گەورە ئەفەرموێ: ﴿كُنتُمۡ خَيۡرَ أُمَّةٍ أُخۡرِجَتۡ لِلنَّاسِ تَأۡمُرُونَ بِٱلۡمَعۡرُوفِ وَتَنۡهَوۡنَ عَنِ ٱلۡمُنكَرِ وَتُؤۡمِنُونَ بِٱللَّهِۗ كُنتُمۡ..﴿١١٠﴾﴾ [آل عمران] (١١٠) واتە: ئێوە بە خێرترین ئومەتێکن کە پەروەردەکراون بۆ خێری خەڵکی لەبەرئەوەی هەمووتان فەرمان بەچاکە ئەکەن و بەرگری ئەکەن لە خراپە و بڕوا بەخواو ئەو شتانە ئەکەن کە خوا ئەیان فەرموێت.

خوای گەورە ئەفەرموێت: ﴿وَلۡتَكُن مِّنكُمۡ أُمَّةٞ يَدۡعُونَ إِلَى ٱلۡخَيۡرِ وَيَأۡمُرُونَ بِٱلۡمَعۡرُوفِ وَيَنۡهَوۡنَ عَنِ ٱلۡمُنكَرِۚ فَقَدَ..﴿١٠٤﴾﴾[ آل عمران] با لە ئێوە ئومەتێک پێک بهێنرێت، هەموو خەڵکی بانگبکەن بۆ چاکەو خێر و فەرمانبکەن بەچاکەو بەرگریبکەن لە خراپە.

یەکەم هەنگاو لەم ڕێڕەوەدا بریتیە لە: خۆشارەزاکردن لە قورئاندا، پاشان لە فەرمودەکانداو پاشان لە عەقیدەو پاش ئەوەش لە فیقهدا..

**زانایان ئەفەرموون: مرۆڤ بە پێنج ڕێگە ئەتوانێت خۆی شارەزابکات لەدیندا:**

یەکەمیان: ببێتە قوتابی لای مامۆستایەک و چۆک دابدات لە خزمەتیداو گرێی هەموو کەشکۆڵەکانی لەلای ئەودا بکاتەوە و وازی لێنەهێنێ و پەیمانی بداتێ هەتا شارەزانەبێت دانەبڕێت لەو دەرسانە.

دووەمیان: سەربکاتە خوێندنەوەی بەردەوام و کام ڕێگەیە درووست و کاریگەرە لە خوێندنەوەدا بیگرێتەبەرو پێڕەوی لێبکات، زانایان هەریەکەیان ئیجتیهادێکی تایبەتیان هەیە لەم مەیدانەدا.[١]

سێیەمیان: لەگەڵ هاوڕێکانیدا پێکەوە(موزاکەرە) بکەن: هەریەکەیان دەرس بە ئەوانی تریان بڵێتەوە لەو زانستەی هێزی بەسەریدا ئەشکێت و گوێ بۆ ئەوانی تریش بگرێت لەوزانستانەی کە یەکێک لە ئەوان هێزی بەسەریدا ئەشکێت.

چوارەمیان: گوێگرتن بۆ (سیدی) و (شریت) و (موحازەراتی) زانایان لە ڕووی بەرنامەیەکەوە کە هاوکاری بێت بۆ زیاتر تێگەیشتن لێی.

پێنجەمیان: پرۆڤەکردن لەو شتانەدا کە ئەیانزانێت و وتنەوەی بە خەڵکی و دروستکردنی ئینتیمای دینی بۆیان، یان نووسینەوەی ئەو بیرۆکانە، یان وەرگێڕانیان بۆ زمانی کوردی.

ئەم چوار ڕێگایەی کۆتایی هەندێک ترسناکیان تێدا هەیە و لە هەموویاندا ئەبێت گەڕانەوەت هەبێت بۆ مامۆستایەکی شارەزا کە دوو توخمی سەرەکی لەو مامۆستایەدا هەبێت:

١- دینداری.

٢- هۆشیاری.

مەبەست بەیەکەمیان ئەوەیە ئەو کەسە کەسێکی بەتەقواو صالح بێت و دینی خۆشبوێت و بۆ دین تێبکۆشێت، مەبەست بە دووەمیشیان ئەوەیە ئەو کەسە شارەزابێت لە خەڵک و لە کۆمەڵگەو ئاگاداری واقیع بێت و دانەبڕابێت لێی، بە توخمی یەکەمیان بەدوور ئەبی لە لادان لە بناغەی دینەکەدا، بە توخمی دووەمیان بەدوور ئەبی لە هەڵە مومارەسەکردنی دینەکە لەگەڵ واقیعدا. زانایان هەریەکەیان لەڕووی ئەزموونی خۆیەوە پێشنیاری بەرنامەیەکیان کردووە کە گەنج پێڕەوی لێبکات بۆ ئەوەی زانیاریەکی زۆر بە کاتێکی کەم وەربگرێت، ئێمەش لە گوڵزاری ئەوانەوە پێشنیاری ئەم بەرنامەیە دەکەین.

---

١. بۆ شارەزابوون لە میتۆدی خوێندنەوە باشئەکەیت ئەگەر کتێبی(پەروەردەی منالان لە ئیسلامدا) بخوێنیتەوە کە پرۆژەی تیشک لە دوو بەرگی قەبارە گەورەدا بڵاویکردووەتەوە، چونکە بەڕاستی کتێبێکی نایابە و ئەو باسەشی بەجوانی شرۆڤەکردووە.

**بۆ شارەزا بوون لە قورئان ئەم هەنگاوانە هەڵبگرێ:**

أ. هەموو ڕۆژێک بڕێک لە قورئان بخوێنێتەوە تا ڕۆحی تێربکات لە لایەک و لە لایەکیش دەرگای زانیاری تازە بکاتەوە لە خۆی، چونکە لە ڕاستیدا قورئان وەک چۆن کتێبێکی موبارەکە و ڕۆح تێردەکات، هەرواش سەرچاوەیەکی دەوڵەمەندی ڕۆشنبیری و مەعریفییەو عەقڵ بەهێز و دەوڵەمەند ئەکات.

ب. هەموو ڕۆژێک لە یەکێک لە تەفسیرە کوردیەکاندا تەفسیری ئەو ئایەتانە بخوێنێتەوە و خاڵە گرنگەکانی لە دەفتەرێکدا بنوسێتەوە و بیانپارێزێت.

ج. هەفتەی جارێک یەکێک لە کتێبەکانی حەدیس بخوێنێتەوە، وەک (صەحیحی بوخاری)، (صەحیحی مسلم)، (ریاض الصالحین) بە کوردی لە نووسینی مامۆستا نووری فارس.

– خوێندنی (فیقهی ئاسان) لای مامۆستایەک، یان خوێندنەوەی بەردەوامی (فقه السنه بە کوردی)، یان(پوختەی شەریعەت)ـەکەی ملاموحەممەدی بامۆکی، تا زانیاری لەسەر «فقه» زیاد بکات.

هـ لە عەقیدەشدا کتێبی (بیروباوەڕی موسڵمان لە قورئان وسونەتدا ) لە نووسینی تاریق هەمەوەندی بخوێنێتەوە بۆ نمونە، یان لای کەسی شارەزا بیخوێنێت.

پاش ئەمانە گەنج ئیتر قەیدی نیە هەرچی ئەخوێنێتەوە، چونکە سەرەتا ئەبێ هەندێ (پێوەر) فێرببێت کە بیانکاتە ترازوو بۆ کێشانی هەموو بیر و بیردۆزەیەک، هەموو کارو کردەوەیەک، تا بزانێ کێ بە شوێن هەقەوەیە وکێش هەقی لێونبووە و سەرگەردانە، عومەر ئەفەرموێ: (اعرف الحق تعرف اهله) سەرەتا هەق بناسە! دوای ئەوە خود بە خود ئەهلی هەقیش ئەناسی، گەنج کە ئەو پێوەرانە فێربوو، پێویستە بەردەوام بخوێنێتەوە و بۆ ساتێکیش لە خوێندنەوە دانەبڕێ، چونکە خوێندن و خوێندنەوە خۆراکی مێشک و دڵە.

**ئەرکی سێیەم : کاراکردنی پرۆسەی زەواج.**

بەهێزترین و بەفشارترین غەریزە لە ژیانی گەنجدا بریتییە لە غەریزەی جنسی، هەر زوو ئەم غەریزەیە ئەکەوێتە هاندانی گەنج و وروژاندنی، بۆیە نە گەنجەکە خۆی و نە ئەوانەش سەرپەرشتیاری ئەون و تەنانەت نە دینیش ناتوانن ئەم فشارو بزواندنە پشتگوێ بخەن یان داوای خەفەکردنی بکەن..

گەنج ناتوانێت خۆی خەفەبکات، چونکە هەموو خەفەکردنێکی خۆی خەمۆکیەکی بۆ درووست ئەکات، سەرپەرشتیارەکانی ناتوانن پشتگوێی بخەن، چونکە هەموو پشتگوێخستنێک ئەو گەنجە تووشی تێکشکانێک یان یاخیبوونێک یان لادانێک ئەکات.

دینیش ئەم حاڵەتەی پشتگوێ نەخستووە و حسابی ووردی بۆ کردووە، چونکە ئەزانێ کە ئەو غەریزەیە ڕیشەدارە و کەس ناتوانێت ئەو غەریزەیە خەفەبکات، خوای

گەورەش ئەو غەریزەیەی بۆ ئەوە نەداوە بە مرۆڤ تا خەفەی بکات، بەڵکو بۆیە پێیدراوە تا لە ڕێگەی درووستەوە بەکاریبهێنێ و ئەو ئامانجانەی لەو غەریزەدا هەیە بە دەستیان بهێنێ، کە زانایان بە کورتی ئەڵێن سێ ئامانجە :

١. نەوەخستنەوە و بەردەوامیدان بە ژیان.

٢. چێژبردن و گەشکردنەوەی ژیان.

٣. تێگەیشتن لە بەهەشت و نازو نیعمەتەکانی.

ئیمامی غەزالی ئەفەرموێ: بەم غەریزەیە مرۆڤ حاڵی دەبێت کە بەهەشت چییە؟ حۆری یانی چی؟ نازو نیعمەتەکانی بەهەشت چەندە چێژ بە مرۆڤ دەبەخەشن؟.

لەبەر ئەمانە دین هانی گەنجان ئەدات کە بەرەوڕووی پرۆسەی زەواج برۆن و ئەو پرۆسەیە کارابکەن، بە تایبەتی ئەوانەیان کە توانای ئەنجامدانی ئەو پرۆسەیان هەیە.

خوای گەورە ئەفەرموێ:

﴿فَٱنكِحُواْ مَا طَابَ لَكُم مِّنَ ٱلنِّسَآءِ ...﴿٣﴾﴾ [النساء] ، زەواج بکەن لەگەڵ ئافرەتی پاک و حەلالدا، ﴿وَمَن لَّمۡ يَسۡتَطِعۡ مِنكُمۡ طَوۡلًا أَن يَنكِحَ ٱلۡمُحۡصَنَٰتِ ٱلۡمُؤۡمِنَٰتِ فَمِن مَّا مَلَكَتۡ أَيۡمَٰنُكُم مِّن فَتَيَٰتِكُمُ ٱلۡمُؤۡمِنَٰتِۚ وَٱللَّهُ أَعۡلَمُ بِإِيمَٰنِكُمۚ وَأُحِلَّ..﴿٢٥﴾﴾ [النساء] ئەوەش کە نەیتوانی لە ئێوە لەبەر دەست کورتی، ئافرەتانی سەربەستی باوەڕدا مارە بکات، ئەوە با لە کچەکەنیزەکە ئیماندارەکانتان بخوازێت، خوایش زانایە کە ڕادەی ئیمانتان چەندە و چۆنە، ئێوە هەندێکتان لە هەندێکتانن (هەمووتان لە ئادەم و حەوان و ئەم جیاوازیە چینایەتیە شتێکی کاتی یە)، لەبەرئەوە ئەو کەنیزەکانە مارە بکەن لەسەر ڕەزامەندی کەس و کارو خاوەنەکانیان و مارەییان بەچاکی پێ بدەن، خۆڕاگریتان (تا خوا دەرووتان لێدەکاتەوە) چاکترە بۆتان، خوایش لێخۆشبوو و میهرەبانە.

پێغەمبەریش (ﷺ) ئەفەرموێت : {یا معشرالشباب من استطاع منکم الباءة فلیتزوج، فمن لم یستطع فعلیه بالصوم فأنه له وجاء}. ئەی بەرەی گەنجان ! هەرکەسێکتان ئەتوانێ و لەباریدا هەیە ژن بهێنێ با بیهێنێ، ئەگەر نەیتوانی با ڕۆژو بگرێت، ڕۆژو گرتن ئارەزووەکان ڕادەگرێت.

عبدللەی کوڕی مەسعود ئەڵێ: ئێمە پۆلێک گەنجبووین کە حەزرەتی عوسمان پێمان ئەگەیشت ئەیفەرموو، کوڕە گەنجەکان ژن بهێنن.

پێغەمبەر(ﷺ) زۆر هانی گەنجانی ئەدا کە تا ئەتوانن زووتر ژن بهێنن، چونکە ئەیزانی ئەوە باشترین گەرەنتییە بۆ دامەزراندنیان و بۆ زیادبوونی ژمارەی موسڵمانانیش، ئەیفەرموو: { تزوجوا الولود الودود، فأني مكاثر بكم الأنبياء يوم القيامة }، هەر خۆی ژنی بۆ چەندین گەنجی ناو صەحابە هێناوە، بڕیاریشی وابوو کە ماڵی زەکات سەرف بکرێت

بۆ گەنجان تا ژنی پێ بهێنن.

یەکێک لە گەورەترین سەروەرییەکانی یاسای زەکات: کردنەوەی دەرگای ژنهێنانە بەماڵی زەکات.. ئیبن کەسیر لە (البدایە والنهایە)دا، دەربارەی (عومەری کوڕی عەبدولعەزیز) ئەڵێت: «....وكان مناديه فى كل يوم ينادي: أين الغارمون؟ أين الناكحون؟ أين المساكين ؟ أين اليتامى؟....حتى أغنى كلا من هؤلاء» (١)، جاڕدەری عومەر هاواری ئەکردو جاڕیئەدا: قەرزارەکان لەکوێن -با بێن-، کەمدەستەکان لە کوێن؟ بێ باوکەکان لە کوێن؟.. تا کار گەیشتە ئەوەی هەموو ئەمانەی دەوڵەمەند و بێمنەت کرد لە خەڵکی!..بەڵگەی ئەم کارەی عومەریش حەدیسێکی پێغەمبەرە (ﷺ) کە ئەبوهورەیرە ئەگێڕێتەوە ئەڵێت: «کابرایەکی ئەنصاری هاتە لای پێغەمبەرو وتی: قوربان! ژنم هێناوە، پێغەمبەر فەرمووی: لە سەر چەند مارەت بڕیوە؟ وتی: لەسەر چوار «ئەواق»، پێغەمبەر فەرمووی: «چوار ئەواق»؟! ئەڵێی لەو شاخە زێڕ دەردەهێنی! پاشان فەرمووی: «ما عندنا ما نعطيك ولكن عسى ان نبعثك فى بعث تصيب فيه» [٢]. ئێمە ئەوەندەمان لا نیە بیدەین بەتۆ! بەڵکو ڕێکبکەوێت لەگەڵ مەفرەزەیەکدا بەشداری جیهادت بکەین و دەستکەوتێکت لە دوژمنەوە دەست بکەوێت..

ئەم فەرموودەیە وادەردەخات کە یارمەتیدانی پێغەمبەر (ﷺ) وەک سەرۆکی دەسەڵاتی ئیسلامی، بۆ زەواجکردن لای»صەحابە» زانراو بووە، بۆیە ئەم سەحابەیە دێتە لای پێغەمبەرو ئەو داوایە ئەکات، پێغەمبەریش ئەفەرمووێت: «ما عندنا مانعطيک»، نافەرمووێت: ئەم ماڵە مافی ئێوەمانانی تێدا نیە، وەک بە دوو کابراکەی تری فەرموو: «ئەم ماڵە مافی دەوڵەمەندو کەسی بەهێزی تێدانیە»، بەڵام پێغەمبەر (ﷺ) بۆ ئەم کابرایە چارەسەرێکی تری دانا فەرمووی: بەڵکو بتنێرن بۆ غەزایەک و لەو غەزایەدا تووشی خێرێک ببیت.

هەر لەبەر ئەم هەڵسوکەوت و سونەتەی پێغەمبەرە(ﷺ) کە خەلیفەکانی ڕاشیدین لە ماڵی زەکات ژنیان بۆ هەموو گەنجانی کۆمەڵگەی ئیسلامی هێنا و ئەو قەیرە کچانەش کە شوکردنیان دواکەوتبوو بڕێکی باش پارەیان دانێ تا خەڵکانێک هەبن بەو بیانووە بیانخوازن و پاشان ئولفەت و خۆشەویستی بکەوێتە نێوانیان و خێزان دروست بکەن.

یەکێک لە سیاسەتە سەرکەوتووەکانی عومەری کوڕی عەبدولعەزیز»ڕەزای خوای لێبێت» وەک دکتۆر یوسف ئەلقەرزاوی لە کتێبی (تاريخنا المفترى علية)دا باسی ئەکات -لە بواری ئابووریدا - ئەوەیە، کە (ئەبو عبید) لە کتێبی(الاموال)دا باسیئەکات و ئەڵێ: عومەر

١. البداية والنهاية (٩/ ٢٠٣).

٢. نيل الأوطار ـ الشوكاني، «ئەواق» لەو کاتەدا بریتیی بووە لە (٤٠) درهەم کە مەڕێکی چاک بە (٥) درهەم بووە.

نامەیەکی بۆ عەبدولحەمیدی کوڕی عەبدوڕڕەحمان نووسی، کە والی سەر عێراق بوو، هەرچی بەرماڵەی خەڵکی هەیە هەمووی دابەشبکە بە سەریانداو بیاندەرێ، عەبدولحەمید نامەیەکی بۆ نووسی و تێدا وتی: قوربان! هەموو دەرماڵەکانم پێداون و (بيت المال)یش هەر تێیدا ماوەتەوە، عومەر بۆی نووسی: سەیر بکەو بزانە کێ تووشی قەرزاری بووە- نەک لەبەر بێعەقڵی و دەستبڵاوی- قەرزی هەموویان بدەرەوە، پاش ئەوە والییەکە بۆی نووسیەوە و وتی: قوربان! قەرزی هەموو قەرزارەکانیشم داوەتەوەو (بيت المال)یش هەر شتی تێدا ماوە، عومەر بۆی نووسی: بگەڕێن بزانن کێ کاتی ژنهێنانی هاتووە و ئەیەوێت ژن بهێنێ، ژنیان بۆ بهێنە و مارەییەکانیان بۆ بدەن، عەبدولحەمید بۆی نووسیوە: قوربان! ژنم بۆ هەموو گەنجەکانیش هێناوە (بەیتولمال)یش هەر زیادەی تێدا ماوە، عومەر بۆی نووسی: بڕوانە و بزانە کێ (جزيه)ی لەسەرە و بەرهەمی زەوییەکەی کەمی کردووە (واتە زەوییەکەی بێهێزو کەم پیت بووە.. ( وەرگێڕ )

ئەوەندە سلفەی بدەرێ کە بتوانن زەوییەکانیان بەهێز بکەنەوە، چونکە ئێمە تا یەک دوو ساڵی تریش پێویستمان بەو پارانە نابێت[١].

١- پرۆسەی زەواج لە ژیانی گەنجاندا لەچەند ڕووەوە سوودی هەیە:

٢- پەرژین بۆ ئیمانی کوڕ و کچی هاوسەرگیر دروستدەکات و بازاڕی شەیتان ئەشکێت.

٣- ئارامی بە ڕۆح و جەستەی هەردووکیان ئەدات و چێژ لە یەکتری ئەبەن.

٤- بازنەی گەندەڵی ڕەوشتیی تەسک ئەبێتەوە و بازنەی پاکیزەیی فراوان ئەبێت.

٥- نەوەی زیاتر ئەخرێتەوە و ژمارەی موسڵمان و میللەتەکان زیاد ئەکات.

٦- کێشە کۆمەڵایەتییەکان کەم دەبنەوە و پەیوەندیە کۆمەڵایەتییەکان پتەوتر ئەبن.

٧- تۆڕی خزمایەتی فراوان دەبێت و خێزان و عەشرەت و میللەتان زیاتر پێکەوە گرێ دەخۆن و یەکتر ئەناسن.

٨- گیانی بەرپرسیارێتی لە کوڕ و کچدا گەشە ئەکات و زیاتر ئەبنە توخمێکی بەرهەمهێن نەک توخمێکی بخۆرو بەکاربەر.

٩- زەمینە بۆ جێبەجێکردنی ڕێوشوێنەکانی ئیسلام سازتر ئەبێت و خێزانێکی زیاتر باوەش بۆ دین و ڕێنماییە دینیەکان ئەکەنەوە.

١٠- لەهەمووی زیاتر هەست لەکوڕو کچی هاوسەرگیردا دروستئەبێت کەخەم لەپرۆسەی زەواج بخۆن تەنانەت بۆ ئەو کەسانەش کەدوورن لەدین و ڕێنماییە دینیەکان، چونکە قەناعەت پەیدائەکەن بەوەی کە بە زەواجکردنیان خراپەیان کەمدەبێتەوەو شەڕیان لەکۆمەڵگە دوور ئەکەوێتەوە با دینداریش نەبن، تەنانەت با ناحەزیش بن بە دین!

---

١. (الأموال)، بن عبيد، تحقيق: هواس، (ص ٣٥٧ ـ ٣٥٨).

**ئەركی چوارەم: پێشكەوتن لەكایەكانی خوێندندا.**

گەنج داوا لێكراوە كە لە خوێندن ماندوو نەبێت، بە نەخوێندەواری وعەوامبونەوە قایل نەبێت، بەڵكو بۆ پلە بەرزەكانی خوێندن خۆی ساز بدات و پاش تەواوكردنی زانكۆش هەوڵی خوێندنی باڵا (ماستەرو دكتۆرا)ش بدات و خۆی بگەیەنێتە سەنتەرەكانی بڕیار لەم وڵاتەدا، چونكە پێویستە لە سەنتەرەكانی بڕیاردا خەڵكی خوێندەوارو بەئاگا هەبن تا لەلایەك زامنی زانستیی بڕیارەكان بكەن و لەلایەكیش زامنی ئومێد و ئاواتەكانی گونجان بكەن.

گەنجان هەندێك جار كەمتەرخەمی و خەمساردی ئەنوێنن لە خوێندندا لەبەر هۆی زۆر سادەو بێبایەخ، بۆ نمونە ئەڵێن: خوێندن لەم وڵاتەدا داهاتووی دیار نیە! دەوڵەمەندێك سەدان خوێندەوارو خاوەن بڕوانامەت بۆ هەڵدەسوڕێنێ! ماڵەوە پێویستیان بە هاوكاری هەنوكەیی من هەیە و منیش (یاعەمر) تا خوێندن تەواو دەكەم!

ئەم پاساوانە هیچیان شایەنی ئەوە نین گەنج دەست بە خوێندنەوە بنێ و شان بداتە ژێر كاسبیكردن، چەند گەنج هەیە كە كارو كاسبیش ئەكات و خوێندنیش ئەكات و نایەڵێت نە كڵاوی خۆی و نەكڵاوی خێزانەكەشی لار ببێت.

من بنوسی ئەم نامیلكەیە بیرمە لە قوتابخانەی سەرەتاییەوە، تاقێك ئەمخوێند و تاقێكیش كارم دەكرد و ئەوەشی پەیدامدەكرد دەمكردە دەستی ماڵەوە، لەم كارەشم بەردەوام بووم تا چوومە زانكۆ، كاتێك لەبەر نەچوونە سەربازی و سوپای بەرگری- كەحزبی بەعس كردبوویە شتێكی ئیجباری- فەصل كرام لەسالی ١٩٨٦ دا هاتمەوە بۆ شارەكەم و دوكانێكم دانا و بەشوێن دەرفەتێكدا ئەگەڕام كە خوێندنەكەم تەواو بكەم، ئەوەبوو قەدەری خوا ئەو دەرفەتەم بۆ نەڕەخسا تا ساڵی ٢٠٠٣ و كەوتنی ڕژێمی بەعس، پاش ئەو ساڵە چومەوە و لە بەغدا كۆلێژی ئیمام ئەعزەمم تەواوكرد، پاشان بەرنامەی خوێندنی زیاتریشم دانا، هەرچەندە ئەوە گرێی پێنجەمی تەمەنیشم كردووەتەوە و بەرەو كردنەوەی گرێی شەشەم ئەڕۆم و هەر لە فرسەتێك ئەگەڕێم كە خوێندن تەواوبكەم، چونكە بڕوام وایە كە خوێندن جگە لەوەی چێژی تایبەتی خۆی هەیە، ڕێز و حورمەتی تایبەتی خۆشی هەیە و خوای گەورەش ڕاست ئەفەرموێ لە قورئاندا: ﴿...قُلْ هَلْ يَسْتَوِي الَّذِينَ يَعْلَمُونَ وَالَّذِينَ لَا يَعْلَمُونَ ۗ إِنَّمَا يَتَذَكَّرُ أُولُو الْأَلْبَابِ ﴿٩﴾﴾ [الزمر] ( ئەی پێغەمبەر! بڵێ: ئایا ئەو كەسانەی كە دەزانن و شارەزان، وەك ئەوانەن كە هیچ نازانن و شارەزاییان نیە؟، بەڕاستی تەنها خاوەن بیروهۆشەكان لەم جۆرە یاداوەریانە سوود وەردەگرن و تێدەگەن. هەروەها ئەفەرمویت: ﴿...يَرْفَعِ اللَّهُ الَّذِينَ آمَنُوا مِنكُمْ وَالَّذِينَ أُوتُوا الْعِلْمَ دَرَجَاتٍ يَكُونُ...﴿١١﴾﴾[المجادلة]. خوای گەورە ئەوانەی ئیمانیان هێناوە لە ئێوە و ئەوانەشتان زانست و زانیاریان پێدراوە چەندەها پلەو پایە بەرزیان دەكاتەوە.

پێغەمبەری ئیسلامیش ئەفەرموێت: {إن الله و ملائكته و حتى الحوت في البحر ليصلون على معلم الناس الخير }، خواو فریشتەکان و تەنانەت ماسی ناو دەریاکانیش نزای خێر بۆ ئەوکەسانە ئەکەن کە خەڵکی فێری خێر ئەکەن، هەروەها ئەفەرموێت:{ من جاء مسجدى هذا لم يأته إلا لخير يتعلمه أو يعلمه فهو بمنزلة المجاهد فى سبيل الله، ومن جاء لغير ذلك فهو بمنزلة الرجل ينظر إلى متاع غيره}[1]، هەرکەسێک بێتە ئەم مزگەوتەی من و هیچ نەیهێنێت ئەوە نەبێت کە بۆ فێربوونی خێرێک بێت یان بۆ ئەوە بێت خەڵکی فێری خێرێک بکات ئەوە وەک کەسێکی موجاهید وایە لە پێناوی خوادا، هەرکەسێکیش بۆ یەکێ لەو شتانە نەیەت ئەوە وەک ئەو کەسە وایە کە هەر بۆ شتومەکی خەڵکی بڕوانێت، هەروەها ئەفەرموێت: {إن الملائكة لتضع اجنحتها لطالب العلم رضى بما يصنع}، واتە: خوا و فریشتەکان و ماسی دەریاکانیش صەڵاوات ئەدەن لەسەر ئەوەی خەڵکی فێری خێر دەکات، فریشتەکان باڵیان ڕائەخەن تا خوێندکار بەسەریدا بڕوات وەک قەدرزانیەک بۆ ئەو کارەی ئەیکەن.

دەی کە خوا و فریشتەکان و ماسی دەریاکانیش صەڵاوات بدەن لەسەر ئەوەی خەڵکی فێری خێر دەکات و فریشتەکان باڵیان ڕابخەن تا خوێندکار بەسەریدا بڕوات وەک قەدرزانیەک بۆ ئەو کارەی ئەیکەن، وڵات و میللەت چاوەڕوانی خوێندن و زانستی نەوەکانی بن، کەواتە بۆچی هەرچی تەمەنە سەرفی ئەو کارە نەکرێت، چیتر هەیە لە خوێندن بەئەرزشتر بێت لە لای خواو لە لای فریشتەو لە لای میللەت و خەڵک.

حەیفە گەنج کە لە لوتکەی هێزی عەقڵی و جەستەیدایە تاو نەداتە خۆی و پلە بەرزەکانی خوێندن بەدەستنەهێنێت، حەیفە گەنج لەبەر جلەوشلکردن بۆ عاتیفەیەکی کاتی واز لە خوێندن بهێنێت و لە پاشاندا هەموو ژیانی بە پەشیمانی و سەرکزی بەسەربەرێت.

## ئەرکی پێنجەم: ئینتیما بۆ میللەت و نیشتمان.

گەنجان هەندێ جار ئەوەی نرخی لایان نامێنێت ئەوەیە کە باس لە ئینتیما بۆ میللەت یان نیشتمان بکەن، بۆیە سادەیە لایان بە هەرشێوەیەک بووە سامانێک پێکەوە بنێن وبەرەو هەندەران هەڵبێن. هەڵاتنی گەنجان بۆ هەندەران بەڵگەیە لەسەرئەوەی کە گیانی ئینتیمای بۆ نیشتیمان ئەوەندە بەهێز نییە کە ئامادەی قوربنیدان بن لە ڕێگەیدا، ئەوەندە ئومێدیان بە داهاتوی نیشتمان و میللەت نیە کە بە دیاریانەوە دابنیشن و خزمەتی بکەن. ڕێیتێدەچێت کە هەڵاتنی گەنج هۆکاری زۆری ببێت و یەکێک لەوانە لاوازی ئینتیمایان بێت بۆ گەل و نیشتمان، بەڵێ ئەمە ڕاستە و نکوڵی لێ ناکرێت، بەڵام ئەگەر ئەو ئینتیمایەیان بەهێز بێت ئەوە ئامادە ئەبن لە پێناویدا باج و قوربانی بدەن.

کەس نییە ئەرزشی پێویستی خۆی دەستبکەوێت ئەگەر نیشتمانی نەبێت و ئاوارە بێت

---

١٠ رواه ابن أبى شيبة ، وأبو داود ، والحاكم، و البيهقى فى )شعب الإيمان) عن أبى هريرة.

لە وڵاتانی تردا و غەریبە و باربێت بەسەریانەوە، خوای گەورە ئەفەرموێت ﴿...وَجَعَلْنَٰكُمْ شُعُوبًا وَقَبَآئِلَ لِتَعَارَفُوٓاْ تجسسوا..﴿١٣﴾ ﴾ [الحجرات] ئێمە ئێوەمان کردووە بە چەندین گەل و تیرەی جیاجیا تا یەکتری باسن و کولتوور لەگەڵ یەکتری بگۆڕنەوە..

ئێمە بڕیارمان داوە ئێوە لە شێوەی گەلان و خێڵی جیاجیادا بن، تا یەکترناسین و چاکەکردن بەرامبەر بە یەکتر بکەن. کەواتە ئەوە بڕیاری خوایە کە من کورد و تۆ عەرەب و ئەو فارس و ئەوەکەی تر تورک و بەو شێوەیە ڕووبەڕووی ژیان ببینەوە، نە من ئەتوانم تۆی عەرەب و نە ئەویش ئەتوانێت کابرای تورک و نە کەس ئەتوانێ میللەتێکی تر بسڕێتەوە و زمان و کەلتور و نیشتمانی کوێربکاتەوە و چزی بکات.

تادونیا دونیایە ئەبێت خەڵکی بەو شێوەیە بژین کە خوا بڕیاری داوە، کەس ناتوانێت لەبەردەم ئەم بریارە خواییەدا ڕابوەستێت چەند لێوانلێویش بێت لە شۆڤێنیەت و ڕەگەزپەرستیدا، یەکێتی سۆڤیەت حەفتا ساڵ بە ئاگر و ئاسن ویستی خەڵکی بکاتە یەک ڕەنگ و یەک دەنگ، نەیتوانی و تێکشکا و میللەتە جیاجیاکان و نیشتمانە جیاجیاکان ئەو حەفتا ساڵە لە سەرکوتکردن و چزکردن وەک خۆیانیان لێهاتەوە و هەموو ئازادی خۆیانیان هێنایەوە ژێر چنگی خۆیان!

لە ئیسلامدا نەتەوایەتی و سۆزی میللی و خاک چەند شێوەیەکەو لە نەخشەی پەروەردەی ئیسلامیدا ڕووبەر بۆ هەر شێوەیەکیان دانراوە، لەوانە :

* خۆشەویستی نەتەوە و حەز کردن بەسەربەرزی لە ناخی هەموو کەسێکدا هەیە و خوای گەورە دروستیکردووە، بۆ ئەوەی میللەتان هەڵنەوەشێننەوە و کوێر نەبنەوە ﴿... وَجَعَلْنَٰكُمْ شُعُوبًا وَقَبَآئِلَ لِتَعَارَفُوٓاْ تجسسوا..﴿١٣﴾ ﴾[الحجرات] ئێمە ئێوەمان کردووە بە چەندین گەل و تیرەی جیاجیا تا یەکتری باسن و کولتوور لەگەڵ یەکتری بگۆڕنەوە..

﴿ وَمِنْ ءَايَٰتِهِۦ خَلْقُ ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلْأَرْضِ وَٱخْتِلَٰفُ أَلْسِنَتِكُمْ وَأَلْوَٰنِكُمْ ۚ إِنَّ فِى ذَٰلِكَ لَءَايَٰتٍ لِّلْعَٰلِمِينَ ﴿٢٢﴾ ﴾ (الروم) یەکێک لە بەڵگەکانی دەسەڵاتی خوائەوەیە ئاسمانەکان و زەمینی دروستکردووەو زمان و ڕەنگی جیاوازی داوە پێتان، ئەمانە چەند بەڵگەیەکن بۆ خەڵکانی زانا.

* خۆشەویستی نەتەوە و نیشتمان لەژیانی پێغەمبەردا (ﷺ) لە چەند شێوەدا بوونی هەبووە، بۆ نمونە: پێغەمبەر (ﷺ) کە لە مەککە دەریانکرد بەچاوی پڕفرمێسکەوە سەیری مەککەی کردوو فەرمووی: ئەی مەککە! خۆشەویسترین نیشتمانی لەلام ئەگەر دەریاننەپەڕاندمایە هەرگیز جێم نەدەهێڵای.

* کە چوونە مەدینەش هەموو بیری مەککەیان ئەکرد، هەندێکیان لەتاو دووری نیشتمانەکەیان نەخۆشکەوتن! بۆ نمونە: ئەبوبەکر، بیلال. عائشە ئەفەرموێت پێغەمبەر (ﷺ) هەواڵی باوکمی لێپرسیم، عەرزمکرد: تایەکی زۆری هەیە ، فەرمووی: ئەوە سۆزی

بۆ مەککە وای لێکردووە!

بیلال بەدەم تاولەرزەوە وڕێنەی ئەکردو شیعری ئەوتەوە و ئەیوت:

لیت شعری هل ابیتن لیلة          بواد وحولی شامة وطفیل

خۆزگەم ! شەوێکی ترم دێتە پێش کە لە دۆڵێکدا بم و لە چواردەوریشمدا شاخی (طفیل) و (شامة) بەدەورمەوە بن؟ شامەو توفەیل دوو شاخی نزیک مەککە بوون.

پێغەمبەریش کە ئەمەی لە ئەصحابی بینی (رەزای خوایان لێبێت)،فەرموی :{اللهم حبب الینا المدینة کما احببت الینا مکة}.

پێغەمبەر (ﷺ) ئەصیل ناوێکی بینی هەواڵی مەککەی لێپرسی : ئەویش دەستیکردە هەواڵگێڕانەوەی مەککەو خەڵکەکەی، پێغەمبەر «ﷺ» پێی فەرموو : اصیل بەسە ئیترا! لێگەڕێ با دڵەکان ئارام بن {یا اصیل! دع القلوب تقرّ }.

* بەرگریکردن لە میللەت و نیشتیمان مافێکی سروشتی هەموو گەل و نەتەوەیەکە لە ئیسلامدا، وەک پێغەمبەری خوا لە دەیان فەرموودەدا ئەیفەرموێ:

* ئەفەرموێت: {خیرکم المدافع عن قومه ما لم یأثم}، باشترین کەستان ئەوانەتانن کە بەرگری لە میللەتی خۆی ئەکات ئەگەر گوناە نەبوو، لە ڕیوایەتێکی تردا ئەفەرموێ:{خیرکم المدافع عن عشیرته ما لم یأثم}، رواه ابو داوود. باشترین کەستان ئەوانەتانن کە بەرگری لە هۆزی خۆی ئەکات ئەگەر گوناە نەبوو.

* هەروەها ئەفەرموێ: {من قتل دون ماله فهو شهید، و من قتل دون عرضه فهو شهید، ومن قتل دون نفسه فهو شهید}. هەرکەسێک لەسەر ماڵی خۆی بکوژرێت ئەوە شەهیدە، هەرکەسێک لەسەر نامووسی خۆی بکوژرێت ئەوە شەهیدە، هەرکەسێک لەسەر خودی خۆی بکوژرێت ئەوە شەهیدە.

لە ئیسلامدا چ نیشتیمان و چ نەتەوە قابلیەتی فراوانبوونی زۆرە بە ڕادەیەک هەموو نەتەوە ئیسلامیەکانی دونیا بە برا و هاونەتەوەی خۆت بزانی، وە هەموو هەرێم و خاکە ئیسلامیەکانی تریش بەخاکی خۆت بزانی، بە خۆشییان دڵخۆش ببی و بە ئازاریان ئێشت پێبگات..

* ئیسلام هێزی خۆشویستی نەتەوەو نیشتیمان لە تاکەکاندا بەکار دەهێنێت بۆ خێری ئەو تاکە و نەتەوەی ئەو تاکە و بۆ خێری موسوڵمانان و تەنانەت بۆ خێری مرۆڤایەتیش، بۆ نمونە پێغەمبەر (ﷺ) وەسیەتی کردووە کە پارێزگاری لەو پەیوەندیە میللیانە بکرێت، تەنانەت لە جیهادیشدا -کە پیرۆزترین ئەرکی دینە- فەرمووی : هەموو کەسێک لەژێر پەرچەمی عەشیرەتەکەی خۆیدا بوەستێ و لە قۆڵی خزمانی خۆیەوە هەڵمەت بەرێت. چونکە پێغەمبەر ئەیزانی کە هەموو کەسێک حەز ئەکات بۆ عەشرەت و نەتەوەکەی خۆی قارەمانییەک و سەروەرییەک تۆماربکات و لەلای خەڵکی سەربەرزیان بکات، جا کەوایە

با ئەو حەزە بواری بۆ برەخسێنرێت و زەمینەی بۆ ساز بکرێت لە شتی خێردا.

بونی گروپ لە ئیسلامدا نەک یاساغ نییە بەڵکو ئالەتێکی چاک و ڕێگە پێدراوە، لەسەردەمی پێغەمبەردا دوو گروپی گەورە هەبوون: ئەنصارو موهاجر، دوو عەشیرەتی گەورەی وەک (ئەوس و خەزرەج) هەبوون، قورەیش هەبوو کە زۆرینەی ناو دورگەی عەرەبی بوون کە پێغەمبەر (ﷺ) ئەیفەرموو (الائمة من قريش)یانی: ڕێبەر ئەبێت لە قورەیش بێت. کەواتە گەنجان ئەبێت ئینتیمایان بۆ گەل و نیشتیمانی خۆیان نەک بە نادرووست نەزانن، بەڵکو ئەبێ بە ئەرکێکی گەورەی سەرشانی خۆیان بزانن، و لەژێر تەعالیمی ئیسلامدا هەوڵ بۆ ناساندن و خۆشەویستکردنی بدەن لەناو گەلانی ئیسلامدا، بەتایبەتی باپیرە صەلاحەدین شانازیەکی وای بۆ ئێمە تۆمارکردوە لەناو گەلانی ئیسلامیدا، نەتەوەیەک لە نەتەوەکانی ئیسلامی نییە ئێمەی نەوەی ئەو باپیرە بەڕێزە نەناسێت و تەنانەت خۆیشی بە قەرزارمان نەزانێت.

ساڵی٢٠٠٥ لە سەفەرێکی عومرەدا لەناو حەرەمی کەعبەدا بووم و ڕووبەڕووی کەعبەی پیرۆز ڕاوەستابووم، کابرایەکی ڕیشسپی جوان لە تەنیشتمەوە بوو، کەوتینە قسەکردن و بۆمرووونبوویەوە کە خەڵکی بوخارایە، منیش ویستم خۆمی پێبناسێنم و باسێکی باپیرە صەلاحەدینی بۆ بکەم، پرسیم چی دەربارەی کوردو صەلاحەدینی ئەیوبی دەزانی، کابرا وتی: میللەتانی ئیسلامی سەرزەمین هەموو قەرزاری سوڵتان صەلاحەدینن، قودس دوو جار ڕزگارکراوە، جارێکیان عومەری کوڕی خەتتاب بوو، جارێکیتریان سوڵتان صەلاحەدین ڕزگاریکردووە، بە هەمانشێوە لەگەڵ کابرایەکی تری پاکستانی کەوتمە قسەکردن هەمان هەست و سۆزی کابرای سەمەرقەندی دەربڕی بۆم و وتی: مناڵێکیشم ناوناوە صەلاحەدین.

کەواتە گەنجی کورد ئەبێت شانازی بەکوردبوونی خۆیەوە بکات، شانازی بەوەوە بکات کە نەوەی صەلاحەدینە، ئەبێ ئەو نهێنیە بدۆزێتەوە کە صەلاحەدینی ئەوەندە گەورەکرد دونیا بە ڕابەری خۆی قەبوڵی بکات و وەک کوردێکیش بۆی بڕوانن و دەماری شۆفێنێتی کەسیش لێنەدات لە ڕوویدا. ئەوە هۆکەی ئەوەبوو کە صەلاحەدین هەستێکی ئینسانی گەورە لە ناخیدا قوڵپیئەداو بازنە بچوکەکانی ژیانی هەموو بڕیبوو: (خودی خۆی)، (بنەماڵە)، (عەشیرەت)، (نەتەوە)، تەنانەت بازنەی (ئوممەت)یشی تێپەڕاندبوو، بەناو هەموویاندا گوزەریکردبوو، لە بازنە فراوانەکەی (ئینسانیەت)دا ئەژیا، کە هەموو ئەو هەستانەی تریشی تێدابوو، بە پێچەوانەی ئەوانەوە کە لەو بازنە بچوکانەدا ئەژین و نازانن هەستی مرۆڤانە چۆنەو ئەبێ چۆن بژین بۆ ئەو هەستە بەرزە، نەک ئەوە، بەڵکو لە لایان ئەو هەستە ئینسانیە وەهمەو میسالییەتەو پێناچێت کەس بیهێنێتە بوون و کارای بکات! بەڵام ڕاستیەکەی ئەوەیە ئەوان لە وەهمدا ئەژین و خۆیان لە هەستێکی تەسکدا قەتیس و گرمۆڵە کردووە..



پ.د. یادگار لەتیف شارەزووریی

# نامۆبوون.. پاڵنەری سەرەکی کۆچکردنی گەنجان بۆ ڕۆژئاوا



نامۆبوون (الاغتراب Alienation) تایبەتمەندییەکە لە تایبەتمەندییەکانی بوونی مرۆیی، بەشێکی دانەبڕاوی هۆشیاری تاکە بەرامبەر ئاڵۆزیی و ڕووبەڕووبوونەوەکانی واقیعی ژیاو، لە دنیای هاوچەرخماندا؛ بەهۆی پێشکەوتنی تەکنەلۆژیی گەورە و زۆر خێرا و پاش ئەوەی جیهان بەهۆی ڕایەڵەکانی پەیوەندی سنوربەزێنی زۆر پێشکەوتووەوە بووبە گوندێکی بچووک، تیایدا ئەم سەر و ئەو سەری گوێ زەمین بەیەکەوە گرێدرا و دانیشتوانی سەرزەمین ئاگایان لە یەکترییە، ئەمەش وای لە مرۆڤی هاوچەرخ کرد ئاگاداری هەموو ڕووداو و پێشهاتەکان بێت بە ڕەنگ و دەنگ و جوڵە، بەلێشاو زانیاریی جۆراوجۆر خۆیان بکەن بەناو ئامرازە زیرەکەکانی بەردەستی. ئەم بە ئاگابوونە و هۆشیارییەی تاک بەرامبەر ئەوەی ڕۆژانە دەگوزەرێت، بەتایبەتی لە جیهانی سێیەمدا، وایلێدەکات هەست بە جیاوازیی ژیان و گوزەران و ئاستی ئازادییە گشتیی و تاکییەکان و نەبوونی دەستەبەریی کۆمەڵایەتی و ئابووریی و تەندروستیی بکات، بە بەراود بەوەی لە وڵاتانی دیکە بۆ تاک و کۆمەڵگە بەردەستخراوە. ئەم جیاوازییە زەقانە هەستیی ئایرۆنیی (مفارقە)ی لەلا دروست دەکات و نامۆبوونی لەلا قوڵدەکاتەوە و لە باشترین باردا کۆششی تەواو دەکات وڵات بەجێبهێڵێت، تواناکانی بەشوێنێکی دیکە ببەخشێت و ڕەنجی لە خاکێکی تردا بکێشێت.

چەمکی نامۆبوون هەستی بێزاریی و بێتوانایی و جیابوونەوە لە خود و دوژمنایەتیی و دابڕان و گۆشەگیریی و نەمانی پێوەرەکان و بیرکردنەوە بەو ئاڕاستەیەی کە واقیعی ژیاو بێ ئامانجە و هەستکردن بە نەگونجاندن لەگەڵ بنەما کۆمەڵایەتییەکاندا (دامودەزگا کۆمەڵایەتیی و کولتووریی و سیاسییەکان) لەخۆدەگرێت.

زۆرێک لە بیرمەندان لایان بەلای ئەم بابەتە نوێ و هاوچەرخەدا کردووەتەوە، توێژینەوەی ئەزمونکاریی وردیان لەسەری ئەنجامداوە، لە پێشی هەموویانەوە: کارل مەنهایم و گرودزن وهیگل و دۆرکایم و ماکس ڤیبەر وفرۆید و یۆنگ و رایسمان و فیوبرباخ و هایدیگەر و سارتەر و کیرکیگارد و هابرماس. ئەم بیرمەندانە دەڵێن باری نامۆبوون بریتییە لەو بارە دەروونییەی تاک هەست بە ئینتیما ناکات بۆ کۆمەڵگە، دابڕانی قوڵ هەیە لە نێوان تاک و وڵاتدا بەهۆی نەمانی ئەمانجە سەرەکییەکان بەتاڵکردنەوەی ژیان لە واتا ڕاستەقینەکانی و باڵادەستکردن و تەشەنەسەندنی پوچێتی یاخود سیستمی پوچێتی (نظام التفاهة Banality System) لەناو کۆمەڵگەی هاوچەرخدا، کە دەبێتە مایەی بێتوانایی لە پێشکەشکردنی ئامانج و واتا و بەها بۆ تاک، هەروەها دەبێتە مایەی لە دەستدانی ئاڕاستە و نەمانی جەمسەری کۆکەرەوەی چالاکییەکانی. (کارل مەنهایم)

له کتێبی (دەستنیشانکردنێک بۆ سەردەممان DIAGNOSIS OF OUR TIM) پەنجە دەخاتە سەر خاڵێکی زۆر هەستیار و دەڵێت: «هیچ شتێک لەم سەردەمەدا نامان بزوێنێت، هەموو شتێک بووەتە هیچ».

ئالڤین تۆفلەر (Alvin Toffler)ی بیرمەندی ئەمریکی و توێژەری بواری داهاتوناسیی دەڵێت: تاک لە هەرشوێنێک بێت پێویستی بە تێرکردنی ئەم سێ پێداویستییە:

١-ئینتیما بۆ کۆمەڵێک شایستەی ئەو ڕێزە بێت ئەم لێی دەگرێت.

٢-ڕوونی ئەو پێوەرانەی دروست لە نادروست لەناو ئەم کۆمەڵەیەدا لەیەک جیادەکاتەوە.

٣-ئەو کۆمەڵەیە ئامانجی دیاریکراو و سەرەکی لە ژیاندا دیاری بکات.

گەر لە کۆمەڵگەی کوردیی وردبینەوە لە باشووری کوردستان، دەبینین هێزی دەسەڵاتدار هەر سێ پێداویستییەکەی بەمەبەست یاخود بەهۆی نەزانین و بێئاگاییەوە پشتگوێخستووە، بەڵکو بەکرداری پێشێلکاریی و پەراوێزخستن و کوشتنی خەون و تواناکانی گەنج پەیڕەو دەکرێت بەشێوەی جیاواز و لە ئاستی جیاواز و بە ئامراز و کەرەستەی جۆراوجۆر، لە ڕێگەی زاڵبوونی لە ڕادەبەدەری Over Control نایاساییانە و پاوەنکردنی هەموو سەرچاوەکانی داهات بۆ چینێکی دیاریکراوی ناو دەستەبژێری باڵادەستی سیاسی و حیزبی و نەبوونی حوکمی ڕەشید و پشتکردنە پێوەری لێوەشاوەیی و دڵسۆزیی و تواناداریی و ئەزموون و شایستە بوونی یاسایی و گۆڕینی بە گوێڕایەڵیی کوێرانە بۆ ئۆرگانە حیزبییەکان و ملکەچبوون بۆ کەسانی دەستڕۆیشتووی ئەم ئۆرگانانە، لەگەڵ نەبوونی ڕوانگە و ڕوانین بۆ دامەزراندنی دەوڵەتی یاسا و دەوڵەتی هاونیشتیمانی و نەبوونی پلانی کورتخایەن و مامناوەند و درێژخایەنی ئابووری و ئاوەدانیی و پەروەردەیی و زانستیی و نەبوونی پەیمانگای پێگەیاندنی دەستی کاری پیشەیی و بڵاوبوونەوەی بێکاریی لەناو گەنجان و هەستکردنی قوڵیان بە نادادیی و بە نەبوونی هەلی کار کە بەرێزەوە ژیان و گوزەران و داهاتوویان بۆ دابین بکات، هەموو ئەمانە هەردەم گەنجان وا لێدەکات هەست بە دابڕاویی بکەن، خۆیان بە بەشێک لە سیستمی بەڕێوەبردن نەزانن و ئینتیمایان بۆ نیشتیمانیش بەتەواوەتی کاڵ بێتەوە. ئەم هۆکارانە و لەسەرووی هەموویانەوە بێداریی و بێکاریی و خراپی باری ئابووریی و گوزەرانی بەش مەینەتیانە، هەردەم گەنج هان دەدات بیر لە کۆچکردن بکاتەوە، خۆی بخاتە ناو مەترسی گیران و نقوم بوون و خنکان و پەرتەوازەیی، بەو ئومێدەی بتوانێت وەک ئەو گەنجانەی پێش ئەمان خۆیان گەیاندووەتە ڕۆژئاوا، ئەمانیش بتوانن بگەنە

ئەویێ و بتوانن باری ژیانی خۆیان و خێزانەکانیان باش بکەن و دنیا ببینن و بەدڵی خۆیان گەشت بکەن.

ئەم حاڵەتە لەلای توێژەرانی بواری کۆمەڵناسیی بە لە دەستدانی کۆنترۆل (Under Control) ناسراوە، چونکە خێزانەکان، توانای ئاڕاستەکردنی منداڵەکانیان نامێنێت، ناتوانن ڕێگرییان لێ بکەن لەوەی خۆیان نەدەنە دەست ڕێگای هات و نەهاتی سەفەرکردن بە ڕێگای قاچاغی نێوان چەند وڵاتێک، چونکە خێزانەکان هیچ بەدیلێکیان پێ نییە بیخەنە بەردەم گەنجەکان بۆئەوەی لە نیشتیمان بمێننەوە و کۆچ نەکەن. ئەوەی دەبێت بەم ئەرکە هەستێت دەوڵەتە؛ سیستمی فەرمانڕوایە، ئەو لە توانایدایە لە ڕێگەی کەمکردنەوەی خۆویستی و بەرژەوەندیپەرستیی لە ڕادەبەدەر و بەگژداچوونەوەی گەندەڵی و دەستەبەرکردنی لانی کەمی دادپەروەریی کۆمەڵایەتی، هەلی کاری جۆراوجۆر بۆ گەنجان دابین بکات، تواناداریان بکات لەڕووی ئابووریی و دەروونییەوە بۆئەوەی هەست بە بوونی خۆیان بکەن، هەست بکەن نیشتمانێکیان هەیە خەمیان لێ دەخوات، دەتوانن ژیانی خێزانی پێکبهێنن و خەمی شوێنی نیشتەجێ و دابینکردنی بژێویی ڕۆژانەیان نەبێت، خەمی نەبوونی خزمەتگوزاری تەندروستیی و پەروەدەییان نەبێت بۆ خۆیان و خێزانەکانیان، بەمەش هەستی ئینتیما دەگەشێتەوە و جێهێشتنی نیشتیمان و سەرگەردانیی و گەڕان بە دوای ژیانێکی باشتردا لە غەریبی، کۆتایی دێت.

## سەرچاوەکان:

١-أطلس dtv الفلسفه مع ١١٥ لوحه بيانيه ملونة، بيتر كونزمان، فرانز بيتر بوركارد، فرانز فيدمان، اللوحات الملونة من اعداد أكسل فايس، ت:د.جورج كتوره، المكتبه الشرقية، بيروت-لبنان، ٢٠٠١.

٢-الاغتراب، تأليف ريتشارد شاخت، ت: كامل يوسف حسين، المؤسسة العربية للدراسات والنشر، بيرو، ط ١،١٩٨٠.

٣-المجتمع العربى فى القرن العشرن، بحث فى تغيير الاحوال والعلاقات، د.حليم بركات، مركز دراسات الوحدة العربية، بيروت ـ لبنان، ط١، ٢٠٠٠.

٤-موسوعه علم الإنسان – المفاهيم والمصطلحات الانثروبولوجية، شارلوت سيمور – سميث، ت: مجموعه أساتذة علم الاجتماع بإشراف محمود الجوهرى، المجلس الاعلى للثقافة، دمشق، ١٩٩٨.



د. ئیدریس کاریتانی

# کاریگەریی و لێکەوتە جیاوازەکانی ژیانی هاوچەرخ لەسەر گەنجان، دەرفەتێکی زێڕین بۆ گەنجی بەهرەدار

**دونیای هاوچەرخ پانتاییەکی زۆر بەرفراوان و گشتگیرە، ڕەهەندی زۆرە و ڕەهەندەکان هەموو بەشێکی ژیانی مرۆڤی گرتووەتەوە. لەناو ئەو مرۆڤانەدا، بێگومان گەنج یەکێکە لە کارەکتەرە هەرە گرنگەکانی ناو ئەم شەپۆلە. دونیای هاوچەرخ خاڵی ئەرێنی و نەرێنی هەیە، گەنج چۆن بتوانێت لە هەنگاوە ئەرێنییەکان سوودمەند بێت و لە هەنگاوە نەرێنییەکان خۆی بپارێزێت.**

بابەتی ئێمە ئاڕاستەکردنی گەنجە بۆ سودوەرگرتن لە دونیای هاوچەرخ، گەنج خۆی پێ بەهرەمەند بکات و ئاڕاستەی ژیانی خۆی پێ بگۆڕێت، ئاڕاستەی ڕۆشنبیریی و فیکریی و کەلتووریی و بابەتەکانی تری خۆی پێ بگۆڕێت. گەنج چۆن دەتوانێت دەرفەت لەو خاڵە ئەرێنییەی ژیانی هاوچەرخ وەربگرێت؟

بەکارهێنان و هەنگاونان دونیای هاوچەرخ لە نێوان ڕۆژهەڵاتی ناوەڕاست و جیهانی ئیسلامیدا زۆر جیاوازە لەگەڵ ئەورووپا و ئەمەریکا. ئەوانەی کە ئێستا سوود لە جیهانگیری وەردەگرن و سوودمەندن بۆ خۆیان و بۆ دەوروبەریان، لە جیهانی ئەوروپی و ئەمەریکین، ڕێژەی سودوەرگرتن دەیان هێندە لە ئێمە زیاترە. بۆ نموونە (٨٤٪)ی جیهانی ئەمەریکی و ئەوروپی سوود لە بواری تەکنەلۆژیی و بواری جیهانگیری وەردەگرن، لەوێشەوە داهێنان دەکەن. (٩٠٪)ی داهێنەرەکان لە داهێنانی پزیشکی و پیشەسازیی و کشتوکاڵ و بابەتەکانی دیکە؛ لە ئەوروپا و ئەمەریکادان(١)، کەواتە دونیای هاوچەرخ بووەتە دەرگایەکی گەورە تاوەکوو گەنجانی ئەوروپی و ئەمەریکی و وڵاتانی ڕۆژئاوا بەگشتی داهێنان بکەن و گەشە بە تەکنەلۆژیا و بەتەواوی سێکتەرەکانی ژیان بدەن. بەڵام لە ڕۆژهەڵاتی ناوەڕاست ورد بەرەوە، ڕێژەی (٣٠٪) یان کەمتری گەنجانمان توانای داهێنانیان هەیە(٢). بۆیە دەبینیت ڕۆژهەڵاتی ناوەڕاست گەنجەکانی لە ڕۆژئاوا زۆرترن، بەڵام بێ داهێنان و بێ بەرهەمن، بێ هەنگاوی داهێنان و نوێکارین. هەربۆیە ئێستا ژیان و تەکنەلۆژیا و داهێنانی ئەوروپیەکان، تا دەگاتە تەنانەت پۆشاک و فڕین و بەشەکانی تر، هەمووی لە ئەوروپاوە گەشە دەکات بەشی زۆری گەنجان.

کارەساتەکە لێرەدا ئەوەیە گەنجان لە جیهانی ئیسلامی و ڕۆژهەڵاتی ناوەڕاستدا بونەتە بەکاربەر، ئەوەی بۆمان دەرکەوتووە ئەوەیە گەنجان لە ڕۆژهەڵاتی ناوەڕاستدا نەیانتوانیوە وەکوو پێویست سوود لە دونیای هاوچەرخ وەربگرن.

## دەرفەتەکانی دونیای هاوچەرخ بۆ گەنج بەبێ جیاوازی

دونیای هاوچەرخ توانیویەتی ئاسانکاریی زۆر گەورە بکات، گەنج دەتوانێت سوودی لێ ببینیت، وەکوو ئەوەی کە ڕۆژئاوا و ئەمەریکا سوودیان لێ بینیوە.

### یەکەم: دەرفەتی گەیاندن

هەموو هۆکار و ئامرازێکی گەیاندن و نەقڵی بۆ فەراهەم کردوویت، بێگومان ئەوە بەرهەمی دونیای هاوچەرخە، بەئاسانی فڕۆکە بەکاردەهێنیت و بەرەو ئەمەریکا و چین و ژاپۆن و ئەڵمانیا و پێشکەوتووترین وڵاتانی پزیشکی و تەکنەلۆژی دەڕۆیت. گەنج دەبێت بزانێت جیهانگیری ژیانی بۆ ئەویش فەراهەم کردووە وەک چۆن ژیانی بۆ گەنجێکی ئەوروپی بەردەست و ئاسان کردووە.

**دووەم: دەرفەتی بازرگانی**

ئازادییەکی گەورەی بازرگانی بۆ هێناویەتە بەردەست و گەنج بەئاسانی دەتوانێت بازرگانی بکات لە ڕێگەی تەکنەلۆژیاکانی سەردەمەوە، چونکە بازرگانیکردن بەشێکی گەورەی داهێنان و پێشکەوتن و شارستانێتی سەردەمە. ئەی گەنج، ورد بەرەوە، چەندان ڕێکخراوی گەورەی بازرگانی لە جیهاندا کراونەتەوە و تۆش دەتوانیت تێیاندا بەشداری بکەیت و لەو دامەزراوە بازرگانییانەدا کار بکەیت و وەک دەبینین بازرگانی بەهۆی جیهانگیرییەوە زۆر ئاسان بووە.

**سێیەم: دەرفەتی تەکنەلۆژیا و جیهانی ئەلکترۆنی**

ئامێرە ئەلیکترۆنییەکان گەورەترین دەرفەتیان بۆ مرۆڤایەتی لە هەموو بوارەکاندا ڕەخساندووە، داهێنان و پێشکەوتنی بۆ گەنجان فەراهەم کردووە، زەمەنی بۆ بەرەکەتدار کردووە، تەمەنی مرۆڤی لەڕووی بەرهەمەوە درێژ کردووە. جاران لە ڕۆژێکدا بەرهەمت چەند بووبێت، ئێستا بەهۆکاری ئامێرە ئەلکترۆنییەکان سەد هێندە بووەتەوە. پێموایە مرۆڤ لەوەتەی هەیە، نەگەیشتووەتە ئەم ئاستە پێشکەوتن و جیهانە خێراییە. ئینتەرنێت و تەکنەلۆژیای سەردەم دەرفەتێکی گەورەی بۆ هەموو گەنجەکان ڕەخساندووە، تاکوو لە هەموو جیهاندا تۆی گەنج بتوانیت ڕۆشنبیریی وڵاتانی ئەوروپا و ئەمەریکا و ئاسیا و ئەفەریقا و کیشوەرەکانی دنیا بە چەند کلیکێک بگاتە دەستت. کەواتە تۆی گەنج لە بازنەیەکی لۆکاڵی هاتوویتەتە دەرەوە و چوویتەتە بازنەیەکی گەورەی جیهانییەوە، ئێستا ڕۆشنبیرییەکەت و بیرکردنەوەکەت و لێزانییەکانت و هەنگاوەکانت و زانستەکەت هەمووی بووەتە زانست و، ڕۆشنبیری و کەسێکی جیهانی. جیهانگیری ئەو دەرفەتەی بۆ گەنج ڕەخساندووە تاوەکوو بتوانی کەسێکی جیهانگیر بیت لە عەقڵ و حیکمەت و دانایی و زانست و فیکر و ڕۆشنبیری هەتا دەگاتە ژیار.

**چوارەم: ڕاگەیاندن**

هەموو تاکێک لە دونیای هاوچەرخ بووەتە خاوەنی کەناڵێکی سەربەخۆ، گوزارشت لە بۆچوون و خولیای خۆی بکات و خۆی بە جیهان بناسێنێت و سوود لە جیهان وەربگرێت، هەروەک سوود بە هەموو جیهانیش بگەیەنێت. ئاسانکاریی کردووە و هۆکارەکانی ڕاگەیاندنی خستووەتە بەردەستت. گەنج دەتوانێت بە هۆکارەکانی پەیوەندیی جۆراوجۆری وەک وەتسئەپ و تێلیگرام و سکایپ... هتد، لەگەڵ دەرەوە و کەناڵە جیهانییەکان و کەسایەتی و داهێنان و توانای خۆت بە جیهان بگەیەنیت. بۆ نموونە داهێنانی گەنجێک لە بواری ماتماتیک یان کیمیا یان فیزیا، یان لە بواری پزیشکی، یان لە

بواری ئایینی یان لە بوارەکانی تردا کردووە؛ بەجیهانی بگەیەنیت.

بڕوانە، دەبینیت لە گوندێک گەنجێک پەیدا بووە فڕۆکەیەک دروست دەکات، دەستبەجێ بەئاسانی بەجیهانی دەکات و هەموو جیهان دەزانێت ئەو کەسە خاوەنی فڕۆکەیەکە و بۆخۆی داهێنانی تێدا کردووە.

**پێنجەم:** نووسین و ڕۆژنامەوانی، ئەمڕۆ نووسین و کاری ڕۆژنامەوانی و ڕاگەیاندن بووەتە یەکێک لە بوارە هەرە گرنگەکانی ژیانی مرۆڤ، زۆرترین کەس توانای خۆی لێرەوە پێشکەش بە جیهان دەکات. پەیج و ئەکاونت بەهۆکاری جیهانگیری گەنجی کردووەتە خاوەنی ڕاگەیاندنێکی سەربەخۆ و فەزایەکی گەورە، واتە هەموو گەنجێک ڕاگەیاندنێکی جیهانیی هەیە نەک لۆکالی. جاران دەوڵەتێک ئەگەر کەناڵێکی لۆکاڵی هەبووبێت، بەڵام ئێستا هەموو تاکێک کەناڵێکی ئاسمانی لەماڵەکەی خۆیدا هەیە و پەنجەی پێدا دەنێت و عەقڵ و ژیریی خۆی و توانای خۆی و نووسینی خۆی بە جیهاندا بڵاودەکاتەوە.

**شەشەم:** گەشەی بواری هونەری، بابەتی هونەر لەو بابەتە سایکۆلۆژییە جوان و دەروونناسانەی مرۆڤە کە بەهۆیەوە چێژ دەبینێت و ئارامە. گۆرانی و مۆسیقا و وێنەکێشان و سینەما و بواری دیکە، گەنج دەتوانێت لەم بوارانەدا داهێنانی گەورە بکات بۆ ئایین و نیشتمان و گەل و مرۆڤایەتی، ئامراز و تەکنەلۆژیا و ئامێری سەردەمی بەهۆکاری دونیای هاوچەرخ بۆ فەراهەم کراوە و تێیدا بەهرەمەند و سوودمەند دەبێت.

**حەوتەم:** فەراهەمکردنی فێربوونی زمان، زمان هۆکاری تێگەیشتن و بەیەکگەیشتنی گەلانە، هۆکاری گۆڕینەوەی ڕۆشنبیریی و فیکر و فەلسەفە و زانستی نێوان مرۆڤەکانە. کەناڵە جیاوازەکانی سۆشیالمیدیا و تەکنەلۆژیای سەردەم کە بەرهەمی جیهانگیرییە، هەموو ماڵێکی کردووەتە قوتابخانە و زانکۆ، تا بەئاسانی ئەوەی بتەوێت بە تێچوویەکی زۆر کەم و بە کاتێکی دیاریکراو فێری ببیت. جاران فێربوونی زمان ئاستەنگی زۆری لەپێش بوو، ئێستا دونیای هاوچەرخ ئاستەنگەکانی لا داوە و هەموو ماڵێکی کردووەتە قوتابخانەی فێربوونی زمان. بەهۆی فێربوونی زمانەوە، هەر جۆرە پەیامێکی ئایینی و ئەخلاقی و پەروەردەیی و پەیامی فێرکردن و پەیامی هزر و کولتوور، هەتا دەگاتە ئەوەی دەتوانیت دیدار و گفتوگۆ لەگەڵ دنیادا بکەیت.

**هەشتەم:** خاوەنی کۆمپانیا، کاتێک ناوی کۆمپانیا دەهێنین، پانتاییەکی جوگرافی و دارایی و بازرگانییەکی گەورەمان دێتە پێش چاو، بەڵام ئێستا بەهۆکاری تەکنەلۆژیای سەردەم، گەنجان دەتوانن ببن بە خاوەنی کۆمپانیا. کارخانەگەلێکی ئاسیایی چوونەتە ئەمەریکا و کۆمپانیای ئەمەریکی لە ڕۆژهەڵاتی ناوەڕاست و کارخانە و دامەزراوە

گەلێکی ڕۆژهەڵاتی ناوەڕاستیش لە ئەورووپادا کار دەکەن.

ئەم ئاڵوگۆڕانە لە وڵاتێکی گەشەسەندوو بۆ وڵاتێکی دواکەوتوو زۆر زۆر گرنگی پێ دراوە، بۆیە دەبینین لە وڵاتی ئێمە و بەشێک لە وڵاتەکان تەکنەلۆژیای بەهێز و ئەندازەیی و بواری فیکریی بەهێز فەراهەم هاتوون، لەبەرئەوەیە جیهانگیری دەرگایەکی فراوانی بۆ گەنج کردووەتەوە، تا لە ڕێگەی کۆمپانیاکانەوە بتوانێت داهێنانی بکەیت، یان لەگەڵ ئەواندا فێری داهێنان ببیت.

**نۆیەم:** دەرگای زانکۆکانی جیهان بۆ گەنج کراونەتەوە، یەکێک لە خاڵەکانی تر کە دونیای هاوچەرخ بۆ گەنجی فەراهەم کردووە، کردنەوەی هەزاران زانکۆ و کۆلێژی بیانییە لە جیهانی ئیسلامیدا، هەموو وڵاتان زانکۆی ئەمەریکی و فەڕەنسی و وڵاتەکانی تری تێدایە. دەچیتە ناو زانکۆیەکی تری جگە لە جیهانی خۆت، ڕۆشنبیریی و فیکر و کولتوور و بیرکردنەوە و تەکنەلۆژیا و شوناس و ژینگەی ئەو وڵاتەت لەوێ بۆ دەردەکەوێت.

## خاڵە ئەرێنییەکانی دونیای هاچەرخ و جیهانگیری

خاڵە ئەرێنییەکانی دونیای هاوچەرخ ئەستەمە بەئاسانی دیاری بکرێت، بەڵام بەکورتی چەند خاڵێکی ئەرێنی بۆ گەنجان دیاری دەکەین:

یەکەم: کردنەوەی دەرگای زانیاری بەڕووی جیهاندا، دونیای هاوچەرخ دەرگای شۆڕشی زانیاریی لەبەردەم مرۆڤەکاندا کردووەتەوە و بەهۆیەوە توانیویەتی بەشدار بێت لە پێشخستن و گەشەسەندنیدا، هەموو گەنجێک بواری بۆ ڕەخساوە تا لەم ڕەوڕەوەی تەکنەلۆژیایە بەشدار بێت و لە هەمان کاتدا خۆی تێدا بەهرەمەند بکات.

دووەم: فەراهەمکردنی ژیانی ئیسراحەت، تەکنەلۆژیا ئامێر و پێداویستییەکانی ژیان و هۆکارەکانی گەیاندنی بۆ گەنج فەراهەم کردووە لە هەموو بەشەکانی ژیان بە بیستراو و بینراوەوە، تا وای لێ هاتووە هەمووی بە کلیک و کۆنترۆڵ و دەستلێدانێکی ئۆتۆماتیکی تەواوی کارەکان بەڕێوە ببات. لە ماڵەکەی خۆیدا دانیشتووە لەگەڵ جیهان دەدوێت. ئەمانە ژیانی ڕەفاهیەت و خۆشگوزەرانین کە فەراهەم کراون، خزمەتن بۆ گەنج و توێژەکانی تر کە هەمووی بەرهەمی دونیای هاوچەرخە.

سێیەم: زیادبوونی پانتایی ڕۆشنبیری، کەسی ڕۆشنبیر چەندە بزانێت و زانیاری فراوان و گشتگیر بێت، ئەوەندە سوود بەخشترە بۆ کۆمەڵگەکەی. جاران بەهۆی نەبوونی جیهانگیری و بوونی دنیای لۆکاڵی زانیارییەکان کرچوکاڵ و لۆکاڵی بوون، لە بوارێک لە بوارەکاندا بوون، ئێستا گەنج لە ڕێی جیهانگیرییەوە دەتوانێت ڕۆشنبیری لە زۆربەی

زانستەکانی ژیان وەک ژینگە و پزیشکی و کولتووری و... تاد فێر ببێت و دەستی بکەوێت.

چوارەم: فەراهەمکردنی مافی مرۆڤ و ئازادیی تاک(٣)، ماف بەردەوام داوا دەکرێت، نادرێت. بە درێژایی مێژوو ستەمکارەکان ویستوویانە ستەم لە خەڵک بکەن و ماف و ئازادییەکان بەرتەسک بکەنەوە و زەوتیان بکەن، ئینجا بیشارنەوە و نەهێڵن کەس ئاگاداری ئەم ستەم و قۆرخکارییە بێت. گەنجێکی بێ دەرامەت و بێکەس جاران نەیدەتوانی دەنگی هەڵبڕێت و ئەو ستەمەی لێی دەکرێت بە جیهان بگەیەنێت، ئێستا بە هۆی دونیای هاوچەرخ و سۆشیالمیدیا هەموو تاکێک هاواری دەگەیەنێتە جیهان، هەربۆیە ئێستا ئەگەر گەنج بتوانێت داوای ماف و ئازادییەکان بکات، ئاسانتر وەردەگیرێت.

لە سەرەتای ئەم تەوەرەماندا باسی لایەنی کەڵک و ئەرێنی و جوانییەکانی جیهانگیریمان کرد، بێگومان خۆ هەر باسکردنەکەی ئێمە بابەتەکە نابڕێنێتەوە، بەڵکوو لایەنی گرنگتر ئەوەیە پێویستە تۆی گەنج دەرفەت بڕەخسێنیت هەموو ئەو ئەرێنی و چاکییانە بۆ خۆت بقۆزیتەوە و لە ژیانی خۆتدا گەشەی پێ بدەیت، بۆئەوەی جێپەنجەت لە ژیاندا دیار بێت.

## خاڵە نەرێنی و خراپەکانی دونیای هاوچەرخ

دونیای هاوچەرخ بەم پانتایی و فراوانی و هەمەلایەنییەی خۆی بێگومان ناتوانرێت سنووردار بکرێت لەلایەنە نەرێنی و خراپەکانی، بەڵام بەپێی توانا بەشێک لەم خاڵە پەیوەندیدارانەی کە بە گەنجەوە پەیوەستن، دەخەینە ڕوو.

یەکەم: نەبوونی هیچ پێشینە و خۆئامادەکردنێک لە دونیای هاوچەرخ، دونیای هاوچەرخ دەرگای بەسەر گەنجدا کردووەتەوە، ئامادەکارییەکی ئەوتۆ نەکراوە لەلایەن گەنجان بەبێ ڕاهێنان و خۆتەیارکردن و بەبێ زانیاریی پێشینە و بەبێ خول و خۆسازکردن، دەمودەست لەگەڵ دونیای هاوچەرخ ئامێزمان بەیەکدا کردووە، بۆیە تەماشا دەکەین زۆر شوێنەواری نەرێنیی بەجێهێشتووە.

دووەم: دروستکردنی بۆشایی و لێکترازانی خێزان، لەناو توێژەکانی خەڵکدا بۆشایی زۆری دروست کردووە، ئێستا گەنج لە جیهانی تایبەتدا و لەناو دنیای بەتەمەنەکانیش لەلایەکی دیکە دەژین و لە یەک جیابوونەتەوە. جاران تێکەڵییەک هەبوو، هاوبەشییەک هەبوو، پێکەوەیی و هاوکارییەک لە نێوانیاندا هەبوو، لە نێوان گەنج و پیر و پیاو و ئافرەت و هەموو پێکهاتەکاندا، بەڵام ئێستا هەمووانی لەیەک ترازاندووە و لێکیدابڕیون.

سێیەم: زیادبوونی دیاردەی چاولێکەری، خاڵێکی دیکەی نەرێنی ئەوەیە کە بەڕاستی لەلای گەنجان چاولێکەری زۆر بووە، بۆ نموونە ئەگەر بەگشتی تەماشای سۆشیالمیدیا بکەین، ئەوەندەی خەڵک سەرقاڵی چاولێکەرییە، خەریکی داهێنان نییە، بەپێچەوانەی

ئەوروپا و وڵاتانی پێشکەوتووەوە کە ڕۆژبەڕۆژ لە پێشبڕکێی داهێنان و نوێکاریدان. بۆ نموونە لە ژاپۆن لە بواری ئامێرەکان و مۆبایلدا داهێنانی هەیە، لەوەوە کێبڕکێ دەکات، بەڵام لە وڵاتی ئێمەدا بە گەورە و بچووکەوە، تەنانەت نوخبەکەش سەرقاڵ و خەریکە بە چاولێکەرییەوە.

چوارەم: بەهای مرۆڤەکان لە مەترسیدایە، لە دونیای هاوچەرخ، پرەنسیپ و بەهای مرۆڤایەتی لە بەردەم هەڕەشەیەکی ترسناکدایە. بە کەمترین ماوە زۆرترین بەهای خەڵک لەدەست دەدەین، یان درۆ و بێبەڵێنی، هەموو جۆرەکانی تری شکستی بەها، یان شکستی پرەنسیپ. لێدان لە کەسێتی تاکەکان بەهۆکاری دروستکردنی سیناریۆ لە ڕێگەی سۆشیالمیدیا، لە ڕێگەی بڵاوکردنەوە و دروستکردنی وێنەیەک بێت، یان هەڵەیەکی سادە کە هەموو مرۆڤێک تووشی دەبێت، هەربۆیە هیچ کەسێک لە ئەماندا نییە.

پێنجەم: بردنی خێروبێری وڵاتان، بەهۆی دونیای هاوچەرخ و جیهانگیری سامان و خێروبێری هەموو دنیا لەلایەن وڵاتانی ئەوروپی و ئەمەریکاوە ئیستیغلال کراوە. بۆ نموونە جیهانی ئیسلامی لە ٦٣٪ سامانی نەوت و کانزاکان و بابەتەکانی تری ژێر زەویی دنیا پێکدەهێنێت، هەموو ئەو خێروبێرە دەوڵەتانی گەشەسەندوو و پێشکەوتوو و دەوڵەمەندانی سەردەم دەیانبات، چونکە ئەوان ئەزموون و خاوەنداریێتیی دونیای هاوچەرخ دەکەن، دەزانن چۆن ماڵ و سامان و خێری وڵاتان بۆ خۆیان کۆبکەنەوە. کەمترین سەروەت و سامان لە وڵاتانی ئەوانە و زۆرترینیان لەلای ئێمەیە، کەچی ئەوان لە خۆشگوزەرانی و ئێمەش لە قاتوقڕی.

شەشەم: بۆشایی ئابووریی و کۆمەڵایەتی لە نێوان تاکەکانی کۆمەڵگە، جیهان بە ئەندازەی ئێستا سەرمایەدار و دەوڵەمەندی بەخۆیەوە نەبینیوە، لە ئەنجامدا چینی جیاواز و چینایەتیی دروست کردووە، بۆشاییەکی کۆمەڵایەتی و ئابووریی زۆر گەورەی لە نێوان تاکەکاندا دروست کردووە. بۆ نموونە بەشێکی سیستمی دنیای جیهانگیری وایکردووە بەشێک لە خەڵک زۆر زۆر دەوڵەمەند ببن و بەشێکی دیکەی زۆر زۆر نەدار و هەژار بن، بە ئەندازەی ئەوەی لە برساندا بمرن، وەک ئەوەی لە سۆماڵ و هەندێک وڵاتی ئەفەریقی هەیە. لێرەدا پانتاییەکی گەورە و ترازانێکی گەورەی دروست کردووە، تاوەکوو هەژار و دەوڵەمەند بەتەواوی لە یەک بترازێن، هەم لەڕووی ئابوورییەوە و هەم لەڕووی کۆمەڵایەتییەوە.

حەوتەم: زاڵبوونی کولتووری ڕۆژئاوا بەسەر جیهانی گەنجاندا، دونیای هاوچەرخ وڵاتە زلهێزەکان بەڕێوەی دەبەن، لەم ڕووەوە توانیویانە کولتوور و ڕۆشنبیریی ئەمەریکا

و ئەوروپا لە زۆربەی جومگەکانی ژیان بەسەر کولتوور و ڕۆشنبیریی جیهانی ئیسلامیدا زاڵ بکەن و بڵاوی بکەنەوە. هەنووکە گەنجی ڕۆژهەڵات تایبەتمەندی و ناوازەییەکی خۆی نەماوە، هەرچی شک دەبات و هەیەتی چاولێکەریی ئەوروپایە، تەنانەت جل و پۆشاکەکەشی هەروەکوو ئەوروپا لەبەر دەکات.

هەشتەم: ململانی و دژایەتیکردن و پێکدادانی شارستانیەتەکان، هەردوو تیۆری هندکتۆن و فۆکۆیاما لە دنیای هاوچەرخدا لەبارەی شارستانیەتەوە ئێستا پەیڕەو دەکرێن، دەیانەوێت تیۆری «صراع الحضارات، نهایه التاریخ» لە ڕێگەی جیهانگیرییەوە بەسەر جیهاندا بسەپێنن، شارستانیەتەکان پێکدا بدەن، یان شارستانیەتی خۆیان بەسەر تەواوی شارستانیەتی دنیادا بسەپێنن و ئەوانی تر بەتەواوی بسڕنەوە. ئێمە وەک مسوڵمان بڕوامان بە ناوەندی شارستانیەت هەیە (المنتدى الحضارات)، واتە هەموو شارستانیەتەکان پێکەوە کۆبکرێنەوە و خزمەتی مرۆڤایەتی پێ بکرێت بەگشتی. مسوڵمانان لە سەردەمی زێڕینی خۆیاندا توانییان شارستانیەتی ئیسلامی و هیند و چین و ڕۆما و فارس پێکەوە کۆبکەنەوە و خزمەتی جیهانی پێ بکەن، دان بە خاڵە ئەرێنییەکاندا بنێن و لە خاڵە نەرێنییەکان دووربکەونەوە، کەچی شارستانیەتی ڕۆژئاوا داوای پێکدادان و یەکتر سڕینەوە دەکات.

**دابڕان لە جیهانی کۆمەڵایەتی و خەریکبوون بە ژیانی تاك، کولتوور و ژیانی ئایینەکانی تر و وڵاتانی ئەوروپایە، بەپێچەوانەوە ئیسلام ئایینی گشتی و دەستەجەمعییە.**

پێکدادانی شارستانیەت واتە شارستانیەتەکان بەسەر یەکتریدا زاڵ ببن و لەکۆتاییدا نابێتە خزمەتکردنی مرۆڤەکان، بەپێچەوانەوە مرۆڤایەتی تووشی هەزاران قەیران و گرفت دەکات و بێگومان کردووشیەتی. هۆکاریش هەر لەوەوە سەرچاوە دەگرێت کە ئەوان باوەڕیان بە پێکدادانی شارستانیەتەکان هەیە و ئێمەش باوەڕمان بە پێکەوەهەڵکردن و هەماهەنگیی شارستانیەتەکان هەیە.

نۆیەم: لێکدابڕان و گۆشەگیریی تاکەکان، دونیای هاوچەرخ و جیهانگیری لەلایەکەوە هەموو جیهانی کردووەتە دێیەک، لەلایەکی ترەوە بەهۆی هەندێک ئامێری سۆشیالمیدیاوە تاکەکانی لێکجیاکردووەتەوە، هەر تاکێک خەریکی ژیانی تایبەتیی خۆیەتی و خەمی تاکەکانی تری نییە، تاڕادەی نامۆیی.

دابڕان لە جیهانی کۆمەڵایەتی و خەریکبوون بە ژیانی تاک، کولتوور و ژیانی ئایینەکانی تر و وڵاتانی ئەوروپایە، بەپێچەوانەوە ئیسلام ئایینی گشتی و دەستەجەمعییە، دوور لە هەموو نامۆیی و گۆشەگیریی و تەنهاییەک. ئەم نامۆیی و بەتەنها ژیانە دەیان گرفتی دروست کردووە، بۆ نموونە زۆربەی تاکەکانی ئەمڕۆ تووشی دەیان نەخۆشی دەروونی بوون، هۆکاریش ئەوەیە بەتەنیا دەژین و ژیرییان لەگەڵ ئامێرێکدا هەڵسوکەوت دەکات کە کۆمەڵێک زانیاریی و ڕۆشنبیری و فیکر و پرەنسیپ و خووڕەوشتی بۆ دەگوازێتەوە کە لەگەڵ ئەودا جیاواز بێت. کەواتە ئەو گەنجە بەردەوام لەگەڵ پێکدادان و دژایەتیی خۆیدا دەژی، لەگەڵ ململانێیەکدا دەژی کە بەردەوامە و درێژەی هەیە، بۆیە لەکۆتاییدا دەکەوێتە ناو دڵتەنگییەوە. ئەوەتا ڕۆژانە دەبینیت ئەو دکتۆرانەی پسپۆڕیی و کاریان لایەنی دەروونییە، بەر ناکەون و نۆبەیەکی زۆر سەردانیکەریان وەستاوە.

دەیەم: تێکەڵکرنی تایبەتمەندی و شوناس، سروشتی ئایین و میللەتان وایە بۆ هەر ئایین و میللەتێک تایبەتمەندی و جیاکاریی خۆیان هەیە لە عادات و تەقالید و کولتوور و سروشتی ژیان، بەڵام دونیای هاوچەرخ لەسەر ئەوە ڕانەوەستاوە، شوناس و تایبەتمەندیی نێوان میللەتانی تێکەڵ کردووە. دامەزراوەی پرەنسیپ باسێکە و گرنگیی خۆی هەیە و دەبێت لەبەرچاو بگیرێت، هەموو میللەتێک دامەزراوەیەکی پرەنسیپ و بەها و خووڕەوشتی هەیە، دامەزراوەیەکی بەها و بایەخی کۆمەڵایەتی هەیە، دامەزراوەیەکی بەهای فیکری و کولتووریی هەیە، ئێستا دامەزراوەکان تێکچوون، سنوور لەڕووی خووڕەوشت و پرەنسیپ و فیکر و کولتوور و شوناس نەماوە و تێکەڵی کردوون. دونیای هاوچەرخ ئاوای لە جیهان کردووە هەمووی بەتێکەڵی بهێڵێتەوە، هیچ میللەتێک و هیچ تاکێک و هیچ خێزانێک نەتوانێت کەسایەتی و تایبەتمەندیی خۆی و شوناسی خۆی بپارێزێت کە ئەمە زۆر زۆر ترسناکە.

یازدەیەم: گۆڕینی دامەزراوەی کۆمەڵایەتی، دامەزراوەی کۆمەڵایەتی لە ژن و ژنخوازی، لە ژن و مێرد و لە بابەتی پێکهێنانی خێزان و لە هەنگاوەکانی بوونی خێزان پێکهاتووە، پرسە و داخوازی و تەواوکارییەکانی دیکەی، ئەوانەی هەموو شێواندووە و شڵەژاندوونی، بۆیە دەبینیت ڕێژەی تەڵاق و لە یەک دابڕان و هەڵوەشانەوەی خێزان

زۆره. ئەوە ئاڵۆزییەکی زۆری خستووەتە ناو ژینگەی مرۆڤەکانەوە. گەنجی شیواندووە، لەبەرانبەر تێکدانی خێزان و گۆڕینی شیرازەی کۆمەڵایەتی، هاوڕەگەزبازیی کردووەتە جێگرەوەی. هەوڵی ڕازیکردنی جیهان دەدات تا لەبریی خێزان، هاوڕەگەزبازی برەو پێ بدات. هەربۆیە لەڕووی یاساییەوە لە دەیان وڵات بەفەرمی یاسای بۆ دەرکراوە و بە کارێکی ئاساییان داناوە.

دوازدەیەم: ڕەشکردنەوەی گەلان، خاڵێکی دیکە کە زۆر نەرێنییە، بریتییە لە ڕەشکردنەوەی گەلان. جیهانگیری خەریکە گەلان بەتەواوی ڕەش دەکاتەوە، بۆ نموونە ئێستا خەڵک پێیوایە هەموو دنیا ئەمەریکا و ئینگلیزن، چونکە ئەوان زیاتر بەسەر جیهاندا باڵادەستن. دەیان گەل و میللەتی تر لە دنیادا هەن کە هەر ناویان هەیە و بوون و هێزیان نییە، بۆ ئەوەش دیسان هەر جیهانگیری وایکردووە.

**مسوڵمانان لە سەردەمی زێڕینی خۆیاندا توانییان شارستانیەتی ئیسلامی و هیند و چین و ڕۆما و فارس پێکەوە کۆبکەنەوە و خزمەتی جیهانی پێ بکەن.**

سیازدەیەم: بۆشایی نێوان چین و توێژەکانی کۆمەڵگە، بۆشایی و نێوانێکی زۆر گەورەی لە نێوان چین و توێژەکانی کۆمەڵگە دروست کردووە، بۆ نموونە کۆمەڵگە بەسەر چەند چینێکدا دابەش بووە، چینێک هەیە هەژارە و چینێک هەیە ناوەڕاستە و چینێک دەوڵەمەندە، ئەم چەند چینەی کە لە هەموو کۆمەڵگەیەکدا هەن، چینێکی زۆر هەژار و نەداری دروستکردووە، چینێکیشی هەڵکشاندووە و بردوویەتە سەری سەرەوە. ئەمەش دیسان ڕێسای بەندایەتی دروست دەکاتەوە، واتە خەڵک بەرەو کۆیلەبوون دەڕوات، لە کاتێکدا ئیسلام دەیان هەنگاوی گرنکی داناوە تا کۆیلایەتی بنبڕ بکات و کۆتایی پێ بێت.

چواردەیەم: زیادبوونی ڕێژەی هەژاری، لەم خاڵە نەرێنییە سەرئەنجام و دەرهاویشتەیەکیش هەیە، ئەویش دەرهاویشتەی هەژاریی گەنجانە. لەم دنیای جیهانگیرییەدا بەڵێ بەرهەم زیادی کردووە، بەڵام دەرهاویشتەش زیادی کردووە، بۆ نموونە ئەگەر جاران برنج ساڵانە یەک ملیۆن تەن بەرهەمی هەبایە، ئێستا لەوانەیە دە

ملیۆن تەن بەرهەمی هەبێت، بەڵام هەژاریی و بێکاری زیادی کردووە. گەر ئیشکردن بۆ هەموو تاکەکان لە هەر دێ و شار و وڵاتێک هەبووایە، ئێستا بەپێچەوانەوە هەژاریی و بێکاری یەکجار زۆر زیادی کردووە لەناو گەنجان.

پازدەیەم: ڕەشکردنەوەی زمان(٤)، هەموو میللەتێک وەک سروشت حەز دەکات مومارەسەی زمانی خۆی بکات، وەک ئەوەی حەزیش دەکات مومارەسەی کولتوور و ڕۆشنبیریی و شوناسی خۆی بکات، دونیای هاوچەرخ لەبەرئەوەی ئاڕاستەکەی لەلایەن ئەمەریکا و ئەوروپاوەیە، وەک ئەوە وایە لە دنیادا تەنها زمانی ئەمەریکی و ئینگلیزی هەبن و تەواوی زمانەکانی تر فەرامۆش کراون. بەپێی سەرژمێری شەش هەزار زمان لە دنیادا هەن، ئێستا زمانێک و دوو زمان یان سێ زمان ڕۆڵیان هەیە.

لەکۆتاییدا، دونیای هاوچەرخ دەرفەتی زۆری تیدایە بۆ گەنجان داهێنان و نوێکاری تیدا بکەن، گەشەی فکریی و ڕۆشەنبیری خۆیان فراوان بکەن، وەک وێستگەیەکی هەستانەوە و گۆڕانکاری تەماشای بکەن و بەکاری بهێنن. ئەگەر گەنج خۆی تێیدا بێت بەدوای دەرفەت دا بگەڕێت.

## پەراوێزەکان

١ـ بڕوانە: مرکز النبأ الوثائقي يقدم الخدمات الوثائقية والمعلوماتية للاشتراك والاتصال gmail.com@annabaa٠١٠

٢ـ بڕوانە: مجلة رواد الأعمال.

٣ـ بڕوانە : الشباب والعولمه الثقافية، التحديات واليات المواجهة، د. فرح صابر.

٤ـ بڕوانە: توجيه الشباب المبدع وكيفية رعايتهم. وجدت عواد المشهداني.



وەرگێڕانی: ڕێدار ئەحمەد

# گەنجان
## لە کارنامەی گەشەپێدانی بەردەوام ۲۰۳۰ نەتەوەیەکگرتووەکاندا

**تێبینی**: ئەم بابەتە لە سایتی نەتەوەیەکگرتووەکان وەرگیراوە و وەرگێڕدراوە بۆ زمانی کوردی، هیچ قسەیەک لەسەر خاڵەکانی ئەو کارنامەیە نەکراوە. مەبەست لێی بەئاگابوونە لەو کارنامەیە و ئەو خاڵانەی تایبەتن بەگەنجان کە تەوەری ئەم ژمارەیەی گۆڤاری (خاڵ)ە.

**لەم بابەتەدا باس لە گەنجان لە کارنامەی ٢٠٣٠ی نەتەوەیەکگرتووەکان کراوە، سەرەتا وەک دەروازەیەک بۆ چوونە نێو بابەتەکە بەکورتی و پوختی باس لەو کارنامەیە دەکەین.**

## کارنامەی گەشەپێدانی بەردەوام ٢٠٢٣ چییە؟

لە ساڵی ٢٠١٥دا وڵاتانی ئەندامی نەتەوەیەکگرتووەکان بەکۆی دەنگ کارنامەی ٢٠٣٠ بۆ گەشەپێدانی بەردەوام (کارنامەی ٢٠٣٠)یان پەسەند کرد، کە ١٧ ئامانج و ١٦٩ مەبەست و ٢٣١ نیشانەدەری ناوازەی تێدایە. ئەم پلانە ئامانجی دانانی ئاڕاستەی سیاسەتە جیهانی و نیشتمانییەکانی پەیوەست بە گەشەپێدانە، هەروەها دابینکردنی بژاردە و دەرفەتی نوێ بۆ پڕکردنەوەی بۆشایی نێوان مافەکانی مرۆڤ و گەشەپێدان. هەروەها چوارچێوەیەکی گشتی پێکدەهێنێت کە ڕێنمایی کاری گەشەپێدانی جیهانی و نیشتمانی دەکات.

کارنامەی ٢٠٣٠ بەشێوەیەکی ڕاستەوخۆ ڕەگ و ڕیشەی لە مافەکانی مرۆڤدا هەیە و بەڕوونی لە جاڕنامەی جیهانی مافی مرۆڤ و، پەیماننامە نێودەوڵەتییەکانی بواری مافی مرۆڤ و ئامرازە پەیوەندیدارەکانی دیکەی وەک جاڕنامەی مافی گەشەپێدان (بڕگەی ١٠) دا هەیە. ئامانجەکانی گەشەپێدانی بەردەوام هەوڵدەدەن «مافەکانی مرۆڤ بۆ هەمووان بەدیبهێنن» (پێشەکی کارنامەی ٢٠٣٠) و بەشێوەیەکی گشتگیر بۆ هەموو خەڵک لە هەموو وڵاتاندا دەگونجێت جێبەجێ بکرێت، لەوانەش وڵاتانی پێشکەوتوو و وڵاتانی تازەپێگەیشتوو بەهەمان شێوە. لە هەمووی گرنگتر کارنامەی ٢٠٣٠ دەبێت بەشێوەیەک جێبەجێ بکرێت کە لەگەڵ یاسای نێودەوڵەتی بگونجێت (بڕگەی ١٨).

هەرچەندە داڕشتنەوەی ئامانجە دیاریکراوەکانی گەشەپێدانی بەردەوام لە ڕوانگەی مافەکانی مرۆڤەوە نەبووە، بەڵام زۆربەیان ڕەنگدانەوەی ناوەڕۆکی ستانداردە نێودەوڵەتییەکانن. بۆ نموونە ئامانجی یەکەم (کۆتاییهێنان بە هەژاری)، ئامانجی دووەم (نەهێشتنی برسێتی)، ئامانجی سێیەم (تەندروستی باش و خۆشگوزەرانی)، ئامانجی چوارەم (کوالیتی پەروەردە)، ئامانجی شەشەم (ئاوی پاک و پاکوخاوێنی)، ئامانجی هەشتەم (شایستە کار و گەشەی ئابووری) و ئامانجی یازدە (شار و کۆمەڵگە نێوخۆییە بەردەوامەکان)، زۆرێک لە ناوەڕۆکی سەرەکی مافە ئابووریی و کۆمەڵایەتی و ڕۆشنبیرییەکانن. ئامانجی ١٦ سەبارەت بە ئاشتی و دادپەروەریی و دامەزراوە بەهێزەکان باس لە هەندێک لە ڕەهەندە سەرەکییەکانی مافە مەدەنی و سیاسییەکان دەکات، لەوانە ئاسایشی کەسی، دەستڕاگەیشتن بە دادپەروەریی و ئازادییە بنەڕەتییەکان. لەکاتێکدا ئامانجی ١٧ باس لە پرسەکانی پەیوەست بە مافی گەشەپێدان و ئامرازەکانی جێبەجێ کردن دەکات.

**هەموو کەسێک بەبێ هیچ جیاوازییەک لەخۆدەگرێت**

کارنامەی ٢٠٣٠ ڕەگ و ڕیشەی لە بنەماکانی یەکسانی و جیاکاری نەکردندا هەیە، پابەندە بە «هەموویان بەبێ جیاوازی بگرێتەوە» و بە «پێشتر گەیشتن بە کەسانی دورخراوە و وەدەرنراو»، گرنگییەکی تایبەت بە گرووپە پەراوێزخراوەکان دەدات، هەروەها دوو ئامانجی بۆ بەرەنگاربوونەوەی جیاکاریی و نایەکسانی داناوە (ئامانجی پێنجەم سەبارەت بە یەکسانی جێندەری و ئامانجی دەیەم سەبارەت بە کەمکردنەوەی نایەکسانی لە ناوخۆی وڵاتان و لە نێوان وڵاتانیش)، ئەمە وێڕای پابەندبوونی هەمەلایەنەی بە پۆلینکردنی داتاکان و، گرتنەبەری ڕێبازی گشتگیر کە لەسەر بەشداریکردنی (نزیکخستنەوەی تەواوی کۆمەڵگە و تەواوی حکومەت) و، لێپرسینەوە لە بەدواداچوونی کارنامەی ساڵی ٢٠٣٠ و خستنەڕووی، ئەمەش ئاماژەیە بەوەی داڕشتنی تەواوی کارنامەکە لەڕێی بەکارهێنانی ڕێبازێکەوە بووە کە لەسەر بنەماکانی مافەکانی مرۆڤ ئەنجامدراوە، ئەوەش کارێکی یەکلاکەرەوەیە بۆ جێبەجێ کردنی بەشێوەیەکی کاریگەر.

ئەمە پوختەیەک بوو لەسەر کارنامەی گەشەپێدانی بەردەوام، ئەوەی پەیوەندارە بە بابەتەکەمانەوە بریتییە لە پێگەی گەنج لەو کارنامەیەدا، سەرەتا پێناسەیەکی گەنج لە ڕوانگەی نەتەوەیەکگرتووەکان دەخەینە ڕوو، دواتریش ئەو ئامانجانەی کارنامەکە کە پەیوەندارن بەگەنجان باس لێدەکەین.

**- پێناسەی نەتەوە یەکگرتووەکان بۆ گەنجان:**

هەرچەندە پێناسەیەکی نێودەوڵەتی بۆ تەمەنی گەنجان نییە کە لەسەر ئاستی جیهانی لەسەری کۆک بن، بەڵام نەتەوەیەکگرتووەکان - بۆ مەبەستی ئاماریی و بەبێ کەمکردنەوەی بەهای هیچ پێناسەیەکی دیکە کە لەلایەن وڵاتانی ئەندامەوە دانراوە – وا پێناسەی «گەنج» دەکات کە: کەسانی نێوان تەمەنی ١٥ بۆ ٢٤ ساڵ دەگرێتەوە. ئەم پێناسەیە لە چوارچێوەی ئامادەکارییەکانی ساڵی نێودەوڵەتی لاوان (١٩٨٥) بوو (بڕوانە A ٢١٥/٣٦) و، لەلایەن ئەنجومەنی گشتی لە بڕیارنامەی ٢٨/٣٦ی ساڵی ١٩٨١دا بڕیاری لەسەر داوە. هەموو ئامارەکانی نەتەو یەکگرتووەکان سەبارەت بە گەنجان لەسەر بنەمای ئەم پێناسەیە، وەک بڵاوکراوەی ساڵانەی ئامارەکان کە نەتەوەیەکگرتووەکان لەبارەی دیمۆگرافی، پەروەردە، کار و تەندروستی بڵاوی دەکاتەوە.

ئەم پێناسە ئامارییە بۆ گەنجان، کەسانی خوار تەمەنی چواردە ساڵان وەک منداڵ هەژمار دەکات. لەگەڵ ئەمەدا پێویستە ئاماژە بەوە بکرێت کە لە مادەی یەکەمی ڕێککەوتننامەی نەتەوەیەکگرتووەکان بۆ مافەکانی منداڵان کەسانی تا تەمەنی ١٨ ساڵی

به «منداڵ» پێناسە کردووە. ئومێدی ئەوە هەبوو ڕێکەوتننامەکە بیانپارێزێت و ماف بۆ گەورەترین گرووپی تەمەنی لەوکاتەدا دابین بکات، بەتایبەتی کە هیچ بەڵگەنامەیەکی هاوشێوە لەسەر مافەکانی گەنجان لەئارادا نەبوو.

هەروەها زۆرێک لە وڵاتانیش هەستاون بە دانانی پێوەر بۆ پێناسەکردنی گەنجان لەوەی پێوەندی بەو تەمەنەوە هەیە کە کەسێک هەیەتی هەتا بەشێوەیەکی یەکسان لەگەڵ گەورەکان بەپێی یاسا مامەڵەی لەگەڵ دەکرێت – زۆرجار ئەمە بە «تەمەنی پێگەیشتن (سن الرشد)» ناودەبرێت. ئەم تەمەنە لە زۆرێک لە وڵاتان بەزۆری ١٨ ساڵ دیاریکراوە، مرۆڤ تا دەگاتە ئەم تەمەنە بە پێگەیشتوو (بالغ) نازانرێت. بەڵام پێناسە و جیاوازییە وردەکانی دەستەواژەی «گەنج» لە وڵاتێکەوە بۆ وڵاتێکی دیکە جیاوازە، ئەمەش بەندە بە گونجاوی هەندێک فاکتەری کۆمەڵایەتی، کولتووری، دامەزراوەیی، ئابووریی و سیاسی هەر کۆمەڵگەیەک.

**- ئامارەکانی تایبەت بە گەنجان لە جیهاندا:**

لە ئیستادا یەک ملیار و ٢٠٠ ملیۆن گەنج لە نێوان تەمەنی ١٥ بۆ ٢٤ساڵیدا هەن، کە دەکاتە ١٦٪ی دانیشتوانی جیهان. پێشبینی دەکرێت تا ساڵی ٢٠٣٠ ژمارەی گەنجان بە ڕێژەی لە ٧٪ زیاد بکات - وادەی پێشبینیکراو بۆ گەیشتن بە ئامانجەکانی گەشەپێدانی بەردەوام - بگاتە نزیکەی یەک ملیار و ٣٠٠ ملیۆن گەنج.

**- گەنجان و بەرنامەی نەتەوە یەکگرتووەکان بۆ گەشەپێدانی بەردەوام:**

یەکێک لە بنەما سەرەکییەکانی کارنامەی ٢٠٣٠ نەتەوە یەکگرتووەکان دووپاتکردنەوەیە لەسەر «کەس لە گەیشتن بە ئامانجەکانی گەشەپێدان بەجێنامێنێت»، ئەم ئامانجانە بۆ هەموو مرۆڤەکان، لە هەموو وڵاتان و، بۆ گشت تەمەنەکان و بۆ هەموو کۆمەڵگەکان دانراون. سروشتی جیهانی کارنامەی ٢٠٣٠ پێویستی بەوەیە کە ڕۆڵی گەنجان لە هەموو ئامانج و مەبەستەکاندا لەبەرچاو بگیرێت. بەتایبەتی لەم چوار بوارەدا باسی گەنجان کراوە:

١. دامەزراندنی گەنجان.
٢. بارودۆخی کچانی هەرزەکار.
٣. پەروەردە.
٤. وەرزش لەپێناوی ئاشتی.

جگە لەم چوارە بوارە، گەنجان وەک هاریکار لە گۆڕانکاری مامەڵەیان لەگەڵ دەکرێت ئەمەش بەخستنەگەڕی تواناکانیان لەپێناو دەستەبەرکردنی جیهانێک کە گونجاو بێت لەگەڵ خواستەکانی نەوەکانی داهاتوو.

## گەنجان و ئامانجی چوارەم: کوالێتی خوێندن

چوارەم ئامانجی کارنامەی ٢٠٣٠ نەتەوەیەکگرتووەکان بریتییە لە کارنامەی خوێندن، لەم ئامانجەشدا ئاوڕ لە گەنجان دراوەتەوە، چونکە پەروەردە مافێکی سەرەتاییە بۆ گەنجان لە هەموو شوێنێک. دەقی ئامانجی چوارەمی ئامانجەکانی گەشەپێدانی بەردەوام داوای دابینکردنی پەروەردەی گشتگیر و یەکسان و کوالێتی و پێشخستنی دەرفەتی فێربوون بۆ هەمووان دەکات. بۆ بەدیهێنانی ئەمە، هەوڵی هاوبەش پێویستە بۆ دڵنیابوون لەوەی کە کچان و کوڕانی گەنج دەستیان بە خوێندنی بێبەرامبەر و باش و هەروەها دەستڕاگەیشتن بە دەرفەتەکانی ڕاهێنانی پیشەیی بە شێوەیەکی دادپەروەرانە. دوایین ئامارەکان ئاماژە بەوە دەکەن کە جیاوازییەکی قووڵی جیهانی لە بواری پەروەردەدا هەیە، ئەمەش وادەکات چانسی بەدەستهێنانی خوێندنی ناوەندی گشتگیر بۆ زۆر کەس لاواز بێت، بەتایبەتی لە وڵاتانی هەژاردا.

> **دوایین ئامارەکان ئاماژە بەوە دەکەن کە جیاوازییەکی قووڵی جیهانی لە بواری پەروەردەدا هەیە، ئەمەش وادەکات چانسی بەدەستهێنانی خوێندنی ناوەندی گشتگیر بۆ زۆر کەس لاواز بێت، بەتایبەتی لە وڵاتانی هەژاردا.**

دڵنیابوون لە دابینکردنی خوێندنی باش و گشتگیر و دادپەروەرانە زۆر گرنگە بۆ گواستنەوەیەکی سەرکەوتوو لە هێزی کار و بەدیهێنانی ئامانجی دەستڕاگەیشتن بە دەرفەتی کارکردنی شایستە بۆ هەموو گەنجان، چونکە دابینکردنی هەلی کار کارێکی بنچینەییە لە پرۆسەی بەدیهێنانی زۆرێک لە لە ئامانجەکانی گەشەپێدانی بەردەوام. پێویستە ئامانجی دابینکردنی خوێندنی سەرەتایی و ناوەندی بەرەخساندنی دەرفەتی خوێندنی تەکنیکی و پیشەیی بە نرخێکی گونجاو تەواوبکرێت کە لێهاتوویی بۆ گەنجان بۆ دامەزراندن و کارگێڕی دابین بکات.

## گەنجان و ئامانجی هەشتەم: کاری شایستە و گەشەی ئابووری

ئامانجی هەشتەم لە ئامانجەکانی گەشەپێدانی بەردەوام بانگەوازی کارکردنی شایستە بۆ گەنجان لەبەرچاو دەگرێت. بێکاری بەربڵاو، کەمیی هێزی کار و خراپی کوالێتی کار سەلماندوویەتی کە پرسێکی ماندووکارن بۆ ئابووریی. پێدەچێت ژمارەی گەنجانی بێکار سێ هێندەی گەورەکان زیاتر بێت، بەجۆرێک ڕێژەی بێکاری گەنجانی جیهانی لە ساڵی ٢٠١٧دا گەیشتە ١٣٪، زۆرێک لە گەنجان سەرقاڵی کارێکی کەم مووچە و ناجێگیر یان پیشەی نافەرمین. تەحەددیاتی دەستەبەرکردنی کاری شایستە و بەردەوام بۆ گەنجانی لاواز و پەراوێزخراو ئاڵۆزتر دەمێننەوە، لەوانەش کچانی گەنج، بەتایبەتی ئەوانەی لە دۆخی مرۆیی ناجێگیردا دەژین، هەروەها گەنجانی خاوەن پێداویستی تایبەت و، کۆچبەران و گەنجانی چینی کچان هاوڕەگەزخواز و، کوڕانی هاوڕەگەزباز، نێرەموک و ئەوانەی ڕەگەزیان گۆڕیوە.

## گەنجان لە چەقی کارنامەی ٢٠٣٠دان

گەنجان بە «ئاڵا هەڵگرانی ٢٠٣٠» ناودەبرێن، چونکە ڕۆڵێکی سەرەکی دەگێڕن نەک تەنها وەک سودمەند لە ڕێکار و سیاسەتەکانی کارنامەی گەشەپێدان، بەڵکو وەک هاوبەش لە جێبەجێکردنیدا. لەڕاستیدا گەنجان ئەجێندای ٢٠٣٠یان پەرەپێداوە و بەشدارن لەو چوارچێوە و پرۆسانەی کە پاڵپشتی جێبەجێکردن و بەدواداچوون و پێداچوونەوەی دەکەن. هەروەها پەسەندکردنی کارنامەی ٢٠٣٠ بەرهەمی پرۆسەیەکی چڕوپڕی سێ ساڵەی گفتوگۆیە بۆ دانانی مەبەست و ئامانجی دیاریکراو، کە وڵاتانی ئەندام و کۆمەڵگەی مەدەنی دەگرێتەوە - لەنێویشیاندا ڕێکخراوەکانی گەنجان.

پەسەندکردنی کارنامەی ٢٠٣٠ تەواوکردنی پرۆسەیەکی چڕوپڕی سێ ساڵە کە وڵاتانی ئەندام و کۆمەڵگەی مەدەنی، لەنێویشیاندا ڕێکخراوەکانی گەنجان، لە دانانی ئامانج و ئامانجی تایبەتدا بەشداربوون.

خۆشگوزەرانی و بەشداریکردن و بەهێزکردنی گەنجان یەکێکە لە بزوێنەرە سەرەکییەکانی گەشەپێدانی بەردەوام و ئاشتیی لە سەرانسەری جیهاندا. بەدیهێنانی کارنامەی ٢٠٣٠ پێویستی بە هاوبەشییەکی بەهێز و هەمەلایەنە هەیە لە نێوان گەنجان و هەموو لایەنە پەیوەندیدارەکان، بەجۆرێک چارەسەری ئەو تەحەددایانەی گەشەپێدان بکرێت کە ڕووبەڕووی گەنجان دەبنەوە (وەک بێکاری، وەدەرنانی سیاسی، پەراوێزخستن،

کێشە دەستڕاگەیشتن بە پەروەردە، تەندروستی و ... تاد) و ڕۆڵی ئەرێنی گەنجان وەک هاوبەش لە پێشخستنی گەشەپێدان و پاراستنی ئاشتیدا لەبەرچاو بگیرێت.

گەنجان هەمیشە پێشەنگی ئەو چالاکیی و دەستپێشخەرییانە بوون کە ئامانجیان پێشخستنی کارنامەی ٢٠٣٠ و بەدیهێنانی ئامانجەکانی بووە. گەنجان بەشدارن لە ژمارەیەکی زۆر لە دەستپێشخەرییەکانی هۆشیارکردنەوە، ئەرکەکانی کۆکردنەوەی زانیاری، کۆکردنەوەی خەڵکی، جێبەجێ کردنی دەستپێشخەرییە نیشتمانییەکان، هەوڵەکانی چاودێریکردن، لێپرسینەوە و ئامادەکردنی ئەو ڕاپۆرتانەی کە ڕەنگدانەوەی ئەو پێشکەوتنانەن کە لە گەیشتن بەو ئامانجانەدا بەدەست هاتوون.



**علی ئیبراهیم حەسەن**
بەڕێوەبەری دامەزراوەی MultiBusiness بۆ ڕاهێنان و ڕاوێژکاری

# بۆچی هەندێك گەنج فرەکارن زۆرێك گەنجیش بێکارن



یەکێک لە بابەتە هەرە گرنگەکان کە پێویستە حکومەت و پەرلەمان و پارتە سیاسییەکان و دامودەزگای پەیوەندیدار بە گەنجان بیری لێبکەنەوە، بێکاری گەنجانە، بۆیە ئەم بابەتەم بە گرنگ زانی، چونکە دەبێتە وەڵامدەرەوەی چەند تەوەرەیەک کە ڕۆژانە گەنجان پرسیاری لەسەر دەکەن.

**یەکەم: ئایا حکومەت بەرنامەی هەیە گەنج دابمەزرێنێت؟**

و: لە دوای ڕاپەڕینی ساڵی١٩٩١ لە هەرێمی کوردستان و ڕووخانی ڕژێمی بەعس لە ساڵی ٢٠٠٣ شێوازی حوکم لە عێراق گۆڕانی بەسەردا هاتووە، پێشتر پەیڕەوی لە سیستەمی ئیشتراکی دەکرا، ئێستا لە قۆناغی ڕاگوازەر (إنتقالي) بەرەو سیستەمی (سەرمایەداری) و بازاڕی ئازاد و کەرتی تایبەت، بۆیە حکومەت ڕۆڵ دەگۆڕێت لە دامەزراندن (تعينات) بۆ دەرچووانی پەیمانگا و زانکۆکان و گەنجان بەگشتی بۆ ڕۆڵی (فرص) دۆزینەوەی دەرفەتی کار لە کەرتی تایبەت و ئەهلی، کەواتە ستراتیجی حکومەت ساڵ لە دوای ساڵ بەرەو ئەوەیە خۆی دەرباز بکات لە دامەزراندن (تعينات)، تەنها دامەزراندنی سنوردار ئەویش چەند ساڵ جارێک ئەمە حەقیقەتە، بۆیە پێویستی بە ئامادەسازی گەورە هەیە .

**دووەم: گەنج بە خوێندنی پەیمانگا و زانکۆ و بەدەستهێنانی بڕوانامەی باڵا کاری دەستدەکەوێت؟**

و: بەڵێ لە ڕابردوو کە ژمارەی دانیشتوان کەم بوو، سیستەم ئیشتراکی بوو، بەڵام لە ئێستادا تەنها بڕوانامە فریای گەنج ناکەوێت.

**سێیەم: بۆچی بڕوانامە فریای گەنج ناکەوێت؟**

و: بڕوانامە ئەگەر شارەزایی و لێهاتوویی (مهارات)ی لەگەڵ بێت، دەتوانێت هەلی کاری پێ بەدەستبهێنێت، بەڵام کوالێتی پەیمانگا و زانکۆکان لەڕووی پرۆگرام و بوارەکانی خوێندن و ئاستی مامۆستا و بەشی ڕاهێنان و بەشداری کرداری زۆر لاوازە، بۆیە پێویستە خوێندنی باڵا و پەروەردە پێداچوونەوەی پێدا بکرێت و ڕەچاوی گۆڕانکاری بازاڕ بکرێت.

**چوارەم: ئایا زانکۆ و پەیمانگا هاوتەریبی بازاڕن؟**

و: نەخێر، زۆربەی ئەو بوارانەی کە بازاڕ پێویستی پێی هەیە لە بەشی زۆری زانکۆکان بەردەست نیە.

**پێنجەم: بازاڕی کار چی پێویستە؟**

و: بازاڕی کار پێویستی بە گەنجانێکە جگە لە بواری زانیاری (معرفة) و زانست لە بواری پراکتیک و جێبەجێیکردن و شارەزایی و لێتهاتوویی (مهارات) پڕ چەک کرابن.

**شەشەم: چ لێهاتوویەک (مهارات) پێویستە بۆ گەنج؟**

و: دوای بڕوانامەیەک کە گونجاو بێت لەگەڵ ژینگەی بازاڕ، دەبێت بایەخ بە فێربوونی زمان بدرێت، سەدا ٨٥٪ زانیاری لە جیهان بە زمانی ئینگلیزییە، دواتر زمانی عەرەبی، لە کوردستان کە قولایی ستراتیژیمان بووە بە بەغدا پێویستە زمانی عەرەبی وەکو زمانی دایک (کوردی) بزانین، چونکە زیاتر لە سەدا ٧٠٪ کڕیاری بازاڕەکانی کوردستان عەرەبن؟ بینراوە ئەو دوکاندارەی عەرەبی باشە داهاتی چوار هێندە ی کەسێکە کە عەرەبی نازانێت، لە پرۆسەی وەرگرتنی کارمەند لە کۆمپانیا نێودەوڵەتی و ئاژانسەکانی UN و کونسوڵخانەکان ئەوانەی ئینگلیزی دەزانن بە ئاسانتر هەلی کاریان دەست دەکەوێت، دواتر شارەزایی لە تەکنەلۆژیا و پرۆگرامەکانی کۆمپیوتەر و شارەزایی لە هونەری پەیوەندییەکان (فن التواصل) و لێهاتوویی و لە بواری ئیدارە و سەرکردایەتی و کارکردن بە تیم و دۆزینەوەی کێشە و داهێنان لە چارەسەری کێشەکان و بیرکردنەوەی نوێکاری ئەمانە گرنگن لەگەڵ چەند خاڵێکی تر.

**حەوتەم: ئایا هەلی کار لە گوند و شارۆچکە زیاترە یا خود لە پارێزگا و شارە گەورەکان؟**

و: بەدڵنیایی هەلی کار لە شارە گەورەکان زیاترە، سەقامگیریی و بوونی ڕێگاوبانی پێویست و خزمەتگوزاری جۆراو جۆر.

**هەشتەم: ئەی چارە چییە بۆ گوند و شارۆچکەکان؟**

و: دەبێت نوێنەرانی خەڵک لە ئەنجومەنی پارێزگا و لە پەرلەمان و موختاری گوند و گەڕەکەکان بەردەوام لەلایەن ڕێکخراوەکانی لاوان و گەنجان و قوتابی و خوێندکاران بەسەر بکرێنەوە و داوایان لێبکرێت لەڕێگەی پەیمان و حکومەت و وەزارتی پلاندانان و وەزارەتی کار و دەستەی وەبەرهێنان نەحشەڕێگای هەبێت بۆ گوند و شارۆچکە فەرامۆشکراوەکان.

**نۆیەم: چۆن دەکرێت گەنجان لە گوند و شارۆچکەکان لە بێکاری ڕزگار بکرێن؟**

و: لە ڕێگەی پرۆژەی بچووک و پێدانی قەرزی بچووک لەلایەن حکومەت و دەزگای تایبەت بە هاوکاریی و کردنەوەی سەنتەری مەشق و ڕاهێنانی پیشەیی و سەنتەری دۆزینەوەی کار لە شارۆچکەکان و بایەخدان بە کەرتی کشتوکاڵی و ئاژەڵداریی و ئاودێریی و گەشتیاری ... تاد.

**دەیەم: ئایا کوردستان جێگای ئومێدە؟**

و: بەڵێ، چونکە ڕێژەی دانیشتوانی زۆر کەمە ئەگەر ئاوارە و پەناهەندە و کرێکاری بیانی لێ دەر بکەیت نزیکەی (٤) ملیۆن دەمێنێتەوە، ڕووبەری کوردستان بە قەد جوگرافیای کۆریای باشوورە، ئێمە هەموو سەرچاوە سرووشتییەکانمان هەیە، نەوت ٤٪ی جیهان، غاز ٧٪، لە سەدا ٧٥٪ کانزا بە نرخ و دەگمەنەکان هەموو عێراق لە کوردستانە، ئاو و ڕووبارەکان کە لە کوردستان هەڵدەقوڵێت بەشی (٣٥) ملیۆن کەس دەکات، کۆریا دوورگەیەکی بەردینی ڕەق نزیکەی (٤٨) ملیۆن کەس بە ئەوپەڕی خۆشگوزەرانی دەژین.

**یازدەهەم: چۆن دەبینە کۆریای باشوور؟**

و: أ – گۆڕینی سیستەمی پەروەردە.

ب – بە دامەزراوەیی بوون.

ج – دادپەروەری.

د – فرەچەشنکردنی داهات و وازهێنان لە بیرۆکەی تاک سەرچاوە فرۆشتنی نەوت و کردنی بە مووچە.

هـ – بایەخدان بە پرۆژەی بچووک، چین ئابوورییەکەی ٧٠٪ لەسەر پرۆژەی بچووکە Small project.

و – بایەخدان بە ژێرخانی گەشتیاری، کشوکاڵی، پیشەسازی، ئاژەڵداری.

ز – ئومێد و هیوا و بڵاوکردنەوەی گەشبینی.



# گەنج و هەرزەکار ١٩٨٣- ٢٠١٠

## بیبلیۆگرافیا و پێڕستی لە پڕۆژەی (کورد و کوردستان- بیبلیۆگرافیا و پێڕستیان لە کتێبی کوردیدا ١٩٢٠- ٢٠١٠)دا

ئامادەکردن: بوار نوورەدین

**تێبینی:**

تێبینی:

١- بەکاربەری ئەم بیبلیۆگرافیا، بۆ هەر سەرنج و ڕوونکردنەوەیەک، پێویستە سەیری ژمارەکانی پێشتری گۆڤاری خاڵ بکات.

٢- تەنها بۆ وشەی (گەنج) و (هەرزەکار) گەڕاوین.

**کورتکراوەکان:**

پ.: پێوانە (بە سانتیمەترە و پانی پێش درێژی نووسراوە)

چ.: چاپخانە

چاپ.: نۆرەی چاپ

ح.د.ک.: حیزبی دیموکراتی کوردستان

ژ.: ژمارە

ژ.س.: ژمارەی سپاردن

ژمارەی جێگیری نێودەوڵەتیی کتێب

ISBN: INTERNATIONAL STANDARD BOOK NUMBER

س.: ساڵ

ش.: شوێن

کۆڕ.: کۆڕی زانیاریی کورد

ل: لاپەڕە

و.: وەزارەت

ی.ن.ک.: یەکێتیی نیشتمانیی کوردستان

؟: هەر زانیارییەکی نادیار و نەزانراو

## یەکەم: کتێبی سەربەخۆ

**١- منداڵ لە قۆناغی دوامنداڵی و هەرزەکاریدا- دەروون زانی**

نووسین: جەلال خەڵەف ژاژڵەیی

بە یارمەتیی ئەمینداریێتیی گشتیی ڕۆشنبیری و لاوانی ناوچەی کوردستان چاپکراوە

چاپ.: یەکەم، چ.: حسام، ش.: بەغدا، ژ.س.: ١٢١٨، س.: ١٩٨٣، ل.:١٤٤، پ.:١٦×٢٤

ناوەرۆک: پێشەکی/ منداڵ لە قۆناغی سەرەتاییدا/ لێکۆڵینەوەی ژیانی منداڵ/ سەرچاوەکانی گەشەکردن/ گرینگی گەشەزانین بۆ مامۆستا/ پێناسەی گەشەکردن/ مانای منداڵی/ جۆرەکانی گۆڕان/ گرینگی گۆڕان لە ژیانی منداڵدا/ قۆناغەکانی گەشەکردنی منداڵ/ دوا قۆناغی منداڵی/ گەشەکردنی لەشی منداڵ/ گرینگترین سیفەتی گەشەکردنی ژیری/ گرینگی وێنەکێشان بۆ منداڵ/ پەیوەندیی منداڵ بە گەورە کەسانەوە/ پەیوەندیی منداڵ بە هاوڕێکانیەوە/ گەشەکردنی باری دەروونی و هەڵچوونی/ کۆسپەکانی گەشەکردنی لە قۆناغی خوێندنی سەرەتاییدا/ خۆشەویستی/ پەیوەندیی خۆشەویستیی نێوان مامۆستایان و قوتابیانی/ تووڕەیی/ دواکەوتن لە خوێندندا/ لاساری/ قۆناغی هەرزەکاری/ گیروگرفتی هەرزەکار لەباری توخمەوە/ کردارە بالاکانی ژیری/ گەشەی کۆمەلایەتی/ بایەخ پێدانی دیمەنی هەرزەکار/ چوونە ژێری/ پێویستییەکانی هەرزەکار/ بەشەکانی پێویستی/ گونجاندن/ پێناسەکردنی سەرنەکەوتن/ هەرزەکاری کورد/ گیروگرفتی قۆناغی هەرزەکاری/ چاوگەکان/ ناوەرۆک.

**٢- حزب و دەسەلات- گەنج و بەشداری سیاسی- کۆمەڵە وتار**

نووسین: ئاوات عەبدوڵلا

لە بلاوکراوەکانی چاپخانەی ڕەنج

چاپ: یەکەم، چ: ڕەنج، ش: سلێمانی، ژ.س: ٤١٩، س: ٢٠٠٥، ل:٨٩، پ:١٤×٢٠

ناوەڕۆک: پێشەکی/ هەندێ ناونیشانی وەک: حیزب و دەسەڵات- گەنج و بەشداری سیاسی (خوێندنەوەیەکی ڕەخنەیی)/ نەخۆشی کوشندە و بێدەنگی ئێمە/ گەنج و کێشە هەنووکەییەکان/ کوێرەوەریی گەنجان و وەهمی سەربەخۆیی/ هەڵبژاردن ڕێگایەکی نوێیە بۆ خنکاندنی گەنجان/ سەقەتی کلتوور و ئەخلاقی خوێندکار/ خوێندکار و ڕۆژنامە- زانکۆ و دکتاتۆریەت/ مانگرتنی خوێندکارانی کۆلێجی زانست چیمان پێ دەڵێ...؟/ لە خەڵکی چەوساوەی ژیانەوە بۆ دەسەڵاتنشینانی کوردستان/ سەرچاوەکان.

**٣- گەنجەکانمان بەرەو کوێ؟**

نووسین: مەلا ئەحمەد قامیشی

چاپ: یەکەم، چ: سیما، ش: سلێمانی، ژ.س: ٣٥٠، س: ٢٠٠٥، ل:٥٦، پ:١٥×٢٠

ناوەڕۆک: پێشەکی/ هەندێ بابەتی وەک: گرینگی ڕۆڵی گەنج/ نەخشە و پیلانی نەیاران بۆ لادانی هەرزەکاران/ چاولێکەری دەردێکی کوشندەیە/ بازرگانیکردن بە ئافرەتەوە/ ئەدەبمان لەگەڵ هاوڕێیاندا/ دوور بکەونەوە لە جگەرەکێشان/ خۆت بپارێزە لە زیانەکانی تیڤی/ ئازادی یانی چی؟/ کۆتایی/ پێڕست.

**٤- ئاسۆیەک بۆ لاو**

ئامادەکردن: بەکر ئیبراهیم

لە بڵاوکراوەکانی ڕادیۆی دەنگی کوردستان

چاپ: یەکەم، چ: منارە، ش: هەولێر، ژ.س: ٧٣٨، س: ٢٠٠٦، ل:٢٤٠، پ:١٦×٢٢

ناوەڕۆک: پێشەکی: سالار عوسمان (بەڕێوەبەری ڕادیۆی کوردستان)/ هەندێ بابەتی وەک: شوناس یا پێناسەیەک بۆ گەنج/ خێزان بەشێک لە سێگۆشەی دەسەڵاتی کۆمەڵگا/ نەبوونی هۆشیاریی سێکسی گرێیەکی سایکۆلۆژییە/ ئیدۆلۆژیا- دیواربەندی نێوان گەنج و حیزب/ ئازادیی ژن لە دەرەوەی کاری ڕێکخراوەیی/ گەنج لە نێوان دەسەڵاتەکانی ئایین و کولتووری کۆمەڵگا/ کاتێک میدیا سەربەخۆ نەبوو ویژدانیش سەربەخۆ نابێت/ ڕۆڵی حکوومەت لە دوای ١٥ ساڵ ئازادی و خۆبەڕێوەبردن و پەروەردەی لاوان/ بارگرژیی نێوان دەسەڵات و ئیدیۆلۆژیا/ گەنج و بارگرژیی سیاسی/ ناوەڕۆک.

**٥- بیبلۆگرافیای گەنجان**

ئامادەکردن: شاخەوان ئەکرەم دووکانی

لە بڵاوکراوەکانی وەزارەتی ڕۆشنبیری- بەڕێوەبەرایەتیی گشتیی چاپ و بڵاوکردنەوە

چاپ: یەکەم، چ: ؟، ش: سلێمانی، ژ.س:

٢٦٩، س.: ٢٠٠٦، ل.:٢٤٥، پ.:١٦×٢٢

ناوەرۆک: لە سەرەتای کتێبەکە وێنەیەکی بچووکی هەموو ئەوانەی داناوە کە لە کتێبەکەدا ناویان هاتووە/ پێشەکی: جەوهەر کرمانج/ لە بەراییدا/ کورتەیەک لە ژیاننامە و نموونەیەک لە بەرهەمی نزیک بە ١٠٠ گەنجی کورد لە: هونەرمەند-شاعیر-میدیاکار-وەرزشەوان...

**٦- شوناسی گەنج**

نووسین: زانیار سەردار قرگەیی

چاپ.: یەکەم، چ.: نەوا، ش.: ؟، ژ.س.: ٣٠٨، س.: ٢٠٠٦، ل.:١٣٢، پ.:١٦×٢٣

ناوەرۆک: وتەیەکی پوخت/ هەندێ بابەتی وەک: لاوان و قۆناغێکی نوێ/ کاریگەریی گۆشەگیری بەسەر گەنجانەوە/ گەنج و دەرگا داخراوەکان/ کێ لە چارەنووسی لاوەکانمان بەرپرسیارە؟/ ئەرکی لاوان لەم قۆناغە هەستیارەدا/ گەنجان و سیستمی دواکەوتوویی.../ پرۆسەی هاوسەرگیری.../ گەنج و ناعەدالەتی/ لاو لە چوارچێوەی ڕێکخراوەکان.../ پێرست. ساڵی لەسەر نییە و بە پێی مێژووی نووسینی پێشەکییەکەی، لەم ساڵەدا دانراوە.

**٧- گەنج و شوناس**

نووسین: ئارام سدیق

چاپ.: یەکەم، چ.: گەنج، ش.: سلێمانی، ژ.س.: ١٠٨٨، س.: ٢٠٠٦، ل.:٢١٩، پ.:١٤×٢٠

ناوەرۆک: پێڕست/ پێشەکی کورت (لێرەدا نووسراوە: ئەوەی ئەم کتێبە مەبەستێتی لێی بدوێ، گفتوگۆکردنە لەسەر دۆخی پڕ لە ئاڵۆزی گەنج و ئەو پەرتەوازییەی گەنج و نەبوونی شوناسێکی جێگیر. ئەم کتێبە گفتوگۆیە لەگەڵ کۆمەڵێک نووسەر و ڕۆشنبیر، کە لە کایەی ڕۆشنبیریی کوردیدا، دەنگی دیارن و تاڕادەیەکیش خاوەنی بیرکردنەوە و ڕوانینی جودان، دەربارەی ڕەوشی گەنجانیش خاوەنی ڕای سەربەخۆ و تایبەتن...)/ ئیسماعیل حەمەئەمین/ یاسین بانیخێڵانی/ عەدالەت عەبدوڵڵا/ ڕەزا مەنوچێهری/ فازیل هیمەت/ مامۆستا عەلی باپیر/ بەختیار عەلی/ حەمەی ئەحمەد ڕەسوڵ/ ئاسۆ جەبار/ سوپاسنامە.

**٨- دەربارەی گەنجان**

نووسین: کارزان کاوسێن

لە بڵاوکراوەکانی مەکتەبی بیر و هۆشیاریی (ی.ن.ک)

چاپ.: یەکەم، چ.: ؟، ش.: سلێمانی، ژ.س.: ٣٥٥، س.: ٢٠٠٦، ل.:٨٢، پ.:١٢×١٨

ناوەرۆک: ناوەرۆک/ پێشەکی/ کۆمەڵناسی گەنجان/ کەسایەتیی گەنجی کورد لە نێوان تێکشکان و دروستبوونەوەدا/ گەنج و پرسی بەشداری سیاسی/ کاریگەریی کەلتووری عێراقی لەسەر گەنجی کورد/ بەجیهانیبوون و کێشەی گەنجان/ ڕاپەڕین

و نەوەکان بە تێڕوانینێکی تر/ دەربارەی دوایین خۆپیشاندانەکانی خوێندکاران/ خوێندکار و مامۆستای کاریزماتیک/ هاوڕێیەتی کارەکتەری کورد بە لۆژیکی ئەرستۆ و دێریدا/ پەراوێزەکان.

**٩- گەنج- سیاسەت- مەعریفە**

نووسین: د.بەختیار جەبار شاوەیس

لە بڵاوکراوەکانی مەکتەبی بیر و هۆشیاریی (ی.ن.ک)

چاپ: یەکەم، چ: ؟، ش: سلێمانی، ژ.س: ٤٩٨، س: ٢٠٠٦، ل:١٩٣، پ:١٤×٢٠

ناوەڕۆک: پێڕست/ پێشەکی- بەرایی/ هەندێ بابەتی سەرەکیی وەک: گەنج و پرۆسەی سیاسی/ هۆشیاریی دیموکراسی/ عەلمانیەت و بێدینی/ دیموکراسی و پرۆژەی ڕۆژهەڵاتی ناوەڕاست/ کۆڕەکان/ ڕۆشنگەری و کۆمەڵگەی کوردی/ ڕۆشنبیران و دەسەڵات/ پەیوەندیی بەعسیزم بە ناسیۆنالیزمەوە/ پەراوێزەکان و سەرچاوەکان.

**١٠- گەنج و بەشداری سیاسی- لێکۆڵینەوەیەکی مەیدانییە لە هەرێمی کوردستان**

نووسین: ڕابەر تەڵعەت

لە بڵاوکراوەکانی دەزگای توێژینەوە و بڵاوکردنەوەی موکریانی

چاپ: یەکەم، چ: و- پەروەردە، ش: هەولێر، ژ.س: ٨٦٧، س: ٢٠٠٦، ل:١٢٠، پ:١٥×٢٢

ناوەڕۆک: پێڕست/ پێشەکی/ گرفتی لێکۆڵینەوە/ ئامانج و بایەخی لێکۆڵینەوە/ گریمانەکانی لێکۆڵینەوە/ کۆمەڵگای لێکۆڵینەوەکە/ ئامرازەکانی کۆکردنەوەی زانیاری/ ئامرازەکانی ئامار/ سنووری لێکۆڵینەوە/ بەشی یەکەم: گەنج/ چەمکی گەنج/ کولتووری گەنج/ پرسی گەنج و ململانێی نەوەکان/ گەنج وەک گرووپی بەرژەوەندی/ بەشی دووەم: پێگەیاندنی سیاسی/ کەناڵەکانی پێگەیاندنی سیاسی/ پێگەیاندنی سیاسی لە کوردستاندا/ بەشی سێیەم: بەشداری سیاسی/ شێواز و کەناڵەکانی بەشداری سیاسی/ گەنج و بەشداری سیاسی لە کوردستاندا/ هەڵبژاردن/ ڕاپرسی (Referendum)/ خۆپیشاندان (Demonstration)/ کۆمەڵگای مەدەنی (Civil society)/ حیزب (party)/ دەسەڵات (Authority)/ ئەنجامەکانی لێکۆڵینەوە/ ڕاسپاردە و پێشنیاز/ سەرچاوەکان.

**١١- ڕاپۆرتی ساڵانەی ڕەوشی گەنج لە کوردستان ئابی ٢٠٠٦ تا ١٢-٨-٢٠٠٧**

ئامادەکردن: ڕێکخراوی تواناسازیی لاوانی کوردستان KYEO بە هاوکاریی ڕێکخراوی فریاگوزاری میللەتی نەرویجی NPA

بەڕێوەبەری پرۆژە: شاد محەمەد

ڕێکخستنی زانیارییەکان: عیزەدین ئەحمەد

وەرگێڕانی لە زمانی ئینگلیزییەوە: د.گۆران عەبدوڵلا سابیر
چاپ: ؟، چ: ؟، ش: ؟، ژ.س: ؟، س: ٢٠٠٧، ل:٦٨، پ:٢٠×١٩
ناوەرۆک: ناوەرۆک/ پێشەکی/ پاشخان/ گەنج و دەستوور و یاسا/ ڕاستییەکانی ژیانی گەنج لە کوردستان/ توندوتیژی دژ بە گەنجان/ توندوتیژی ئایینی/ پێشێلکاریی مافی گەنجان لە خۆپیشاندانەکانی کوردستاندا/ گەنج و کۆچکردن/ پێشێلکارییەکانی مافی گەنج لە ئازادییەکانی ڕاگەیاندن و ڕۆژنامەوانی/ هەمان ئەم بابەتانە بە زمانی ئینگلیزی... تەواوی کتێبەکە لەسەر ئارت و بە ڕەنگاوڕەنگی چاپکراوە.
ساڵی لەسەر نییە و بە پێی ناونیشانی کتێبەکە، لەم ساڵەدا دانراوە.

**١٢- زانکۆ لە مۆدیلەوە بۆ واقیع**

نووسین: ڕێبوار سیوەیلی
لە بڵاوکراوەکانی دەزگای گەنجان بۆ ڕاگەیاندن و بڵاوکردنەوە
چاپ: یەکەم، چ: دۆست، ش: هەولێر، ژ.س: ٧٠، س: ٢٠٠٧، ل:٢٣٠، پ:١٥×٢١
ناوەرۆک: گەنجبوونەوەی زانکۆ: ئەییوب کەریم- بەڕێوەبەری دەزگای گەنجان/ بابەتەکان/ پێشەکی: ستاییشی حەسەن ڕەسووڵ سیساوەیی/ هەندێ بابەتی وەک: زانکۆ لە نێوان جەوهەر و پراکتیکدا/ کۆمەڵگا و زانکۆ/ نەوەی نوێ لە دوای هاتنی مارینزەوە/ لە نێوان زانکۆی سلێمانی و سەلاحەدیندا/ ونبوونی چەمکی مرۆڤ لە زانکۆدا/ قەیرانی سیستمی پەروەردەیی لە کوردستاندا/ کێشەی مامۆستا گەڕاوەکانی هەندەران/ خۆپیشاندان و خەباتی گەنجان و قوتابیان/ بوون بە یاریدەدەری زانستی و پەیوەندیت بە نێچیرڤان بارزانییەوە.

**١٣- سیاسەت و بەرپرسیاری- چەند وتارێک دەربارەی گەنج و سیاسەت**

نووسین: ئاوات عەبدوڵلا
لە بڵاوکراوەکانی چاپخانەی ڕەنج
چاپ: یەکەم، چ: ڕەنج، ش: سلێمانی، ژ.س: ٥٤٧، س: ٢٠٠٧، ل:٨٧، پ:١٤×٢٠
ناوەرۆک: پێشەکی (گەنج... جەستە یان هەڵوێست): توانا عوسمان/ سەرەتایەکی پێویست/ هەندێ ناونیشانی وەک: سیاسەت و بەرپرسیاریی قەیرانی کەبت و دۆگمابوونی گەنجان/ گەنج ... شوناسێکی دزراو/ تێکدان یاخود خۆپیشاندان/ گەنج و دەنگدان/ گەنج و پرسیار/ گەنج و دەسەڵات.../ گەنج و خۆپیشاندان/ تیرۆر... گەنج و هەڵوێست/ گەنج و ئەخلاقە بەرپرسیاری/ دیسان موزایەدە بە عەقڵی خوێندکارانەوە/ گوناهبار و دادگا- پیاوەکانی حیزب یاخود ڕۆژنامەنووسان/ سووتاندنی مۆنۆمێنت- هەڵەبجە لە کارەساتەوە بۆ کارەسات.

**١٤- گەنجە کوردەکان- یەکەمین پرۆژەی مەعریفیی کورد لە مێژوودا**

نووسین: فەرهاد پیرباڵ

لە بڵاوکراوەکانی مەکتەبی بیر و هۆشیاریی (ی.ن.ک)

چاپ: یەکەم، چ: حەمدی، ش: سلێمانی، ژ.س: ٦٢٧، س: ٢٠٠٧، ل:١٠٨، پ:١٣×٢٠

ناوەرۆک: پێشینەیەکی مێژوویی لەبارەی (گەنجە تورکەکان)/ زاراوەی (گەنجە کوردەکان) چ پەیوەندییەکی بە (گەنجە تورکەکان)ـەوە هەیە؟/ فاکتەر و هۆکارەکانی دروستبوونی بزاڤی (گەنجە کوردەکان)/ ئایا (گەنجە کوردەکان) پرۆژەیەکی مەعریفییان هەبووە؟/ دیماهی/ ژێدەر و سەرچاوە.

**١٥- نابەشداری گەنج لە پرۆسەی سیاسی کوردستاندا- توێژینەوەکی تیۆری- مەیدانییە، بە هاوکاری دێسکی گەنجانی بەرنامەی کۆمەڵەی گەشەپێدانی خەڵک لە ڕێکخراوی (NPA) نەرویجی ئەنجام دراوە**

ئامادەکردن: حەمەدەمین خدر ئەحمەد – ئیبراهیم محەمەد سەرکەپکانی

توێژەرانی یاریدەدەر: کاوە عەبدوڵڵا ئەحمەد- سروە مستەفا حەمەد- ئاشنا سلێمان

پێداچوونەوە: کاروان مەهدی

چاپ: یەکەم، چ: ماردین، ش: هەولێر، ژ.س: ١١٢٩، س: ٢٠٠٧، ل:٩٨، پ:١٥×٢١

ناوەرۆک: ناوەرۆک/ پێشەکی/ گرفتی توێژینەوە/ ئامانج و گرینگی توێژینەوە/ گریمانەکانی توێژینەوە/ ڕەهەندەکانی توێژینەوە/ ئامرازەکانی کۆکردنەوەی زانیاری/ کۆمەڵگەی توێژینەوە/ نموونەی توێژینەوە/ چەمکەکانی توێژینەوە/ هەندێ بابەتی وەک: گەنج/ سیاسەت/ پرۆسە/ بەشداری سیاسی/ هۆکارەکانی نابەشداری گەنج لە سیاسەتدا/ گەنج و نامۆبوون لە کۆمەڵگەی کوردیدا/ پەیوەندیی نێوان گەنج و دەسەڵاتی کوردی/ باری کۆمەڵایەتی نموونەی توێژینەوەکە/ ئەندامبوون لە حیزبە سیاسییەکان/ گەنج و ئازادیی ڕادەربڕین لە پرۆسەی سیاسیدا/ گەنج لە ناوەندەکانی بڕیارداندا/ گەشبینی گەنج بە داهاتووی حکوومەتی هەرێم/ پێدانی مووچە بە گەنج لە بەرامبەر ئەندامبوونی حیزبی سیاسیدا/ هۆکارەکانی بەشداری نەکردنی گەنج لە پرۆسەی سیاسیدا/ ئەنجامی توێژینەوەکە/ ڕاسپاردە و پێشنیازەکان/ سەرچاوەکان/ پاشکۆ.

**١٦- هەرزەکاران با خۆیان بدوێن**

نووسین: گەشاو عەبدولقادر

لە بڵاوکراوەکانی وەزارەتی ڕۆشنبیری- بەڕێوەبەرێتیی چاپ و بڵاوکردنەوەی سلێمانی

چاپ: یەکەم، چ: ؟، ش: سلێمانی، ژ.س:

١٤٨، س.: ٢٠٠٧، ل.:١٠٢، پ.:١٥×٢١
ناوەرۆک: پێشەکییەک: هەڵگورد جەلال/ بەشی یەکەم: تۆ و هەرزەکار.../ بەشی دووەم: گەشەکردن لە قۆناغی هەرزەکاریدا/ بەشی سێیەم: چاوپێکەتن لەگەڵ: یوسف عوسمان ئەحمەد/ بەختیار عەبدوڵلا/ با هەرزەکاران خۆیان بدوێن (ڕاپرسی)/ سەرچاوەکان/ ناوەرۆک (بێ ناونیشان).

**١٧- گەنج و دەسەڵات**

نووسین: بەختیار جەبار شاوەیس
لە بڵاوکراوەکانی مەکتەب ڕێکخستن (ی.ن.ک) بەشی ڕووناکبیری
چاپ.: یەکەم، چ.: ڕوون، ش.: سلێمانی، ژ.س.: ٢٠٢٦، س.: ٢٠٠٨، ل.:١٣٧، پ.:١٤×٢٠

ناوەرۆک: ناوەرۆک/ هەندێ بابەتی وەک: گەنج و شوناس/ گەنج و کۆمەڵ/ گەنج و کولتووری باوکسالاریی/ گەنج و پەروەردە/ گەنج و هاوڕێیەتی/ گەنج و خۆشەویستی/ گەنج و هاوسەرگیری/ گەنج و سێکس/ گەنج و ئینتیما/ گەنج و دەسەڵات/ گەنج و سیاسەت/ مەوداکانی گەنجبوون لە کاڵبوونەوەی ئینتمای سیاسیدا/ گەنج و یەکێتی/ گەنج و ڕاپەڕین/ گەنج و نائۆمێدی/ گەنج و فەرامۆشی/ گەنج و شەرمنی/ گەنج و غەریبی لە هەندەران/ گەنج و کۆچ/ گەنج و کتێب/ گەنج و مەعریفە/ گەنج و پرۆسەی خوێندن/ گەنج و زانکۆ/ گەنج و جیهانگیری/ گەنج و توندوتیژی/ گەنج و تیرۆر/ گەنج و سەنتەر و ڕێکخراوەکانیان/ گەنج و بێکاری.

**١٨- نەخوێندەواری لە زانکۆدا- دەربارەی گەنج و زانکۆ و شتی تریش**

نووسین: هێمن خورشید
لەبڵاوکراوەکای کتێبخانەی هەورامان
چاپ.: یەکەم، چ.: ؟، ش.: ؟، ژ.س.: ١٧٩٨، س.: ٢٠٠٩، ل.:٢٧٣، پ.:١٤×٢٢

ناوەرۆک: پێشەکی/ هەندێ کورتە بابەتی وەک: لە گرفتەکانی زانکۆ/ ئەو بڵاوکراوانەی زمانحاڵی زانکۆن چیمان پێ دەڵێن؟/ بێدەنگیی خوێندکار لە زانکۆدا/ دیکتاتۆریەتی مامۆستا لە زانکۆدا/ لەبارەی خۆویستییەوە/ کچانی زانکۆ و وەهم/ هەرەسهێنانی پرۆسەی هاوسەرگیری لە زانکۆدا/ کێشەی ئایدۆلۆژی/ کۆلێژی پزیشکی.../ ئیسلامییەکان لە بەردەم پرسی گەندەڵیدا/ هەڵوێستەیەک لەسەر هەڵوێستەی یەکێتیی زانایان/ بە کێ دەوترێت گەنج؟/ شاری کەلار/ ناحیەی ڕزگاری/ بەرنامەی بۆ گەنجان/ گەنجانی کەلار و ڕاگەیاندن/ دەرەنجام... ناوەرۆک.

**١٩- گەنج و سەرکردایەتی**

ئامادەکردن و بڵاوکردنەوە: دەزگای واڵا بۆ ڕاگەیاندن و بڵاوکردنەوە

چاپ: یەکەم، چ: ڕوون، ش: سلێمانی، ژ.س: ١٤٢٢، س: ٢٠١٠، ل:٨٨، پ: ١٤×٢٠

ناوەرۆک: پێشەکی: دەزگای والا/ مەبەست لاوە یان نوێبوونەوە؟: ئاریز عەبدوڵلا/ ڕێم پێ بدە تۆ پیر نیت گەنجی دوێنێیت (سەرکردایەتی توانای بزواندنی خەڵکە ڕووەو ئامانج): حەمەزیاد مەولوود/ سەرکردە گەنجەکانی داهاتوو کێن؟: سۆران عەلی/ بەرەو سێیەمین کۆنگرێسی یەکێتیی دەبێت گەنج مەرجی بۆچوونە سەرکردایەتی هەبێت: لەتیف حسێن/ گەنج سەرکردایەتی...: خەڵەف غەفوور/ گەنج پەیامی کۆنگرە: د.بەختیار جەبار شاوەیس/ گەنج یان ئەقلیەتی گەنجانە کامیان پێویستن؟: عەدنان سەید حسێن/ یەکێتییەک لە گەنج: ئەدیبە عوسمان بالیسانی/ یەکێتی هەوێنێکی گەنجانە بۆ داهاتووی: ژیوار ڕەسوولی.

**٢٠- گەنجلاو- نەوەی دوای ڕاپەڕین لە تەوەرێکی گفتوگۆیی ڕۆژنامەوانیدا**

ئامادەکردن: زانیار سەردار قرگەیی

چاپ: یەکەم، چ: بابان، ش: سلێمانی، ژ.س: ١٦٧٧، س: ٢٠١٠، ل:١٧٠، پ: ١٧×٢٣

ناوەرۆک: نەوەی دوای ڕاپەڕین/ ونبوونی ئەرک و ماف- پەراوێزگرتنی لاوانی فراوانتر کردووە/ گفتوگۆ لەگەڵ: د.نەرمین مەعرووف غەفوور/ پ.د.محەمەد ڕەئووف سەعید/ د.کەیوان ئازاد ئەنوەر/ هەڤاڵ ئەبوبەکر/ میقداد شاسواری/ د.کەریم شەریف قەرەچەتانی/ شەماڵ نووری/ یوسف عوسمان حەمەد/ محەمەدئەمین میراودەلی/ زریان حاجی/ یونس عەلی ئەحمەد/ نووسەر لە چەند دێڕێکدا.

**٢١- مامەڵەی خێزان و قۆناغی هەرزەکاریی- توێژینەوەیەکی سۆسیۆلۆژی مەیدانیە**

ئامادەکردن: لەیلا عەبدوڵلا محەمەدو چۆمان ئەحمەد سەلیم

سەرپەرشتیار: ڕزگار مستەفا غەفوور

لە بڵاوکراوەکانی یەکێتیی ژنانی کوردستان

چاپ: یەکەم، چ: تەوار، ش: سلێمانی، ژ.س: ١٧١٢، س: ٢٠١٠، ل:٩٦، پ: ١٦×٢٢

ناوەرۆک: پێڕستی بابەتەکان/ پێڕستی خشتەکان/ پێشەکی/ دەروازەی یەکەم: لایەنی تیۆری/ بەشی یەکەم: چوارچێوەی گشتیی توێژینەوەکە/ بەشی دووەم: کورتە باسێک لەسەر خێزان و قۆناغی هەرزەکاری/ بەشی سێیەم: هەنگاوە پراکتیکییەکانی توێژینەوەکە/ خستنەڕووی ئەنجامی خشتەکان و شیکردنەوەیان/ ئەنجام و دەرەنجامی گریمانە و ڕاسپاردەکان/ سەرچاوەکان/ پاشکۆکان.

## دووەم: پێڕستکاری

**١- کوردایەتی و هەڵوێست- بەرگی یەکەم**

نووسین: بەهرۆز گەلالی

چاپ: یەکەم، چ: و- پەروەردە، ش: هەولێر، ژ.س: ١٣٧، س: ١٩٩٦، ل: ٢٤٥، پ: ١٤×٢٠

ناوەرۆک: بۆ گەنج و لاوەکانمان چیمان پێیە؟

**٢- هەفتەنامەی ((گۆڤار))**

نووسین: تاریق جامباز

لە بڵاوکراوەکانی وەزارەتی ڕۆشنبیری

چاپ: یەکەم، چ: و-ڕۆشنبیری، ش: هەولێر، ژ.س: ٣٩، س: ١٩٩٨، ل: ٤٤، پ: ١٦×٢٣

ناوەرۆک: گۆڤار- ساڵی یەکەم ژمارە T- حەفتەنامەیەکی سیاسیی ئیجتماعی سڕی کوردییە هەموو گەنجەکانی هەولێر یاریدەی نووسین و بڵاوکردنی ئەکەن/ لەسەر پرسیاری گۆڤارەوە: گەنجی کورد لەم دەمەدا ئەبێ چۆن بێ؟

**٣- نزار- گۆڤارێکی حەفتەیی سیاسی کوردی و عەرەبییە- مجلة أسبوعية سياسية جامعة باللغتين العربية والكردية (١٩٤٨/٣/٣٠- ١٩٤٩/٢/١٥)**

ئامادەکردن: ڕەفیق ساڵح

لێکۆڵینەوە و پێڕستکاری: سدیق ساڵح

لە بڵاوکراوەکانی دەزگای چاپ و پەخشی سەردەم

چاپ: یەکەم، چ: سەردەم- تیشک، ش: سلێمانی، ژ.س: ١٥١، س: ٢٠٠٠، ل: ؟، پ: ٢٢×٢٩

ناوەرۆک: ژمارە١١: خیانەتی گەنجەکانمان.

**٤- ڕاپۆرتی گشتیی بۆ کۆنگرەی دووەمی یەکێتیی نیشتمانیی کوردستان**

نووسین: مام جەلال تاڵەبانی

لە بڵاوکراوەکانی دەزگای ناوەندی ڕاگەیاندنی (ی.ن.ک)

چاپ: ؟، چ: ڕاگەیاندنی (ی.ن.ک)، ش: سلێمانی، ژ.س: ؟، س: ٢٠٠١، ل: ١٢٣، پ: ١٥×٢٠

ناوەرۆک: هەندێ کۆچ بۆ دەرەوەی وڵات بەتایبەتی هی گەنج و کادیری زانستی.

**٥- ئازادکردنی مێژوو- لێکۆڵینەوە لەسەر کێشەی ژنان**

نووسین: مەهاباد قەرەداغی

لە بڵاوکراوەکانی دەزگای چاپ و پەخشی سەردەم

چاپ: یەکەم، چ: سەردەم، ش: سلێمانی، ژ.س: ١٦٦، س: ٢٠٠٢، ل: ٢٠٣، پ: ١٧×٢٤

ناوەرۆک: بەشی شەشەم: کێشەکانی هەرزەکاری لە کۆمەڵگەی کورددا/ کێشەی هەرزەکاری کورد/ ئابلۆقەکانی کچی هەرزەکار/ ئابلۆقەکانی کوڕی هەرزەکار.

**٦- رابەری ڕۆژنامەگەریی نهێنی کوردی ١٩٢٣-١٩٦٠**

ئامادەکردن: نەوزاد عەلی ئەحمەد
لە بڵاوکراوەکانی وەزارەتی ڕۆشنبیری- بەڕێوەبەرایەتیی گشتیی چاپ و بڵاوکردنەوە
چاپ: یەکەم، چ: و-ڕۆشنبیری، ش: سلێمانی، ژ.س: ٤٨١، س: ٢٠٠٤، ل: ٦٤، پ: ١٢×٢٠
ناوەرۆک: گەنجان.

**٧- لە شنروێ وە بۆ ستۆکهۆڵم- چەند لاپەڕەیەک لە بیرەوەرییەکانم لە شۆڕشی ئەیلوولدا- بەرگی یەکەم**

نووسین: حەمەی فەرەج هەڵەبجەیی
لە بڵاوکراوەکانی وەزارەتی ڕۆشنبیری- بەڕێوەبەرایەتیی گشتیی چاپ و بڵاوکردنەوەی سلێمانی
چاپ: دووەم، چ: ؟، ش: سلێمانی، ژ.س: ١٨٠، س: ٢٠٠٤، ل: ٣٥٢، پ: ١٦×٢٢
ناوەرۆک: ناوەرۆکی بەرگی یەکەم/ گرووپی گەنجانی هەڵەبجە.
تێبینی: ناوەرۆکی چاپی دووەم لەگەڵ چاپی یەکەمدا جیاوازە.

**٨- پرس و ڕا - گفتوگۆ- بەرگی یەکەم**

**نووسین: شازاد ئەنوەر**

لە بڵاوکراوەکانی ڕادیۆی دەنگی کوردستان
چاپ: یەکەم، چ: و-ڕۆشنبیری، ش: هەولێر، ژ.س: ٦٤٦، س: ٢٠٠٥، ل: ٣١٨، پ: ١٦×٢٢
ناوەرۆک: ڕەوشی نوێ و دەوری گەنجان: محەمەد مەلا قادر.

**٩- حزبی هیوا لە لیوای هەولێر**

نووسین: تاریق جامباز
لە بڵاوکراوەکانی گۆڤاری یاساپارێزی
چاپ: یەکەم، چ: شەهاب، ش: هەولێر، ژ.س: ٤١١، س: ٢٠٠٥، ل: ١٢٦، پ: ١٤×٢٠
ناوەرۆک: هوشیاریی نەتەوایەتیی گەنجانی هەولێر لە کۆتایی سییەکان و ناوەڕاستی چلەکان لەنێو حیزبی هیوادا.

**١٠- ڕوناهی- کۆڤارەکا کوردی بوو د ناڤبەرا ١٩٦٠-١٩٦٢ێ دا ل بەغدا دەرکەتییە**

نووسین: حافیز قازی
لە بڵاوکراوەکانی دەزگای چاپ و بڵاوکردنەوەی سپیرێز
چاپ: دووەم، چ: و-پەروەردە، ش: هەولێر، ژ.س: ٥٩، س: ٢٠٠٥، ل: ؟ ، پ: ١٦×٢٣
ناوەرۆک: ڕوناهی ژ.٣ س.١: فرمانا ١ گەنجیت هشیار دڤی قوناغیدا: د.سدیق ئەترووشی.
تێبین: بۆ نۆبەتی چاپ، نووسراوە دووەم، کە پێموایە چاپی گۆڤارەکەیان بە (چاپی یەکەم) داناوە. بە سوپاسەوە، پرسیارم لە (ئیسماعیل بادی)یش کرد، ئەویش هەر

پێی وابوو... ئەم گۆڤارە جارێکی تر، لە لایەن بنکەی ژینەوە (ساڵی ٢٠١٤) چاپ کراوەتەوە.

**١١- کۆمەڵگەی ژنسالاری- ڕەخنە لە کەلتوور و کۆمەڵگە**

نووسین: حەمەی ئەحمەد ڕەسووڵ
چاپ: یەکەم، چ: چوارچرا، ش: سلێمانی، ژ.س: ٧٩٢، س: ٢٠٠٥، ل:٢٣٣، پ:١٣×٢٠
ناوەڕۆک: گفتوگۆ: گەنجی کورد و شوناس.

**١٢- کۆمەڵگا و شێواوی**

نووسین: زیرەک عەبدوڵڵا
بە هاوکاریی وەزارەتی ڕۆشنبیی چاپکراوە
چاپ: یەکەم، چ: ؟، ش: کوردستان، ژ.س: ١٠٠٣، س: ٢٠٠٥، ل:٣٤٢، پ:١٦×٢٢
ناوەڕۆک: بەشی دووەم: سۆسیۆلۆژیا (ئافرەت- گەنج- منداڵ)/ بەهارێک بۆ گەنج بەهارێک بۆ دەسەڵات.

**١٣- ئێمە زۆر قسە دەکەین ئێمە زۆر ئازاین**

نووسین: ڕەسووڵ بەختیار
لە بڵاوکراوەکانی دەزگای چاپ و بڵاوکردنەوەی بەدرخان
چاپ: یەکەم، چ: هاوسەر، ش: هەولێر، ژ.س: ٦٢٣، س: ٢٠٠٦، ل:٦٨، پ:١٥×٢٢
ناوەڕۆک: گەنجەکان لە نێوان وڕێنە و ڕاستیدا.

**١٤- دیموکراسی و کۆمەڵ**

نووسین: سیروان ژاژڵەیی
لە بڵاوکراوەکانی بەشی ڕاگەیاندن و ڕووناکبیریی مەڵبەندی یەکی ڕێکخستنی سلێمانیی (ی.ن.ک)
چاپ: یەکەم، چ: بینایی، ش: سلێمانی، ژ.س: ؟، س: ٢٠٠٦، ل:١٠٨، پ:١٧×٢١
ناوەڕۆک: گەنج و چەمکەکانی سەردەم/ گەنج و یەکێتی و نوێبوونەوە.

**١٥- کورد و ڕۆژهەڵاتی ناوەڕاست لە بەردەم گۆڕانکاری گەورە و کتوپڕدا**

نووسین: نەوزاد عوسمان (نەوزادی موهەندیس)
چاپ: یەکەم، چ: شڤان، ش: سلێمانی، ژ.س: ٩٣٢، س: ٢٠٠٦، ل:٥٩٨، پ:١٥×٢٠
ناوەڕۆک: خولیا و ئەندێشەکانی گەنج.

**١٦- لە نێوان هەست و نەستدا**

نووسین: سابیر بۆکانی
لە بڵاوکراوەکانی چاپخانەی ڕەنج
چاپ: یەکەم، چ: ڕەنج، ش: سلێمانی، ژ.س: ٢٥٥، س: ٢٠٠٦، ل:١٧٤، پ:١٥×٢٢
ناوەڕۆک: سایکۆلۆژیای گەنج و شیعر.

**١٧- خەڵک و دەسەڵات**

نووسین: جەبار سابیر

چاپ: یەکەم، چ: یاد، ش: سلێمانی، ژ.س: ٢٨٠، س: ٢٠٠٧، ل: ١٣٠، پ: ١٤×٢٠

ناوەرۆک: خەمەکانی گەنج.

**١٨- لە هاوڵاتیانەوە بۆ دەسەڵات**

ئامادەکردن و بڵاوکردنەوە: پەیمانگای کوردستان بۆ پرسە سیاسییەکان KIPI

چاپ: یەکەم، چ: موکریانی، ش: هەولێر، ژ.س: ١٤١١، س: ٢٠٠٧، ل: ١٠٣، پ: ١٧×٢٤

ناوەرۆک: خوێندنەوەی م.ئاهەنگ خالید بۆ دەرەنجامی ڕاپرسی لەبارەی تێڕوانینی گەنجان بۆ دیاردەی گەندەڵی.

**١٩- بانێژە- ڕوانینێکی نوێ بۆ کۆمەڵگا**

**نووسین: مەهاباد سەلام**

لە بڵاوکراوەکانی ڕادیۆی دەنگی گەلی کوردستان

چاپ: یەکەم، چ: موکریانی، ش: هەولێر، ژ.س: ١٩٠٣، س: ٢٠٠٨، ل: ٣٣٥، پ: ١٦×٢٣

ناوەرۆک: خەمەکانی قەیرەکچ/ کەسایەتیی هەرزەکار.

**٢٠- چەند لێکۆڵینەوەیەک و بابەتی دەروونزانی**

نووسین: جەلال خەڵەف ژاژڵەیی

لە بڵاوکراوەکانی وەزارەتی ڕۆشنبیری- بەڕێوەبەرێتیی چاپ و بڵاوکردنەوەی سلێمانی

چاپ: یەکەم، چ: شڤان، ش: سلێمانی، ژ.س: ٥٠٩، س: ٢٠٠٨، ل: ٢٨٤، پ: ٢١×٢٩

ناوەرۆک: پێناسەکردنی وشەی هەرزەکار/ ئاشکراترین نیشانەکانی لابەلابوونەوە لە خوێندنگەدا/ نموونەی لێکۆڵینەوەکە/ بەراوردکردنی لابەلابوونەوە پێش و دوای ڕووخانی گوندەکان/ لابەلابوونەوەی کوشتن پێش ڕووخان و داوی ڕووخاندنی گوندەکان/ چارەسەر و پاراستنی هەرزەکار لە لابەلابوونەوە.

**٢١- خوێندنەوەی کۆمەڵگەی کوردی- دوای ڕاپەڕین**

نووسین: حەمەی ئەحمەد ڕەسووڵ

لە بڵاوکراوەکانی وەزارەتی ڕۆشنبیری- بەڕێوەبەرێتیی گشتیی چاپ و بڵاوکردنەوە

چاپ: یەکەم، چ: ڕۆمان، ش: سلێمانی، ژ.س: ٢٥٣٦، س: ٢٠٠٨، ل: ٢٢٢، پ: ١٦×٢١

ناوەرۆک: هەرزەکاران/ بەشی دووەم: توێژی گەنجان و دیاردەی کۆمەڵایەتی/ خۆشەویستی و هاوسەرگیری لە نێو توێژی گەنجاندا/ سێکس و چەپاندنی لاوان.

**٢٢- خود.. نووسینەوە- دیدار و وتار**

نووسین: ئەنوەری ڕەشی عەولا

لە بڵاوکراوەکانی دەزگای چاپ و

بڵاوکردنەوەی ئاراس
چاپ: یەکەم، چ: ئاراس، ش: هەولێر، ژ.س: ١٧٦، س: ٢٠٠٨، ل: ١٧٥، پ: ١٧×٢٣
ناوەرۆک: ماف و ئەرکی گەنج.

**٢٣- دەریایەک لە وشە- دیدار لەگەڵ مەهاباد قەرەداغی**

ئامادەکردن: خالید عەبدولکەریم حەمەلاو
لە بڵاوکراوەکانی یانەی قەڵەم
چاپ: یەکەم، چ: یاد، ش: سلێمانی، ژ.س: ٦٥٢، س: ٢٠٠٨، ل: ٢٢١، پ: ١٥×٢٠
ناوەرۆک: گەنج لە نێو هاوکێشەکانی ژیاندا.

**٢٤- وەرچەرخان لە بیرکردنەوە دابڕان لە ستەمگەریی**

نووسین: هەندرێن
لە بڵاوکراوەکانی وەزارەتی ڕۆشنبیری- بەڕێوەبەرایەتیی چاپ و بڵاوکردنەوەی سلێمانی
چاپ: ؟، چ: پەیوەند، ش: سلێمانی، ژ.س: ٢٠٦٥، س: ٢٠٠٨، ل: ٣٤٠، پ: ١٦×٢٣
ناوەرۆک: گەنجان و حکوومەتی حیزبرانی کوردی.

**٢٥- ئاستەنگەکانی بەردەم هونەری گۆرانیی و میوزیکی کوردی**

نووسین: دیاری قەرەداغی
لە بڵاوکراوەکانی وەزارەتی ڕۆشنبیری- بەڕێوەبەرێتیی چاپ و بڵاوکردنەوەی سلێمانی
چاپ: یەکەم، چ: کەمال، ش: سلێمانی، ژ.س: ٢٤٤٤، س: ٢٠٠٩، ل: ٢٧٠، پ: ١٤×٢٠
ناوەرۆک: ئەستێرە گەنجەکانی کورد.

**٢٦- ئینسکلۆپیدیای هەولێر- مێژووی هاوچەرخ٤**

ئامادەکردن: لیژنەی باڵای ئینسکلۆپیدیا (د.عەبدوڵڵا عەلیاوەیی، د.مەولوود ئیبراهیم حەسەن، فەرید ئەسەسەرد، د.ئومێد جۆزەلی، حەمید ئەبوبەکر بەدرخان)
لە بڵاوکراوەکانی دەزگای چاپ و بڵاوکردنەوەی بەدرخان
لەسەر ئەرکی (کۆسرەت ڕەسوڵ) چاپکراوە.
چاپ: یەکەم، چ: گرین گالۆری، ش: لوبنان، ژ.س: ١٨٣٢، س: ٢٠٠٩، ل: ١٤٧٦-١٩٢٠، پ: ٢٠×٢٨
ناوەرۆک: گەنجانی هەولێر و حیزبی هیوا: تاریق جامباز.
ئەم پرۆژەیە کۆدی ISBN: ٩٧٨-٩١-٩٧٧٤١٩-٠-٣ بۆ وەرگیراوە.
لە بەرگی دەیەمدا، ناوەرۆکی بۆ ئامادەکراوە.

**٢٧- بگەڕێنەوە بۆ ژیان- چیرۆک و وتار**
**نووسین: گۆڤەند ئەحمەد حەمەلاو**

لە بڵاوکراوەکانی بزاڤی ڕۆشنبیریی نوێخواز

چاپ: یەکەم، چ: چوارچرا، ش: سلێمانی، ژ.س: ١٢٨٢، س: ٢٠٠٩، ل:٦٢، پ:١٤×٢٠
ناوەرۆک: چەند ڕێنماییەک بۆ گەنجان و ئاگاهێنانەوەیان لە ڕاستی ژیان.

**٢٨- ڕوانین بۆ ئاینده- کۆمەڵە وتار**
نووسین: ڕەئووف محەمەدئالانی
لە بڵاوکراوەکانی سەنتەری ڕاپرسیی کوردستان- کۆمپانیای وشە
چاپ: یەکەم، چ: گەنج، ش: سلێمانی، ژ.س: ١١٢٠، س: ٢٠٠٩، ل:٨٦، پ:١٥×٢٠
ناوەرۆک: گەنج و خەونی دیموکراتی و حیزبی کوردی.

**٢٩- ژن و کێشەکانی- کۆمەڵە وتار**
نووسین: ئەکرەم قەرەداغی
لە بڵاوکراوەکانی یەکێتیی ژنانی کوردستان
چاپ: یەکەم، چ: تەوار، ش: سلێمانی، ژ.س: ١٨٢٣، س: ٢٠٠٩، ل:١٦٥، پ:١٤×٢٠
ناوەرۆک: کچە هەرزەکاری کورد.

**٣٠- ژنێک تەڕتر لە باران- گۆشەنیگای ڕۆژنامەنووسی**
نووسین: نەجات ڕوستی
لە بڵاوکراوەکانی بزاڤی ڕۆشنبیریی نوێخواز
چاپ: یەکەم، چ: بزاڤ، ش: سلێمانی، ژ.س: ٢٤٩٥، س: ٢٠٠٩؟، ل:٩٠، پ:١٤×٢٠
ناوەرۆک: ژن و هەرزەکار.

**٣١- سایکۆلۆژیای منداڵ**
نووسین: شالاو جەعفەر
لە بڵاوکراوەکانی وەزارەتی ڕۆشنبیری- بەڕێوەبەرێتیی چاپ و بڵاوکردنەوەی سلێمانی
چاپ: یەکەم، چ: ڕۆمان، ش: سلێمانی، ژ.س: ١٣٤٤، س: ٢٠٠٩، ل:١٠٤، پ:١٥×٢٠
ناوەرۆک: منداڵ لە قۆناغی هەرزەکاریدا.

**٣٢- فانتازیای داخراو- ڕەخنە و توێژینەوە**
نووسین: تەها ئەحمەد ڕەسووڵ
لە بڵاوکراوەکانی وەزارەتی ڕۆشنبیری- بەڕێوەبەرێتیی چاپ و بڵاوکردنەوەی سلێمانی
چاپ: یەکەم، چ: کارۆ، ش: سلێمانی، ژ.س: ٢٤٣٨، س: ٢٠٠٩، ل:٢١٢، پ:١٥×٢١
ناوەرۆک: میلۆدی شیعری گەنجان و ڕیتمی شپرزەی ژیان.

**٣٣- ڕۆژنامەوانیی کوردی- گۆڤاری هیوا ١٩٥٧-١٩٦٣ بەرگی سێیەم**
لێکۆڵینەوە و ئامادەکردن: د.هیمداد حسێن
لە بڵاوکراوەکانی دەزگای چاپ و

بڵاوکردنەوەی ئاراس
چاپ: یەکەم، چ: ئاراس، ش: هەولێر، ژ.س: ٧٥٥، س: ٢٠١٠، ل:٦٨٤، پ:٢٣×١٧
ناوەڕۆک: ژ٥ی س٢ ١٩٥٨: ئاهەنگەکەی گەنجانی کوردستان لە هۆڵی گەل لە بەغدا.

**٣٤- زمان ئاسۆیەکە لە نێوان ئاسمان و زەویدا**
نووسین: هەندرێن
لە بڵاوکراوەکانی وەزارەتی ڕۆشنبیری-بەڕێوەبەرێتیی چاپ و بڵاوکردنەوەی سلێمانی
چاپ: یەکەم، چ: بابان، ش: سلێمانی، ژ.س: ١٢١٣، س: ٢٠١٠، ل:٢٤٢، پ:٢٠×١٥
ناوەڕۆک: شیعری گەنج-بوونێکی سەرنجڕاکێشە نەک خۆکردنەوە بە سەرنجکێش.

**٣٥- لە ناو گێژاوی سیاسەتدا- مێزگرد و گفتوگۆ**
نووسین: ئیسماعیل کوردە
لە بڵاوکراوەکانی سەنتەری لێکۆڵینەوەی فیکریی و ئەدەبیی نما
چاپ: یەکەم، چ: شەهاب، ش: هەولێر، ژ.س: ؟، س: ٢٠١٠، ل:١٠٨، پ:٢٠×١٥
ناوەڕۆک: گەنج لە نێو هاوکێشەکانی ژیاندا.

## کتێبی بێ ساڵ

**٣٦- دیموکراتیزەکردن و حوکمڕانیی چاک**
نووسین: هەڵکەوت عەبدوڵڵا
لە بڵاوکراوەکانی خەندان بۆ پەخش و وەشاندن
چاپ: یەکەم، چ: شڤان، ش: سلێمانی، ژ.س: ؟، س: ؟، ل:١٦٣، پ:١٩×١٤
ناوەڕۆک: دەروازەیەک بۆ مەسەلەی گەنجان/ لە گەنجەوە بۆ گەنج.

زانایەکی خەڵکی سلێمانی، باڵایەکی مامناوەندی، ڕەنگی چاوی لە نێوان زەرد و قاوەیی، ڕیشێکی ڕەشی قەترانی هەبووە. شوێنی نیشتەجێبوونی گەڕەکی کانی ئەسکان بووە و جۆری خانووەکەیشی شێوەی خانووی بیانییەکان بووە کە ژمارەی خانووەکەی ١٢٧ بووە. ئەو کاتە تەمەنی ٢٩ ساڵ بووە و تازە ببووە قازیی. بەم شێوەیە لە دۆسیەکەیدا لە جیاتی وێنە، وەسفی کراوە. ئەم زانایەمان یەکێکە لەو زاتانەی چەند کتێبێکی نووسیوە، بەڵام لەنێو سەرچاوەکانی تایبەت بە زانایانی کورد باسی خۆی و کتێبەکانی نەهاتووە. لەنێو ئەرشیڤی عوسمانیدا و لە دۆسیەیەکی ٣٠ لاپەڕەییدا بە درێژی باسی هاتووە، وەها خۆی ناساندووە:

ناوم عەبدوڵڵایە و باوکم ناوی عەبدولڕەحمان ئەفەندییە کە یەکێکە لە زانا گەورە و ناسراوەکان و لە بەرەبابی مەلا ئیبراهیمی قزلجەییە. لە ٤ی مانگی ڕەبیعولئەوەلی ساڵی ١٢٧٤ی کۆچی (١٨٥٧/١٠/٢٣زاینی) لە قەسەبەی سلێمانی لەدایکبووم. سەردەمی منداڵیم هەر لە شاری سلێمانی بووە و سەرەتا وەک هەر منداڵێکی تر دەستم بە خوێندن کردووە و پاشان لای زانا بەرزەکانی شارەکە دەرسەکانی (نەحوو، سەرف، مەنتق، بەلاغە، مونازەرە، ئوسولی فیقھ ، حیکمەت، ماتماتیک، عیلمی کەلام و فنون آلیە)م خوێندوون و تەواو کردوون. زمانەکانی عەرەبی، تورکی، فارسی و کوردی بە قسەکردن و نووسین دەزانم.

**بەرهەمەکانی:**

ئەوەی جێی سەرنجە ناوبراو لەلایەنی نووسینەوە خاوەنی چەند بەرهەمێکە، هەر وەک خۆی ئاماژەی پێداوە: لە زانستەکانی حیکمەت و کەلامدا ئەم سێ بەرهەمەم نووسیون:

١-معطى الهداية المؤلف لوالى الولاية.

٢- الدر النضيد فى مسئلة التوحيد.

٣-الدر المعقول فى اجوبة المسائل المجهول.

٤-ریسالەیەکی کورت لە بابەتی هەڵسانەوە لە سوجدە و ڕکوعدا لەسەر توحفەی ئیبن حەجەر.

٥-نووسراوی تری پرش و بڵاو، وەک خۆی ئاماژەی پێداوە: هەروەها زۆر نووسراوی تر و تەعلیقاتم هەن، کە تا ئێستا نەمتوانیوە مۆڵەتی چاپیان بۆ وەربگرم.

ئاستی خوێندن:

ناوبراو لە قوتابخانەی ڕەسمیی دەوڵەت نەیخوێندووە و بڕوانامەی لەو بارەوە نییە، دوای ئەوەی لە سلێمانیی خوێندن تەواو دەکات، دەچێتە لای زانای بەناوبانگی کورد و

موفتیی شاری بەغدا مەلا محەمەدی موفتی زەهاویی لە بەغدا و لەوێ ئیجازەی زانستیی وەردەگرێت. لەگەڵ ئەوەشدا وەک خۆی ئاماژەی پێداوە لە ویلایەتی بەغدا، لە نیابەتی شەرعییەی سامەڕا و کوت الامارة دا نووسراوی بابی عالی و مەشیخەتی ئیسلامی هەیە وەک پشتگیریی لە زانابوونەکەی.

دوای وەرگرتنی ئیجازەی زانستی، لە تەمەنی ٢٧ ساڵیدا هەر لە بەغدا لە مەکتەبی ڕوشدییەی عەسکەریی بە مووچەی سێسەد قڕووش بووەتە مامۆستای زمانی فارسی. دوای ئەوەی کەوا لە تاقیکردنەوە دەرچووە و هەر لە ویلایەتی بەغداد بووەتە قازیی شەرعیی قەزای سامەڕا بە مووچەی ٥٠٠ قڕووش.

سەفەری بۆ ئەستەنبوڵ و بوونی بە قازیی:

لە ١٥ی جەمادی یەکەمی ١٣٠٣ی کۆچی (١٨٨٦/٢/١٩ز) وازی لە مامۆستایەتی هێنا و چووەتە ئەستەنبوڵ و لەوێ تاقیکردنەوەی ئەنجومەنی هەڵبژاردنی دادوەرەکانی کرد و لە ١ی شەعبانی ساڵی ١٣٠٧ی کۆچی (١٨٩٠/٣/٢٣ز) لە قەزای (کوت الامارە) بە مووچەی ٧٥٠ قڕووش بە قازیی دامەزراوە. خەرجیی ڕێگا و کرێ و شتی تری وەرنەگرتووە و ڕوتبە و نیشانیشی پێ خەڵات نەکراوە.

لەبارەی دڵسۆزیی لە کارەکەی ئاماژەی بەوە داوە؛ کە بە فەزڵی خوا و لە سایەی تاجداریی خەلافەتەوە بەهۆی هیچ هۆکارێکەوە لە کار دانەبڕاوم و لە دوو شوێنان قازییەتیم کردووە و پێنج ساڵ و دوو مانگ قازیایەتی و چەند ساڵێکیش وەکیلی قائیمقام بووم، تا ئێستاش هیچ شکایەتێکم لێ نەکراوە و هیچ جاریش سزا نەدراوم.

هەر لە نێو دۆسیەکەدا ئیجازەنامەی موفتی زەهاوی تێدایە کە بۆ مەلا عەبدوڵڵای قزلجی نووسیوە و تێیدا ناوی خۆی بە افقر الموالی الی الله الغنی المتعالی محمد المفتی بمدینة السلام بغداد الشهیر بالزهاوی ابن الکامل الملا احمد الخالدی عفا الله عنهما بلطفه الصمدی.... ناوی مەلا عەبدوڵڵایشی لە ئیجازەنامەکەدا بەم شێوەیە هێناوە: اعنی به العالم الفاضل والادیب الکامل ذا النسب الفاخر والحسب الظاهر الملا عبد الله افندی ابن الملا عبد الرحمن القزلجی...

جێی باسە هیچ زانیارییەکی ترمان لەنێو ئەو دۆسیەیەدا لەبارەی ئەم مەلا عەبدوڵڵای قزلجییە و بەرهەمەکانی دەستنەکەوت، بەڵام لە سیجیللی ڕەسمی فەرمانبەرانی دەوڵەتی عوسمانیدا، لاپەڕەیەک لەبارەی ژیاننامەی ناوبراو نووسراوە، کە هەندێ زانیاریی تری تێدایە بەتایبەتی لە دوای ئەو مێژووەوە، کە بریتین لەمانەی خوارەوە:

لە (١٨٩٢/١٠/١٥ز) ٢٣ی مانگی ڕەبیعی یەکەمی ١٣١٠ی کۆچی بە مووچەی هەزار

قڕووش بۆتە فەرمانبەری فەرمانگەی ئەملاکی هومایۆن لە تاش ی سەر بە بەغدا.

لە (١٨٩٥/١١/٢٤ز) ٦ی مانگی جەمادی ئاخیرەی ١٣١٣ی کۆچی بە مووچەی ١٢٠٠ قڕووش لە قەزای مەحموودیە دامەزراوە.

لە (١٨٩٧/١٢/١٩ز) ٢٤ی مانگی ڕەجەبی ١٣١٥ی کۆچیش بە مووچەی ١٠٦٠ قڕووش لە موسەییەب دامەزراوە.

لە (١٨٩٩/٥/١٨ز) ٧ی مانگی موحەڕەمی ١٣١٧ی کۆچی بە موچەی ١٢٠٠ قرووش لە جربوعیە و لە ٥ی ڕەمەزانی هەمان ساڵدا گوازراوەتەوە جەبارە.

لە (١٩٠١/١١/١٤ز) ٢ی شەعبانی ١٣١٩ی کۆچی لەسەر بنەمای یەکێک لە ماددەکانی کوشتن لە کار دوورخراوەتەوە و لە ٣ی شەووالی هەمان ساڵدا بەڕائەتی سەلمێنراوە و گەڕاوەتەوە سەر کارەکەی خۆی. لە ٣ی زولقەعیدەی هەمان ساڵ بۆ فەرمانگەی جەبەل گوازراوەتەوە.

نووسراوەکە کە هەموو زانیارییەکانی لەبارەی پلەکانی فەرمانبەریی ناوبراو تێدایە، ڕێکەوتی ١٤ی زولقەعیدەی ١٣٢٥ی کۆچی لەسەر نووسراوە. کە دەکاتە بەرامبەر ١٩٠٧/١٢/١٩ی میلادی. واتە تا ئەو مێژووە ناوبراو لە ژیاندا بووە و تەمەنی پەنجا ساڵ بووە. ئیدی لەوە بەدوا هیچ بەڵگەنامەیەکی دیکەمان نەدۆزییەوە کە بزانین دوا ساڵەکانی تەمەنی لە کوێ بووە و کەی و لە چ شوێنێک کۆچی دوایی کردووە!

ئەمەی سەرەوە نموونەی دەنکێکە لە خەرمانی زانا ناوونبووەکانی کورد، کە بەهۆی ئەوەی پلە و پایەی کارگێڕیی هەبووە گەیشتووین بەناوی بەرهەمەکانی، دەیان و سەدان زانای ترمان هەبوون لە حوجرە و مەدرەسەکانیان کتێبیان نووسیون و کەس پێی نەزانیون و کەوتوونەتە بەر بای فەوتان و لەناوچوون. بە ئومێدی دۆزینەوەیان و تۆمارکردنیان لەنێو مێژووی زانا و کەسایەتییەکانی کورددا.



**محەمەد گەلاڵەیی**

**مامۆستا لە بەشی مێژووی فاکەڵتیی ئاداب لە زانکۆی سۆران**

# ڕەوشی زانایان و شێخانی تەریقەت لە قەزای ڕواندز لە ١٨٥٧-١٩١٦ز بەپێی بەڵگەنامەکانی عوسمانی

**پێشەکی:**

ڕێبازەکانی سۆفیگەریی و شێخەکانیان و زانایانی ئاینی ئیسلام ڕۆڵێکی گەورەیان لە بنیاتنانی ئیمپراتۆرییەتی عوسمانییدا هەبووە، دەربار(البلاط)ی عوسمانی لە ژێر کاریگەری ڕۆشنبیریی و مەعریفیی ڕێبازەکانی سۆفیگەری و زانایانی ئاینی لە سەدەی چواردەهەم تا کۆتاییەکانی سەدەی نۆزدەهەمدا بووە، یەکێك لە پایەکانی هەڵبژاردن و شەرعیەتدان بەهەر سوڵتانێکی عوسمانیی دامەزراوەی شێخولئیسلام بوو بەدرێژایی شەش سەدە لە مێژووی ئیمپراتۆرییەتی عوسمانییدا، ئەمەش بە هاوتەریب لەگەڵ دوو پایەکەی تریان کە بریتی بوون لە دایکی سوڵتان و سوپای ئینکیشاری، ئەم ڕۆڵە کاریگەرەی زانایانی ئاینیی لە دیاریکردنی هەڕەمی دەسەڵاتدارییەتی لە سەدەکانی ناوەڕاست بۆ سەردەمی نوێدا ڕەنگدانەوەی ئەرێنی بەسەر ژیان، ڕۆڵ و پێگەی بەهێزبوونی زانایانی ئاینی ئیسلام لەسەرانسەری خاکی ئیمپراتۆرییەتی عوسمانییدا جێکەوتکرد.

هەربۆیە لەم وتارە زانستییەدا؛ ژیان و ڕۆڵی زانایانی ئاینی ئیسلام لە قەزای ڕواندزدا، بەتایبەتی لە نیوەی دووەمی سەدەی نۆزدەهەم تا چارەکی یەکەمی سەدەی بیستەمدا لە بەڵگەنامەکانی عوسمانییدا دەردەکەوێت، کە چۆن خراوەتە بەر باس و لێکۆڵینەوە دامەزراوە تایبەتمەندەکانی ئیمپراتۆرییەتیی عوسمانیی لە ناوەندی قەزای ڕواندز بۆ ناوەندی ویلایەتەکانی بەغداد، مووسڵ و دواتریش ئیستانبۆڵی پایتەختی ئیمپراتۆرییەتی عوسمانییەکان.

شایانی باسە ڕێژەییەکی بەرز لە زانا ئاینییەکانی کوردستانی سەردەمی عوسمانیدا لەنێو ڕێبازەکانی سۆفیگەریدا (تەریقەتەکان)دا ڕۆچۆبوون، لەیەک کاتدا زانای ئاینی و پەیڕەوکاری تەریقەتی نەقشبەندی، قادری و چەشتی..هتد بوونە، ئەمەش بەهۆی ئەوەی زۆرینەی تەریقەتەکانی نێو ئاینی ئیسلامدا دامەزرێنەر و نوێکەرەوەکانیان زانای ئاینی سەردەمی خۆیان بوونە، وەک مەولانا خالیدی نەقشبەندی کە زانایەکی پایەبەرزی ئاینی ئیسلام لە کوردستانی سەردەمی عوسمانیی و دواتر لە سەرانسەری ئیمراتۆرییەتی عوسمانییدا بووە و لەسەردەمی خۆیدا و هەمیش نوێکەرەوەی تەریقەتی نەقشبەندیی بووە لەناوەڕاستی چارەکی یەکەمی سەدەی نۆزدەهەمدا بەتایبەتی لە ماوەی ساڵانی (١٨١١-١٨٢٧ز)دا، ئەوەشمان بیرنەچێت کە زۆرینەی جێنیشین(خەلیفە) و مورید و مەنسوبەکانی مەولانا خالیدی نەقشبەندی (١٧٧٩-١٨٢٧) لە زانایانی ئاینی و خوێندەواران و خەڵکی ڕەشۆکیش بوونە.

لەم چوارچێوەیەشدا یەکێک لە خەسڵەتەکانی نیوەی دووەمی سەدەی نۆزدەهەم و سەرەتای چارەکی یەکەمی سەدەی بیستەمدا دەرکەوتنی کۆمەڵێک زانای نووسەر بوون، کە چەندین کتێبیان لە بواری زانستە پەتی و کردارییەکان، زانستە مرۆڤایەتییەکان و زانستەکانی نێو خوێندنگا ئاینییەکان (زانستە نەقلی و عەقڵییەکان) نووسییووە، زۆرێک لەم زانا نووسەرانە بۆ چاپکردن و پێشکەشکردنی بەرهەمەکانیان بە ناوەندەکانی دەسەڵات سەردانی ئیستانبۆڵ یان کردووە، لەماوەی کۆتایی سەدەی نۆزدەهەمدا جووڵانەوەیەکی سەرانسەری زانایانی ئاینیی لە کوردستانی سەردەمی عوسمانییدا دەستیپێکرد و بەتایبەتیش لە قەزای ڕواندز کە مەڵبەندێکی گەورەی خوێندنگا ئاینییەکانی کوردستانی سەردەمی عوسمانی بووە، بۆیە دەیان و سەدان قوتابخانەی ئاینیی و هەزاران فەقێ هەبوو، کە دەوری زانستە عەقڵی و نەقڵییەکانیان دەکردەوە، ئەمە سەرەڕای ئەوەی کە لە نیوەی دووەمی سەدەی نۆزدەهەم کە دەسەڵاتیی ناوەندێتیی عوسمانی بەتەواویی لە کوردستان جێکەوتبوو زانایانی ئاینیی لە دامەزراوەکانی ئیمپراتۆرییەتی عوسمانی

دامەزرێنران، ئەمە وایکرد کە بۆ هەموو کێشە و گرفتەکانیان ڕوو لە ئیستانبۆڵ بکەن.

شایانی باسە بۆ نووسینی ئەم وتارە زانستییە، سوودمان لەم سەرچاوە سەرەکییە وەرگرتووە، د.نەوزاد یەحیا باجگر(ئامادەکردن و پێشکەشکردن): ڕەواندز لە بەڵگەنامەکانی عوسمانی دا ١٢٦٢-١٣٣٧کۆچی-١٨٤٦-١٩١٩زایینی، وەرگێڕانی: ئاشتی ڕەحمان، بەرگی پانزدە، لە بڵاوکراوەکانی زانکۆی جیهان-خانەی ئەرشیف و بەڵگەنامەکان، چاپخانەی حاجی هاشم، هەولێر، ٢٠٢٢.

لەکۆتاییدا؛ پێویستە ڕوونکردنەوەیەک بۆ خوێنەران و توێژەرانی هێژا بنووسین، کە ناوهێنانی زانایان و نووسەران و شێخانی تەریقەت لە چوارچێوەی کارگێڕی قەزای ڕواندز دایە، نەوەک ئەم زانایانە لەدایکبووی ڕواندز بووبن یان تاکۆتایی ژیانیان لە ڕواندز بووبن، بەڵکو بەشێوەیەکی لە ڕواندزدا ماونەتەوە و دواتر بۆ شوێنی تر ڕۆیشتوون بەهۆی کار و فەرمانبەریان لە ئیمپراتۆرییەتی عوسمانییدا، بۆ نموونە: زانایەکی وەک: ڕەسوول مەحموود مەستی(١٨٢٣-١٩٠٨)، کە لە بنەڕەتدا خەڵکی شارەزوور بووە و لە گوندی سەراوی کوندە لەدایکبووە و لە شاری ئیستانبۆڵ کۆچی دوایی کردووە، بەڵام قوتابی زانای کورد مامۆستا (مەلا محەمەدی خەتێ) بووە، ماوەیەکی زۆر لە شاری ڕواندز ماوەتەوە و دوای ئەوەی کتێبێک دەنووسێت ڕوو لە ئیستانبۆڵ دەکات، بۆیە مەرج نییە هەموو ئەم زانایانەی لەم وتارەدا باسکراون لە بنەڕەتدا خەڵکی ڕواندز بن، بەڵام بەهۆی کار و پیشەیان کە لەڕواندز بوونە و داواکاری و سەردانیان لەڕواندزەوە بۆ ئیستانبۆڵ ئەنجامداوە، بەزاناکانی ڕواندز هەژمارکراون.

## ڕەوشی زانایان لە قەزای ڕواندزدا:

### یەکەم: جەرجیس سەبری ئەفەندی:

ڕەوشی ژیانی زانایانی ئاینی و شێخەکانی تەریقەتی نەقشبەندی لە ڕواندزدا لە ئاستی بەرزی ئیمپراتۆرییەتی عوسمانییدا ئاوڕی لێدراوەتەوە، وەک لە نووسراوێکی قەڵەمی تۆمارە گشتییەکانی ویلایەتەکان لە سەرۆکایەتی حکومەتی عوسمانییدا لە ڕۆژی ٢٩ی نیسانی ١٨٥٧زدا نامەیەکی بۆ والیی شارەزوور ناردووە و داوای لێکردووە کە ئاوڕ لە ژیانی (جەرجیس سەبری ئەفەندی)(١)، کە یەکێک لە زانایاکانی ڕواندز و تەریقەتی بەرزی نەقشبەندی بووە بدرێتەوە، کە داوای مووچەیەکی ١٠٠ قرۆشی کردووە، لەبەرئەوەی منداڵێکی زۆری هەبووە و لەهەمانکاتیشدا خواردن و خواردنەوەی کەم دەستکەوتووە، بۆیە ڕووبەڕووی تەنگانەیەکی سەختی ئابووری و دارایی بۆتەوە، لەم نامەیەدا داوا لە

والی شارەزوور کراوە کە هیممەت لە جێبەجێکردنی داواکارییەکەی (جەرجیس سەبری ئەفەندی)دا بکات(٢)، بەڵام دوو ساڵ دواتر لە ٢٠ی تەممووزی ١٨٥٩زدا (جەرجیس ئەفەندی) ڕووی لە ئیستانبۆڵ کردووە بۆ وەرگرتنی پاداشتی دانراوێکی کە لە بابەتی (هونەر و ئیستیعارە)دا بووە، ئەو ماوەیەی کە لە پایتەختی ئیمپراتۆرییەتی عوسمانییدا ماوەتەوە تووشی قەرزێکی زۆر بۆتەوە، چونکە لەکاتی مانەوەیدا لە ئیستانبۆڵدا خەرجییەکی زۆری کردووە، دواتر ناچار دەبێت بڕیاری گەڕانەوە بۆ ڕواندز بدات، بۆیە لە ٢٠ی تەممووزی ١٨٥٩زدا لە سەرۆکایەتی حکومەتی عوسمانی لە قەڵەمی تۆمارە گرنگەکاندا داوا لە وەزارەتەکانی دارایی و پەروەردە(مەعاریف)ی عوسمانی کراوە کە بڕی (٥٠٠٠) قرۆش بۆ ناوبراو خەرجبکەن، ئەمەش دوای وەرگرتنی ڕەزامەندی سەرۆک وەزیرانی عوسمانی بووە بۆ ئەوەی ئەو بڕە(٥٠٠٠) قرۆشە لە خەزێنەی عوسمانییدا بۆ ناوبراو سەرفبکرێت(٣).

ئەم گەشتەی جەرجیس ئەفەندی بۆ ئیستانبۆڵ بۆ وەرگرتنی پاداشتی کتێبەکەی کە نەریتێکی ئەو کاتی نووسەران بووە، کە خۆیان سەردانی شاری ئیستانبۆڵ بکەن و کتێبەکە بگەیێننە دیوانی سوڵتانی عوسمانی و سەرۆکایەتی حکومەتی عوسمانی(سەدارەتی ئەعزەم و سەدری ئەعزەم)، ئەمەش بە مەبەستی بە دەستهێنانی داهاتێک وەک سەرچاوەیەکی بژێوی بووە، بەڵام لە پاڵ ئەمانەشدا ناوی نووسەرێکی دیکە دەچێتە سەرخەرمانەی مێژووی نووسەرەکانی کوردستان و ڕواندزدا، هەروەها ناونیشانی نووسەرێک و کتێبێکیش لە کتێبخانەی ڕواندزدا زیاد بووە، بەڵام جێگەی بایەخێکی گەورەی زانستیە کە ئەو کتێبەی جەرجیس سەبری ئەفەندی نووسیوویەتی بدۆزرێتەوە..!

**دووەم: ڕەسووڵ مەستی کوڕی مەحموود بەگ(ڕەسووڵ مەستی ئەفەندی):**

لەنێو بەڵگەنامەکانی ئەرشیفخانەی ئیمپراتۆرییەتی عوسمانی زانایەکی کوردستان بەنێوی ڕەسووڵ مەستی ئەفەندی یان مەستی ئەفەندی(٤) بەڵگەنامەیەکی زۆر دەربارەی کار و چالاکییەکانی ناوبراو هەن، لەهەمانکاتیشدا یەکێک لە زاناکانی قەزای ڕواندز بووە، لە بنەڕەتدا ناوبراو خەڵکی شارەزوور بووە و لەلای زانای کورد مامۆستا (مەلا محەمەدی خەتێ) خوێندوییەتی، بەڵام ئەوەی لە بەڵگەنامەکانی عوسمانی کە لەم وتارە زانستییەدا بەکارهێنراون و تێبینی دەکرێت، کە بەهەڵە ناوی (ڕەسوول حەسەن ئەفەندی) لە جیاتی (ڕەسووڵ مەستی ئەفەندی) لەنێو بەڵگەنامەکاندا هێنراوە، چونکە هەمان ناونیشانی کتێبیی(مەستی ئەفەندی) دراوەتە پاڵ(ڕەسووڵ حەسەن ئەفەندی) کە لەهەموو سەرچاوەکانی بەردەستی نووسەری ئەم وتارەدا زانایەک نەدۆزراوەتەوە ناوی(ڕەسووڵ

حەسەن ئەفەندی) بێت و کتێبێکی بەم ناونیشانە هەبووبێت..!

هەربۆیە (ڕەسووڵ مەستی ئەفەندی)وەک چەندین زانای تری سەردەمی خۆی ڕوویان لە سەرۆکایەتی حکومەتی عوسمانی(بابولعالی) لە ئیستانبۆڵ لەدوای نووسینی کتێب لە بواری جیا جیادا کردووە، کە ڕەسووڵ مەستی ئەفەندی کتێبێکی بەناونیشانی (رسالة في تشريح الأفلاك و رسالة في اثبات واجب الوجود)ی نووسیووە، بۆیە لە ٢٣ی ئابی ١٨٥٩زدا قەڵەمی تۆمارە گرنگەکان لە سەرۆکایەتی حکومەتی عوسمانییدا نووسراوێکی بۆ وەزارەتی پەروەردە(مەعاریف)ی بەرزکردۆتەوە، کە تێیدا بەپێویستی زانیووە کە یادداشتی ناوبراو بکرێت، کە هەرچەندە ناوی کەسێک بەناوی (تەحسین بەگ) هێنراوە کە ناونیشانی وەزیفیەکەی دیارینەکراوە و مەزبەتە و نووسراوەکەی ناوبراوی بۆ سەرۆکایەتی  حکومەتی عوسمانی هاوپێچ کردووە و ناردوویەتیی(٥).

لە زۆربەی نووسینی نێو تۆمارە ڕەسمییەکانی ئیمپراتۆرییەتی عوسمانییدا کە بۆ قەزای ڕواندز نێردراون لە ڕێگەی سەرۆکایەتی حکومەتی عوسمانییەوە بووە، وەک بڕیارنامەی سەدری ئەعزەمی عوسمانی کە بۆ موتەسەریفیەتی شارەزوور و قائیمقامییەتی ڕواندزی ناردووە دەربارەی هاتنی زانایەک بۆ شارەزوور و ڕواندز لە ٢٥ی حوزەیرانی ١٨٥٩زدا بەناوی (حاجی ئەبوبەکر ئەفەندی) کە تێییدا ڕوونی کردۆتەوە کە ناوبراو بۆ ڕێکخستنی هەندێک کاری دیاریکراو ڕووی لە ڕواندز کردووە، لەبەرئەوەی شایانی ڕێزگرتن و بایەخپێدانی ئیمپراتۆرییەتی عوسمانی بووە، سەدری ئەعزەمی عوسمانی لە کۆتایی بڕیارنامەکەیدا داوای لێکردوون، کە هەر (ئەبوبەکر ئەفەندی) گەیشتە ڕواندز ڕێز لەناوبراو بگرن، هاوکاری بکەن و کارەکانی بۆ ئاسان بکەن(٦). جێگەی سەرسوڕمان نییە کە لەبەرزترین دەسەڵاتی جێبەجێکاری عوسمانی کە سەرۆک وەزیرانەکەی بووە، چاودێری هاتووچۆی زاناکانی ئیمپراتۆرییەتەکەی کردبێت..!

دوای ئەوەی (ڕەسووڵ مەستی ئەفەندی) کە ڕووی لە ئیستانبۆڵ کردووە، بڕیاری گەڕانەوە بۆ شاری ڕواندز دەدات و لە ڕۆژی ٥ی ئاداری ١٨٦٠زدا وەزارەتی دارایی عوسمانی فەرمانی کردووە، کە بڕی (٥٠٠٠) قرۆش بۆ خەرجی گەڕانەوە و ڕێگەی گەیشتنەوەی بە ڕواندز بۆ مەستی ئەفەندی خەرج بکرێت، ئەمەش لەبەرئەوەی ناوبراو یەکێک لە زاناکانی ڕواندز و زانایەکی خاوەن زانست بووە(٧).

ئەم بڕیارەی خەرجکردنی بڕی پێنج هەزار قرۆشە دوای سەردانەکەی (ڕەسووڵ مەستی ئەفەندی) بۆ ئیستانبۆڵ هاتووە، کە دوو کتێبی نووسیبووە و پێشکەشی وەزارەتی پەروەردەی عوسمانی(مەعاریف)ی کردوون، کە یەکێک لە کتێبەکانی

بەزمانی عەرەبی بەناونیشانی (عنوان الشرف) نووسیووە، بەڵام پەراوێزەکانی بە زمانەکانی تورکی-عوسمانی و فارسی بوونە، بۆیە کاتێک ویستیوویەتی بگەڕێتەوە کوردستان(ڕواندز) داوای کردووە خەرجی ڕێگاکەی بۆی دابین بکرێت، ئەمە سەرەڕای ئەوەی لە پێشکەشکردنی هەر دوو کتێبەکەییدا داوای مووچەیەکی مانگانەشی لە داهاتی ناوخۆیی ڕواندزدا کردووە، ئەمەش لە نووسراوێکی ئیرادەی ناوخۆیی سەرۆکایەتیی حکومەتی عوسمانی لە ٦ی شوباتی ١٨٦٠زدا ئاماژەی پێکراوە، هەروەها لە وەسفی ناوبراودا (ڕەسووڵ مەستی ئەفەندی) بە زاناییەکی خاوەن زانست و زانیاری ناوزەد کراوە(٨). بەڵام لە ١٤ی شوباتی ١٨٦٢زدا واتە دوو ساڵ دوای سەردانی ناوبراو بۆ ئیستانبۆڵ، فەرمانگەی دیوان و وەزارەتەکانی سەر بە ئەنجوومەنی وەزیرانی عوسمانی فەرمانێک بە واژۆی ڕاوێژکاری باڵای ئەنجوومەنی وەزیرانی عوسمانی دەرچووێندراوە، کە تێیدا ئاماژەی بەوە کردووە کە فەرمانی سەرۆک وەزیرانی عوسمانی بۆ خەرجکردنی (٥٠٠٠) هەزار قرۆش دەرچووە و ڕەوانەی وەزارەتی دارایی کراوە، بۆیە داوای کردووە کە فەرمانی سەرۆک وەزیران جێبەجێبکرێت(٩).

**چوارەم: تەها ئەفەندی:**

یەکێکی تر لە زاناکانی ڕواندز (تەها ئەفەندی)(١٠) بووە، کە لە ١٢ی شوباتی ١٨٦٠زدا بەپێی نووسراوێکی قەڵەمی تۆماری دیوان و وەزارەتەکانی عوسمانیی کە بۆ وەزارەتی دارایی ناردوویەتی باس لە ڕەوشی موفتی پێشووی ڕواندز بەناوی(تەها ئەفەندی) دا کردووە، کە لەگەڵ یەکێک لە کوڕەکانی لە گەڕەکێکی شاری ئیستانبۆڵ نیشتەجێ بووە، بۆیە لەسەرۆکایەتی حکومەتی عوسمانیی بڕیاردراوە بۆ ماوەی دوو مانگ لە ٨ی شوبات تا ٨ی نیسانی ١٨٥٩ بۆ هەر ڕۆژێک (١٠) قرۆش، کە بۆ پێداویستی خۆراک بۆ ناوبراوان دابینکرابووە(١١).

شایانی باسە؛ تەها ئەفەندی تا کۆتایی هاوینی ساڵی ١٨٦٠ لە ئیستانبۆڵدا ماوەتەوە، وەک لە نووسراوێکی ژووری تۆمارە گرنگەکانی سەرۆکایەتی حکومەتی عوسمانییدا لە ٢٣ی ئابی ١٨٦٠زدا هاتووە کە کارەکانی ناوبراو لە ئیستانبۆڵ تەواو نەبوونە، بۆیە بە پێویست زانراوە کە تا مانگێکی تر مۆڵەتەکەی بۆ درێژ بکرێتەوە(١٢)، ئەمەش دوای ئەوەی هۆبەی تۆمارە گرنگەکان سەر بە وەزارەتی دارایی عوسمانیی لە ڕۆژی ١ی ئەیلولی ١٨٦٠ ڕایگەیاندووە کە مۆڵەتەکەی ناوبراو بەهۆی گەشتکردنییەوە بۆ ماوەی مانگێک درێژ بکرێتەوە(١٣)، بەڵام بەپێی بەڵگەنامەکانی عوسمانیی (تەها ئەفەندی) لەسەر

داواکاری و ئارەزووی خۆی تا کۆتایی پاییزی ١٨٦٠دا لە گەڕەکێکی شاری ئیستانبۆڵ ماوەتەوە و نەگەڕاوەتەوە بۆ ڕواندز بۆیە بڕی یارمەتیدانی ڕۆژانەکەی کراوەتە (٢٠)قرۆش و دوو مانگیش لە مۆڵەتەکەی بۆ ناوبراو درێژکراوەتەوە، ئەمەش دوای جێگیرکردنی داواکارییەکەی لەلایەن ئەنجوومەنی شورای عوسمانییەوە بووە، بۆیە لە ڕۆژی ٢ی کانوونی یەکەمی ١٨٦٠ بە وەزارەتی دارایی عوسمانی ڕاگەیێندراوە(١٤)، بەڵام لە ڕۆژی ٧ی کانوونی دووەمی ١٨٦١دا هۆبەی تۆمارە گرنگەکانی سەر بە ئەنجوومەنی وەزیرانی عوسمانی بە وەزارەتی دارایی ڕاگەیاندووە کە دیسان مۆڵەتەکەی (تەها ئەفەندی) کۆتایی هاتووە و پێویستە ماوەی بۆ دوو مانگی تر لە مۆڵەتەکەی درێژ بکرێتەوە، واتە:بۆ سەرەتای ئاداری ١٨٦١ لەهەمانکاتیشدا ڕۆژانە نزیکەی (٢٠)قرۆشی بۆ دابینکراوە(١٥)، ئەمە دەریدەخات کە (تەها ئەفەندی) لەسەرەتای زستانی ١٨٦٠ هەتا سەرەتای بەهاری ١٨٦١ لە شاری ئیستانبۆڵ ماوەتەوە و بۆ هەر دوو مانگ جارێکیش مۆڵەتەکەی بۆ درێژکراوەتەوە، بەڵام یەکێک لە کوڕەکانی هاوەڵی سەفەرەکەی کردووە، ئەمە بێجگەلەوەی ڕۆژانە ١٠-٢٠ قرۆشی پێدراوە بۆ دابینکردنی خۆراک و خەرجی ئەو ڕۆژانەی کە لە شاری ئیستانبۆڵ ماوەتەوە.

هەربۆیە لە ڕۆژی ٢١ی ئاداری ١٨٦١دا لەگەڵ یەکەمین ڕۆژی وەرزی بەهاردا قەڵەمی تۆمارەکانی تایبەت بە دیوان و وەزارەتەکانی حکومەتی عوسمانی بەنووسراوێک وەزارەتی دارایی ئاگادار کردۆتەوە کە(تەها ئەفەندی) موفتی پێشووی ڕواندز دەگەڕێتەوە مەملەکەتی خۆی(ڕواندز)، کە پێویستە خەرجی گەڕانەوەی کە دابینکراوە بۆ ناوبراو خەرجبکرێت تا کۆتایی مانگی ڕەزامەنی ١٢٧٧ک-١٨٦١زدا(١٦)، وادیارە ناوبراو لە ناوەڕاستی ڕەمەزانی(١٧) ساڵی ١٨٦١ لە شاری ئیستنابۆڵ بەرەو شاری ڕواندز بەڕێکەوتووە، بۆیە لەنێو بەڵگەنامەکانی عوسمانییدا بەتەواوی ڕوونەکراوەتەوە، کە ناوبراو بۆچی بۆماوەی ساڵێک و دوو مانگ لە شاری ئیستانبۆڵی پایتەختی ئیمپراتۆرییەتی عوسمانی ماوەتەوە، هۆکاری سەرەکی سەردانەکەیشی تەنها گەشت بووە، یان هەوڵدان بۆ گەڕانەوەی بۆ سەر کاری پێشووی کە (موفتی ڕواندز) بووە..؟ بەڵام ئەوەی جێگەی سەرنجدانە لەنێو بەڵگەنامە زۆر و زەوەندەکانی ئەرشیفخانەی ئیمپراتۆرییەتی عوسمانیی، دوو بەڵگەنامەن دەربارەی چارەنووسی (تەها ئەفەندی) موفتی پێشووی ڕواندز، یەکەمیان: مێژووەکەی بۆ ٥ی ئایاری ١٨٦٣ دەگەڕێتەوە، کە تێیدا داواکارییەک ئاڕاستەی ئەنجوومەنی باڵا(شورای عوسمانی)

کراوە کە (تەها ئەفەندی) موفتی پێشووی ڕواندز کۆچی دوایی کردووە، بۆیە مووچەکەی کە (٣٠٠) قرۆش بووە، نیوەی مووچەکەی (١٥٠) قرۆش بە کوڕەکانی بدرێت بەناوەکانی: (محەمەد ئەفەندی و ئەحمەد ئەفەندی) لەگەڵ تەغارێک گەنم بۆ هەر یەکێکیان، واتە مووچەی تێکڕایی ساڵانەیان ١٨٠٠ قرۆش و دوو تەغار گەنم بووە بۆ کوڕەکانی (تەها ئەفەندی) موفتی پێشووی ڕواندز، ئەمەش دوای ڕێکخستنی نووسراوێک(مەزبەتە) لەلایەن ئەنجوومەنی باڵای عوسمانی و دەرچوونی فەرمان لەلایەن هەمان ئەنجوومەنەوە بۆ جێبەجێکردنی لەلایەن وەزارەتی دارایی عوسمانییەوە(١٨)، دووەمیان: مێژووەکەی بۆ ٢٩ی ئابی ١٨٦٣ دەگەڕێتەوە، کە کاتێک کەسێک بەناوی(ڕەسوڵ مودەریس) لە ئیستانبۆڵ داواکارییەک بۆ ئەنجوومەنی باڵای عوسمانی نووسیووە، کە نەوەی حەزرەتی بیلالی حەبەشییە، منداڵێکی زۆری هەیە و باری ژیانی زۆر خراپە کە بۆ ماوەی دوو ساڵ ڕووی لە ئیستانبۆڵ کردووە، کە بەکاری دوعا و کاری خێرخوازی سەرقاڵبووە و لەشوێنێکدا خەوتووە کە سەرگەردان و پەرێشانی کردووە، بۆیە داوای کردووە کە مووچەکەی (تەها ئەفەندی) موفتی پێشووی ڕواندز بە ئەو بدرێت کە بڕەکەی (٣٠٠) قرۆش بووە، بەدەق نووسیوویەتی: بە میهرەبانی و بەزەیی جەنابی پاشا مووچەی ناوبراو(تەها ئەفەندی) بدرێتە من، ناوبراو(ڕەسوڵ مودەریس) لە داواکارییەکەیدا خۆی بەدانیشتووانی سەنجەقی ڕواندز داناوە، هەروەها بە ئەنجوومەنی باڵای عوسمانییشی ڕاگەیاندووە کە (تەها ئەفەندی) موفتی پێشووی ڕواندز مردووە، کە تێیدا نووسیوویەتی ماوەیەک بەر لە ئێستا ناوبراو مردووە(١٩).

هەر لەم سەروبەندەدا ئەنجوومەنی باڵای عوسمانی لە ڕۆژی ٥ی ئایاری ١٨٦٣زدا کە چوار مانگ پێش داواکارییەکەی (ڕەسووڵ مودەریس) بووە، بڕیاری لەسەر چارەنووسی مووچەی (تەها ئەفەندی) داوە و نیوەی مووچەکەی بە کوڕەکانی بەخشیووە، بەڵام ئەشێ (ڕەسووڵ مودەریس)یش بە درەنگەوە هەواڵی مردنی (تەها ئەفەندی) موفتی پێشووی ڕواندزی پێگەیشتبێت.. یان نەیزانیبێت کە مووچەی ناوبراو بە کورەکانی دراوە و هەموو شتیک بڕاوەتەوە، بەڵام ئەوەی جێگەی سەرسووڕمانێکی زۆرە، کە تا ئێستا لە نووسین و بەڵگەنامەکانی بەردەست یەکلاینەکراوەتەوە کە یەکێک لە هاوەڵەکانی پێغەمبەری ئیسلام(درودی خوای لەسەر بێت) نەوەکانی لە شاری ڕواندز نیشتەجێبووبن و تا نیوەی دووەمی سەدەی نۆزدەهەم ئامادەییان هەبووبێت و ئاستێکی باشی خوێندەواریان هەبووبێت و زانای ئاینی بووبن..!؟

**پێنجەم: پیر محەمەد ئەفەندی:**

شایانی باسە لە ڕواندزدا کەسایەتییەک و زانایەکی ئاینی بەناوودەنگ وەک (پیر محەمەد ئەفەندی)(٢٠) لەدوای نیوەی دووەمی سەدەی نۆزدەهەمدا دەرکەوتووە، لەنێو بەڵگەنامەکانی عوسمانییدا لەماوەی ساڵانی ١٨٦١دا باسی ناوبراو کراوە، بەتایبەتی لە دوای کۆچی دواییکردنی باوکی کە ناوی (عەلی) بووە، ئەم زانایەوە داواکاری پێشکەشی ئەنجوومەنی وەزیرانی عوسمانی کردووە، کە مووچەکەی باوکی و بڕی ئەو گەنمەی کە پێیدەبەخشرا بە ئەو (پیر محەمەد) بدرێت، وادیارە لە ڕۆژی ٩ی حوزەیرانی ١٨٦١دا سەرۆک وەزیرانی عوسمانی ڕەزامەندی لەسەر داواکاری ناوبراو داوە، ئەمەش دوای ناردنی داواکارییەکەی لەلایەن ئەنجوومەنی شورا بۆ سەرۆکایەتی ئەنجوومەنی وەزیرانی ئیمپراتۆرییەتی عوسمانیی، بۆیە وەزارەتی دارایی عوسمانیی ڕاسپێردراوە کە مووچەیەکی گونجاو بۆ (پیر محەمەد ئەفەندی) دابین بکرێت، ئەمەش دوای ئەوە هاتووە کە مووچەی باوکی (پیر محەمەد ئەفەندی) و بڕی ئەو گەنمەی پێیبەخشراوە بەبێ خاوەنی ماوەتەوە، بۆیە کوڕەکەی ویستویەتی لە شوێنی باوکی موچەکەی وەربگرێتەوە(٢١)، ئەمەش دوای ئەوە هاتووە کە نووسراوێک لە فەرمانگەی قەڵەمی تۆماری دیوان و وەزارەتەکانی عوسمانیی بۆ وەزارەتی ئەوقاف لە ڕۆژی ٩ی حوزەیرانی ١٨٦١دا بەرزکراوەتەوە و (پیر محەمەد ئەفەندی) وەک زانایەکی سەنجەقی ڕواندزی ناساندووە وبە شایانی ڕێزگرتن و میهرەبانیی زانیووە، بۆیە داواکراوە کە هیممەتیک بۆ ناوبراو بکرێت لە دابین کردنی مووچەدا، بۆیە ڕوو لە وەزیری ئەوقافی عوسمانی کراوە کە بڕیار لەو بارەیەوە بدات(٢٢).

هەربۆیە فەرمانگەی دیوان و وەزارەتەکانی ئەنجوومەنی وەزیرانی عوسمانی مانگێک پێشووتر و لە ١١ی ئایاری ١٨٦١دا نووسراوێکی بۆ وەزارەتی دارایی ناردووە، کە بنەماڵەی (پیر محەمەد ئەفەندی) بە بنەماڵەیەکی ڕیشەداری پاکی حەزرەتی فاروق کە دانیشتووی گوندی (شیمان=شیڤان)(٢٣)ی سەنجەقی ڕواندز بوونە ناوزەدی کردوون، ئەمەش دوای ئەوەی کە خانەوادەی ناوبراو تووشی تەنگوچەڵەمەی ژیان بوونەتەوە و بۆیە داواکراوە مووچەیەکیان بۆ دابین بکرێت(٢٤). وادیارە دامەزراوەکانی عوسمانی لەوکاتدا لەبەدواداچوونی بەردەوام دابوونە بۆ دابینکردنی مووچەیەک بۆ (پیر محەمەد ئەفەندی) بۆیە لە ٢٧ی حوزەیرانی ١٨٦١ لە فەرمانگەی دیوان و وەزارەتەکانی سەرۆکایەتی ئەنجوومەنی وەزیرانی عوسمانیی بڕیاردراوە کە (٥٠٠) قرۆش لە مووچەکەی (عومەر ئەفەندی شارەزووری) ماوەتەوە بدرێت بە (پیر محەمەد ئەفەندی)(٢٥).

ئەوەی جێگەی تێبینی و هەڵوەستە لەسەرکردنە لە بەڵگەنامەکانی عوسمانییدا کە زۆرێک لە بنەماڵەی زانایان خۆیان گەڕاندۆتەوە سەر ڕەچەڵەک و ڕیشەی بنەماڵەی پێغەمبەری ئیسلام (درودی خوای لەسەر بێت) و هاوەڵەکانی کە زۆرینەی ئەم زانایانە قەواڵە و درەختی بنەماڵەکانیان بەتەواوی ڕاستێندراو نەبوونە، بەزانیارییەکانی نێو بەڵگەنامەکانی عوسمانیی بێت، بنەماڵەی (پیر موحەممەد ئەفەندی) یەکێک لە نەوەکانی (حەزرەتی عومەری کوڕی خەتاب) (ڕەزای خوای لەسەر بێت) کە بە (عومەری فارۆق) ناسراوە و خەلیفەی دووەمی ڕاشیدەین بووە، ئەمەش ئەو ئەنجامە دەخاتەڕوو کە یەکێکی تر لە نەوەکانی هاوەڵانی پێغەمبەری ئیسلام لە سەنجەقی ڕواندز و لە گوندی (شیمان) نیشتەجێ بوونە، کە تا نووسینی ئەم وتارە زانیاری لەسەر ئەم گوندە بەردەست نەبووە.

**شەشەم: یەحیا بەگ قۆچ بەگ زادە:**

لەنێو مێژووی زاناکانی ڕواندزدا (یەحیا نەزیری قۆچ بەگ زادەی ڕواندزی)(٢٦) کە لە ناو بەڵگەنامەکانی عوسمانییدا باسکراوە، کە نووسەری کتێبی (تاريخ سلطان الغازي)یە بەپێی هەندێک سەرچاوە ناوبراو لە ساڵی ١٨٦٠دا کۆچی دوایی کردووە، بەڵام بەڵگەنامەکانی عوسمانی تا ساڵی ١٨٦١ ئاماژە بە زیندوویی ناوبراویان کردووە، لەبەرئەوەی لە ڕۆژی ١٤ی ئەیلولی ١٨٦٠دا فەرمانگەی دیوان و وەزارەتەکانی سەر بە ئەنجوومەنی وەزیرانی عوسمانی ئاماژە بەوە کردووە کە (یەحیا بەگ قۆچەزادە) یەکێکە لە خانەدانەکانی ڕواندز، باس لەمانەوەی ناوبراوی لە شاری ئیستانبۆڵ کردووە و ماوەی مۆڵەتەکەی بۆ دوو مانگ درێژکردۆتەوە(٢٧)، بەڵام هەمان فەرمانگە لە ١٨ی تەشرینی دووەمی ١٨٦٠زدا لە نووسراوێکی دا بۆ وەزارەتی دارایی عوسمان ئەوەی بیرهێناوەتەوە کە (یەحیا بەگی قۆچە زادە) کە مووچە و ساڵانەی باوکی کە مردووە وەریگرتووە، بۆیە داوای کردووە کە ئەو وەریبگرێت لەبەرئەوەی تەنها ئەو خاوەنییەتی و کەسی تر نییە وەری بگرێت، یاخود ئەگەر ئەم داواکارییەی جێبەجێناکرێت ئەوا مووچەیەکی بۆ ببڕدرێتەوە، لە کۆتاییدا ئەم فەرمانگەکە ئاماژەی بەوەکردووە کە هەمان نووسراو بۆ شورای عوسمانیی دەنێردرێت بۆ ئەوەی داواکارییەکەی ناوبراو جێبەجێبکرێت(٢٨).

ئەم زانیارییانە کۆدی نهێنی گەشتەکەی (یەحیا نەزیری قۆچە زادە) بۆ شاری ئیستانبۆڵ دەکاتەوە، کە مەبەستی سەرەکی ئەو لە چوونی بۆ ئیستانبۆڵ بەدەستخستنی مووچەی باوکی یان مووچەیەک بۆ بژێوی ژیانی خۆی بووە، وادیارە (یەحیا نەزیری قۆچ بەگ زادە) تا ڕۆژی ٢٧ی ئەیلولی ١٨٦١ لە ئیستانبۆڵدا ماوەتەوە و فەرمانگەی سەرۆکایەتی حکومەتی عوسمانیی نامەیەکی بۆ وەزارەتی مەعاریفی گشتی ناردووە،

داوای کردووە کە (یەحیا بەگ قۆچە بەگ زادە) کە لەسەر تەریقەتی نەقشبەندی خالیدییە داوای بەزەیی و هاوکاری کردووە(٢٩)، ئەمەش دوای ئەوەی کە ناوبراو لە گەڕەکی (دیلە دیکە)ی ئیستانبۆڵ نیشتەجێ بووە، کە بۆ ماوەی دوو مانگ مۆڵەتی مانەوەیان پێداوە لەگەڵ ئەوەشدا ڕۆژانە (١٥) قرۆشی پێدراوە(٣٠)، لەهەموو ئەم بابەتی خەرجیانەدا وەزارەتی دارایی عوسمانی ئاگادارکراوەتەوە و پێیڕاگەیێندراوە، کە فەرمانەکانی سەرۆکایەتی ئەنجوومەنی وەزیرانی عوسمانی دەرهەق بە (یەحیا بەگ قۆچ بەگ زادە) جێبەجێ بکرێت، ئەمە سەرەڕای ئەوەی لە ٩ی کانوونی دووەمی ١٨٦٢دا ئەنجوومەنی وەزیرانی عوسمانی فەرمانی بە وەزارەتی دارایی کردووە، کە مووچەیەک بۆ ناوبراو دابین بکەن(٣١).

هەربۆیە دوای نزیکەی هەژدە ڕۆژ دیسان فەرمانگەی دیوان و وەزارەتەکانی سەر بە سەرۆکایەتی وەزیرانی ئیمپراتۆرییەتی عوسمانی فەرمانی بە وەزارەتی دارایی کردووە کە مووچەیەک بۆ ناوبراو دابین بکەن، لەبەرئەوەی بارودۆخی ژیانی (یەحیا بەگ قۆچ بەگ زادە) پەرێشانە و ڕووبەڕووی تەنگانە بۆتەوە، بۆیە داوای کردووە کە لە مووچەی کەسێک کە ناوی (عەبدولباقی ئەفەندی) بووە و مرد بووە، دابین بکرێت(٣٢)..ئەمەش دەریدەخات کە وەزارەتی دارایی نووسراوەکەی ڕۆژی ٩ی کانوونی دووەمی ١٨٦٠زدا پشتگوێ خستووە و وەڵامی نەداوەتەوە، بۆیە تا دوای هەژدە ڕۆژ و دواتر هەمان فەرمانگە فەرمانێکی نوێی دەرکردووە و بۆ ئەوەی ڕاستەوخۆ جێبەجێبکرێت.

لەم ماوەیەدا قەڵەمی تۆمارە گرنگەکانی سەر بە ئەنجوومەنی وەزیرانی ئیمپراتۆرییەتی عوسمانی وەزارەتی دارایی لە ڕۆژی ٢٤ی ئەیلولی ١٨٦٣دا لە ڕووداوێکی ساختەکردن تۆماری داهاتەکانی دە یەکی گوندی (زران-سەران) ئاگادارکردۆتەوە، کە دوای ئەوەی ویلایەتی بەغدادیش نووسراوی دەربارەی ئەو ساختەکردنەی بۆ ئەنجوومەنی وەزیرانی ئیمپراتۆرییەتی عوسمانی کردووە، کە تێیدا وەڵامی ئەو ئامارەی داوەتەوە لە باجی دە یەگی گوندی سەران وەرگیراوە، کە ئەو کەسەی ئەم کارەی کردووە بەناوی (عەبدولقادری ئەفەندی)(٣٣) بووە کە بەپێی بەڵگەنامەکان یەکێک لە زاناکانی ڕواندز بووە(٣٤).

شایانی باسە؛ داواکاری بۆ دابینکردنی بژێوی ژیان (مووچە) لەلایەن زانایانی کورد لە ئیمپراتۆرییەتی عوسمانیی بۆ چەند هۆکارێکی سەرەکی لەنیوەی دووەمی سەدەی نۆزدەهەمدا دەگەڕێتەوە:

یەکەم: نەمانی دەسەڵاتی میرنشینە کوردییەکان، چونکە لەسەردەمی میرنشینەکاندا چاودێرییەکی تەواویی دامەزراوەکانی ئاینیی لەڕووی دابینکردنی بژێوی ژیانی زانا،

مامۆستایانی ئاینی و قوتابی قوتابخانە ئاینییەکان دەکرا و هەبوو، ئەگەر چاو بەنێو بەڵگەنامەکانی عوسمانی لەماوەی سەدەی شانزەهەم تا نیوەی یەکەمی سەدەی نۆزدەهەم بخشێنینەوە کەمترین داواکاری زانایانی ئاینیی بۆ دابینکردنی مووچە لە ئیمپراتۆرییەتی عوسمانی دەبینرێت.

دووەم: بارودۆخی جڤاکیی و ئابووری کوردستانی سەردەمی عوسمانیی ڕووبەڕووی ئاڵنگاری سەخت بۆتەوە، بەتایبەتی لە وەرگرتنی باجی بەرهەم و زەوی و زاری کوردستان لەلایەن دەسەڵاتی ناوەندییتی عوسمانیی، لەهەمانکاتیشدا کەمبوونەوەی بەرهەمی کشتوکاڵی و ئاژەڵداری لە کوردستان بەهۆی ئەو بارودۆخە نوێیەی لە کوردستان لە دوای سەردەمی میرنشینەکان هاتەکایەوە، بۆیە لەگەڵ هەڵوەشانەوەی سیستەمی ناوخۆیی بەڕێوەبردن، ئابووری، کۆمەڵایەتیی و فەرهەنگی سەردەمی میرنشینەکاندا، پەراگەندەییەکی تەواوی لە بواری فێرکردن و دابینکردنی ژیانی زانایانی ئاینیی، شێخانی تەریقەت، تەکیە و خانەقاکاندا هێنایەکایەوە و شایانی ئاماژەپێکردنیشە کە خوێندنی فەرمی(حکومەتی عوسمانیی) لە ڕێگەی کردنەوەی قوتابخانەی سەردەمییەوە هەژموونی بەسەر خوێندن و فێرکردنی قوتابخانە ئاینیەکاندا دەکرد، بەڵام بەپێی بەڵگەنامەکانی بەردەست حکومەتی عوسمانیی ویستوویەتی دوو کار بکات، یەک: ڕێز لە زانایان، خوێندن و قوتابخانە ئاینییەکان بگرێت و بمێننەوە، بەتایبەتیش لە دابینکردنی بژێوی ژیان، دوو: هاوسەنگی لەنێوان خوێندنی ئاینیی و فەرمی ڕابگرێت، ئەمەش بۆ سەردەمی خۆی بایەخێکی گەورەی هەبووە، لەئەنجامدا وەک تەواوکاری یەکتری سەیرکراون، لەهەقیقەتیشدا پێشکەوتن و پەرەسەندنی زانست ئەم دوو کارەی دەویست.

سێیەم: کۆچی خەڵک لە ناوچە جیا جیاکانی کوردستانی سەردەمی ئیمپراتۆرییەتی عوسمانی بۆ ناوچە ناوخۆییەکانی ئیمپراتۆرییەتەکە، بەهۆکاری بڵاوبوونەوەی برسییەتی، نەخۆشی و پەتای کوشندە بەتایبەتی لە چارەکی کۆتایی سەدەی نۆزدەهەمدا، هەروەها شەڕ و پێکدادانی بەردەوامی نێوان هۆز و تیرەکانی کوردستان، ئەمە بارودۆخێکی ناسازی هێنابوویەکایەوە کە توانای بەرهەمهێنان و زیادبوونی داهاتی کەمکردبۆوە، ئەمەش هۆکارێکی بنەڕەتی بوو کە زانایانی ئاینیی بۆ بژێوی ژیانیان ڕوو لە ئیستانبۆڵ بکەن، هەتا هەندێکیان کە کتێبیان نووسیووە و بەدیاری پێشکەشی سوڵتان و سەرۆک وەزیرانەکانی عوسمانیی کردووە بۆ وەرگرتنی پاداشت بووە، ئەمەش بە مەبەستیدابینکردنی بژێوی ژیانیان بووە.

## تەریقەتی نەقشبەندی لە قەزای ڕواندز:

### یەکەم: خانەقای شێخ عەبدولغەفووری نەقشبەندی:

ناوچەی ڕواندز و باڵەکایەتیی مەڵبەندی گەورەی زانایان و قوتابخانە ئاینییەکانی بووە لەسەر ئاستی کوردستانی سەردەمی عوسمانی و سەردەمەکانی دواتریشدا، لەهەمانکاتیشدا یەکێک لە ناوەندەکانی ڕێبازەکانی سۆفیگەری و شێخەکانی تەریقەتی نەقشبەندی، چەشتی، سوهرەوەردی و قادری بووە، بۆیە لەسەردەمی عوسمانییدا شێخەکانی تەریقەت ڕۆڵ و کاریگەرییەکی گەورەیان لەسەر ئاستی کوردستانی سەردەمی عوسمانییدا هەبووە، لەبەرئەوەی بارودۆخی ژیان و کارەکانیان لەناوەندەکانی بڕیاری دەسەڵاتدارییەتی عوسمانیی لە ئیستانبوڵدا بۆتە باسوخواسی فەرمانگەکانی ئیمپراتۆرییەتی عوسمانیی، هەر لەم چوارچێوەیەدا بەتایبەتی لەنێو بەڵگەنامەکانی عوسمانییدا بارودۆخی ژیان و داواکاری شێخەکانی تەریقەت لە قەزای ڕواندزدا دەبینرێن.

شایانی باسە؛ سەرەڕای خراپی دۆخی ژیان و گوزەرانی زانایانی ئاینیی و ڕێبەرەکانی تەریقەت لە ڕواندزدا، بەڵام شوێنەکانی تەریقەتیش ڕووبەڕووی کەمی خزمەتگوزاری بوونەتەوە یاخود داواکاریان بۆ نۆژەنکردنەوەی خانەقا و تەکییەکانیان بەرزکردۆتەوە، ئەمەش لە ڕۆژی ٩ی تەمموزی ١٨٥٨دا وەزارەتی ئەوقافی عوسمانی نووسراوێکی بۆ قەڵەمی تۆمارە گشتییەکانی وەزارەت و فەرمانگەکان لە سەرۆکایەتی عوسمانی (بابولعالی)دا ناردووە، کە داوای کردووە تەکیەی شێخ عەبدولغەفووری نەقشبەندی لە ڕواندز کە وێران بووە نۆژەنبکرێتەوە، ئەمەش لەسەر داوای سەرۆک وەزیرانی عوسمانی بووە(٣٥)، بەپێی بەڵگەنامەکانی نێو ئەنجوومەنی باڵای عوسمانی(ئەنجوومەنی شورای دەوڵەت) دوای سێ مانگ لە بڕیاری نۆژەنکردنەوەی تەکیەی و خانەقای شێخ (عەبدولغەفوور ئەفەندی)(٣٦) لە شاری ڕواندزدا، باس لەناوبراو و کوڕەکەی کراوە، کە گەیشتوونەتە ئیستابوڵ بەمەبەستی دوعاکردن، بەڵام ئاماژە بەوە کراوە کە ناوبراو هەژارە، بۆیە فەرمان لە ئەنجوومەنی باڵای عوسمانی دەرچووە، کە (شێخ عەبدولغەفوور نەقشبەندی) و کوڕەکەی لە میوانخانەی (محەمەد بەگ) بۆ ماوەی دووە مانگ بمێننەوە، لەهەمانکاتدا بۆ هەر ڕۆژێک (١٠) قرۆشییان بۆ خەرجبکرێت(٣٧).

هەربۆیە لە مێژووی ئیمپراتۆرییەتی عوسمانیی گرنگییەکی زۆر بە ڕێبازەکانی سۆفیگەری و شێخەکانی، تەکیە و خانەقەکانی دراوە، هەر بۆیە لە ئاستی باڵای بەرپرسانی ئیمپراتۆرییەتی عوسمانییدا بڕیار لە نۆژەنکردنەوە و پێشکەشکردنی یارمەتی دارایی بۆ دابینکردنی خۆراک و پێداویستی بۆ خانەقا و تەکیەکان دراوە، هەر

لەبەرئەمەش سەرۆک وەزیرانی ئیمپراتۆرییەتی عوسمانیی بڕیاری داوە کە خانەقای شێخ عەبدولغەفووری نەقشبەندی لە ڕواندز نۆژەنبکرێتەوە، ئەمە نەریتێک بووە کە سوڵتانەکانی عوسمانیی، شازادە و خاتوونەکانی بنەماڵەی سوڵتانەکانی عوسمانی، سەرۆک وەزیر و وەزیرەکان، والی و بەرپرسە دەستڕۆویشتووەکانی ناوچە خۆجێی و هەرێمەکانی سەرانسەری خاکی ئیمپراتۆرییەتی عوسمانیی بەبەردەوامی یارمەتیی دارایی و هاوکارییان پێشکەشی ناوەندەکانی ڕێبازی سۆفیگەری کردووە، هەروەها بەشێکیش لەو بەرپرسانەی ئیمپراتۆرییەتی عوسمانی مورید و مەنسووبی تەریقەتە جیاجیاکانی نێو ئیمپراتۆرییەتەکەیان بوونە.

**دووەم: خانەقای شێخ عەبدوڵڵای زینوێ:**

تەکیە و خانەقای خەلان و زینوێ شێخی لە ناوچەی باڵەکایەتیی مەڵبەندێکی گەورەی تەریقەتی نەقشبەندی بووە لەدوای نیوەی دووەمی سەدەی نۆزدەهەمدا، بۆیە لە بەڵگەنامەیەکی کۆشکی یەڵدزی سوڵتانی عوسمانی(عەبدولحەمیدی دووەم ١٨٧٦-١٩٠٩ز) لە فەرمانگەی سەرۆکی نووسەرانی ئەو کۆشکەوە کە (عەلی خەواجە) سەرۆکی ئەو فەرمانگەیە بووە، ئاماژە بەداواکاری (شێخ کەمالەددین)(٣٨) دەکات، کە خۆراک بۆ تەکیەکەی دابین بکرێت، ئەمەش لە ڕێگەی دابینکردنی مووچەیەکی دیاریکراو بۆ کڕینی خۆراک، کە بەپێی بەڵگەنامەکە تەکیەکە لە قەزای ڕواندزی سەر بە سەنجەقی کەرکوک بووە(٣٩).

بۆیە پێویستی دابینکردنی خۆراک بۆ تەکیە و گوندی دارولئەمانی قەزای ڕواندز کە (شێخ عەبدوڵڵا ئەفەندی) وەک جێگەداری تەریقەتی نەقشبەندی لە سنووری قەزای ڕواندزدا داوای کردووە، بۆیە لەلایەن فەرمانگەی سەرۆکایەتی وەزیرانی عوسمانی لە ڕۆژی ٢٧ی ئاداری ١٩١٤دابڕیاردراوە، کە بڕی (١٥٠٠)قرۆش بۆ ناوبراو خەرجبکرێت، هەروەها حکومەتی عوسمانی(بابولعالی) لە ڕۆژی ١٤ی ئاداری ١٩١٤دا ڕایگەیاندووە کە دەبێت وەزارەتی دارایی بڕی دیاریکراو خەرجبکات، واتە: لە ١ی ئاداری ١٣٣٠ ڕۆمی، کە یەکەم ڕۆژی ساڵی دارایی عوسمانی بووە(٤٠). ئەمەش دوای ئەو نووسراوە هاتووە کە لە ٧ی کانوونی دووەمی ١٩١٤دا بۆ وەزارەتی دارایی لەلایەن فەرمانگەی سەرۆکایەتی بەشی قەڵەمی تۆمارەکان نێردراوە، کە بڕی (١٥١٠) هەزار قرۆش بۆ (شێخ عەبدوڵڵا)ی پۆستنشینی تەکیە و گوندی (دارولئەمانی)(٤١) قەزای ڕواندز دابین بکرێت(٤٢).

بۆیە دوای وردبوونەوە لە بەڵگەنامەکانی عوسمانییدا دەردەکەوێت، کە لە بڕیاری کۆتایی ئەنجوومەنی وەزیرانی عوسمانی دە قرۆشیش کەمکراوەتەوە و کراوە بە (١٥٠٠) هەزار قرۆش بۆ خەرجی و خۆراکی تەکیەی گوندی دارلئەمان(زینوێ و خەلان) لە قەزای

ڕواندزدا.. بەڵام دوای هەڵایسانی شەڕی یەکەمی جیهانی لە ١٩١٤دا، ناوچەکانی قەزای ڕواندز بەتایبەتی ناحیەی باڵەک(باڵەکایەتیی) لە ئایاری ١٩١٦دا تووشی هێرشی لەناکاوی ڕووسەکان(عروسەکان) بوویەوە، بۆیە کاتێک (شێخ عەبدوڵڵای نەقشبەندی) کۆچی دوایی دەکات، (سەید عەلائەددین کوڕی شێخ جەلال)(٤٣) شوێنی دەگرێتەوە و دەبێتە جێگەداری، هەربۆیە داواکارییەکی پێشکەش بە سەرۆکایەتی ئەنجوومەنی وەزیرانی ئیمپراتۆرییەتی عوسمانی کردووە، کە ئەو (١٥٠٠) قرۆشەی بۆ باوکی دابینکرابوو، وەک مووچەیەک بە ئەو بدرێت لەبەرئەوەی بۆتە جێگەداری باوکی و سەرۆکی خێزانەکەش بووە، ئەم داواکارییە لەلایەن موتەسەریفی سەنجەقی کەرکوکیش پەسەند کراوە، بەڵام دامەزراوە خزمەتە نیشتمانییەکان کە لە وەزارەتی ناوخۆیی عوسمانی بووە تێبینی لەسەر ئەو داواکارییەی (شێخ عەلائەددینی زینوێ) هەبووە، بۆیە لە وەڵامی داواکاری ناوبراودا بۆیان نووسیووە: کە (شێخ عەلائەددین زینوێ) ناوی لەو لیستەدا نییە، بەڵام دەکرێت لە شوێنێکی تر مووچەیەکی بۆ دابین بکرێت، ئەمەش لە ڕۆژی ١٧ی کانوونی یەکەمی ١٩١٦زدا بووە، دوای دوو ساڵ لە هەڵایسانی شەڕی یەکەمی جیهانی دا(٤٤).. وادیارە ناوبراو بەشداری لەشەڕی یەکەمی جیهانیدا نەکردبێت، بەڵام ئەمە مەحاڵە لەبەرئەوەی ئیمپراتۆرییەتی عوسمانی فەتوای جیهادی پیرۆزی لە دژی ڕووسی تزاری، بریتانیا و فەرەنسا و هاوپەیمانەکانیان ڕاگەیاند بوو، هەروەها لەوانەیە بیانوویێکیش بێت بەدەست ئیمپراتۆرییەتی عوسمانی بەهۆی هەڵایسانی شەڕی یەکەمی جیهانیەوە لە توانای دانەبووبێت کە مووچە و یارمەتی دارایی بۆ شێخی تەریقەت و خانەقا و تەکیەکان دابین بکات.

## ئەوقاف لە قەزای ڕواندزدا:

لەمێژووی ئیمپراتۆرییەتی عوسمانییدا ئەوقاف و موڵکەکانی ڕۆڵێکی گەورەیان لە خزمەتگوزاری ئاینیی و کۆمەڵایەتییدا هەبووە، سەرچاوەی بژێوی و دابینکردنی ژیانی هەزاران کەسی هەژار و لێقەوماو، فەقێ و قوتابخانە ئاینیەکان، تەکیە و خانەقاکان، زانایانی ئاینیی و شێخانی ڕێبازی سۆفیگەری بووە، کە لەسەر داهاتەکانی ئەوقاف دەژیان یان دامەزراوەکانی ئەوقاف خزمەتگوزاری وەک شوێنی مانەوە و خۆراک و خەرجییەکانی بۆ دابیندەکردن.

یەکێک لە کێماسییەکانی نووسینەوەی مێژووی کوردستاندا، بەتایبەتی لەسەردەمی ئیمپراتۆرییەتی عوسمانییدا نەنووسینەوەی مێژووی وەقفەکانە لە کوردستاندا، کە تا ئەمرۆش کاریگەری موڵکە وەقفکراوەکان لەسەر ژیانی ئاینیی، ئابووری و کۆمەڵایەتییدا هەیە،بۆیە لە قەزای ڕواندزدا موڵکە وەقفکراوەکان بۆتە باسوخواسی دامەزراوەکانی ئیمپراتۆرییەتی عوسمانی، هەر بۆیە لەلایەن وەزارەتی ناوخۆی عوسمانی لێکۆڵینەوەی

لە بارەیەوە کراوە و لە ڕۆژی ١٩ی تەمموزی ١٩١٤دا ویلایەتی مووسڵی لێ ئاگادارکردۆتەوە، کە وەقفەکانی ڕواندز لێکۆڵینەوەیان لەبارەوە کراوە و لە تۆمارە کارگێڕییەکانی وەزارەتەکەیدا تۆمارکراون و لەهەمانکاتیشدا بە وەزارەتی ئەوقافی هەمایۆنی ڕاگەیێندراوە، هەروەها موفتی قەزای ڕواندز دەستپێشخەرییەکی کردووە کە تەواوی زانیارییەکانی وەقفەکانی ڕواندز بەدامەزراوەی شێخولئیسلام ڕاگەیاندووە، لە کۆتایشدا قائیمقامیەتی ڕواندزیش ئاگادارکراوەتەوە(٤٥)، بەڵام لەم بەڵگەنامەیەدا هیچ ئاماژەیەکی بەناو و شوێنی موڵکە وەقفکراوەکانی قەزای ڕواندز نەکردووە، بۆیە شایانی لێکۆڵینەوەی زیاتر لە داهاتوودا بۆئەوەی ژمارە و ناوی موڵکە وەقفکراوەکان و داهاتەکانیان بزانرێت، بەتایبەتی لە خەرجکردنی داهاتی ئەوقافی قەزای ڕواندز کە بۆ چ دامەزراوەیەک و کەسێک و یان چین و توێژێکی کۆمەڵی ئەوکاتی ڕواندز خەرجکراوە.

## ئەنجام:

یەکەم: قەزای ڕواندز لەسەردەمی حوکمڕانی عوسمانییدا ناوەندێکی گەورەی فێرکردنی ئاینیی، زانایان و ڕێبازەکانی سۆفیگەری بووە، لە دامەزراوەکانی ئیمپراتۆرییەتی عوسمانییدا بەبەردەوامی باسوخواسی بژێوی ژیان، داواکاری، دانراوی زانایان، دابینکردنی مووچە و خۆراکی زانایان و شێخەکانی ڕێبازی سۆفیگەری بۆتە کاری ئەم دامەزراوانە بۆ دۆزینەوەی چارەسەر و دابینکردنی پێداویستییەکانی ئەم چین و توێژانەی کۆمەڵی کوردەواری لە قەزای ڕواندزدا، هەرچەندە ڕۆتینێکی زۆر ڕووبەڕووی داواکاری ئەم چین و توێژانە بۆتەوە و بۆماوەیەکی دوورودرێژ لە چاوەڕوانی وەڵامی دامەزراوەکانی ئیمپراتۆرییەتی عوسمانی بوونە.

دووەم: یەکێک لە خەسڵەتەکانی کۆمەڵی کوردەواری لەسەدەی نۆزدەهەمدا بڵاوبوونەوەی ڕێبازی سۆفیگەرییە و بەتەواویی لەناوچەییەکی وەک قەزای ڕواندز و ناحیەکانیدا (باڵەکایەتیی، برادۆست و هەریر)، کە هەر لە پەیدابوونی ڕێبازی سۆفیگەریدا لە کوردستاندا یەکێک لە مەڵبەندەکانی بڵاوبوونەوە و بەهێزبوونی ڕێبازەکانی سۆفیگەری بوون، بۆیە لە دامەزراوەکانی ئیمپراتۆرییەتی عوسمانیی بەتەواویی لای لە تەکیە و خانەقاکانی قەزای ڕواندز کراوەتەوە، هەتا لەماوەی شەڕی یەکەمی جیهانیشدا داواکارییەکانی شێخەکانی ڕێبازی سۆفیگەری و سەرپەرشتیارانی خانەقا و تەکیەکانی قەزای ڕواندز لەلایەن بەرزترین دامەزراوەکانی ئیمپراتۆرییەتی عوسمانیی بەهەند

وەرگیراون، کە یەکێک لە دوورترین ناوچەکانی سەر سنووری خۆرهەڵاتی ئیمپراتۆرییەتی عوسمانی بووە هەر لەسەدەی شانزەهەم تا کۆتایی دەسەڵاتیی عوسمانییەکان لە چارەکی یەکەمی سەدەی بیستەمدا، ئەمەش کاریگەری ئەو شۆڕشەی (مەولانا خالیدی نەقشبەندی) کە لە سەرەتای سەدەی نۆزدەهەم لە کوردستانی سەردەمی عوسمانی و خۆرهەڵاتی ناوەڕاستدا بەرپای کرد، کە تا ئێستا بلێسەی ئەم شۆڕشە سۆفیگەرییە و نوێکردنەوەکەی هەر دەگەشێتەوە و بەردەوامیشی هەیە.

سێیەم: لەدوای نیوەی دووەمی سەدەی نۆزدەهەمدا، منەوەرانی کورد بەرێژەیەکی زیاتر لە جاران لە کوردستانی سەردەمی عوسمانییدا و بەتایبەتی لە قەزای ڕواندزدا ڕوویان لە شاری ئیستانبۆڵ کردووە، کە پایتەختی ئیمپراتۆرییەتی عوسمانیی بووە،بەڵام لەهەمانکاتیشدا ناوەندێکی گەورەی ڕۆشنبیری، خوێندەواری و بەستنەوەی هەموو ناوچەکانی سەردەمی عوسمانیی بە جیهانی دەرەوەدا بووە، هەروەها ناوەندی بەیەکگەیشتنی هەموو زانایان و خوێندەوارانی سەردەمی عوسمانیی لە هەموو ناوچە جیاوازەکان بەدرێژایی تەمەنی ئیمپراتۆرییەتی عوسمانییدا بووە، زانایان و خوێندەوارانی ڕواندزیش لەم ڕوانگەیەوە بۆ گەشت، داواکاری، پێشکەشکردنی بەرهەمەکانیان بە سوڵتان و کەسایەتییە پایەبەرزەکانی ئیمپراتۆرییەتی عوسمانی ڕوویان لە ئیستانبۆڵ کردووە.

چوارەم: دامەزراوەکانی ئیمپراتۆرییەتی عوسمانیی زۆر بەوردی چاودێری بارودۆخی ژیان و مانەوەی زانایانی ڕواندزیان لە شاری ئیستانبۆڵ کردووە، ڕۆژانە خەرجی تایبەتیان بۆ کاری ڕۆژانە و خۆراکیان بۆ دابینکراوە، هەتا بۆ کاتی گەڕانەوەیان لە ئیستانبۆڵ بۆ ڕواندز خەرجی گەڕانەوەیان بۆ دابینکردوون، ئەمەش پایە و گەورەیی ئەم زانایانە لەلایەن ئیمپراتۆرییەتی عوسمانیی زۆر بە بەرزی نرخێندراوە، یەکێک لە خەسڵەتەکانی کارگێڕی عوسمانی گرنگیدان بووە بە ژیان و بژێوی زانایاندا.

پێنجەم: لەنێو بەڵگەنامەکانیی عوسمانییدا چەند بنەماڵەیەک لە زانیارانی ڕواندز ڕیشەی خۆیان دەگەڕێننەوە سەر هاوەڵەکانی حەزرەتی موحەممەد پێغەمبەری ئیسلام (درودی خوای لەسەر بێت)، بەتایبەتی بۆ سەر ڕەچەڵەکی حەزرەتی بیلالی حەبەشی و عومەری کوڕی خەتتاب(خوا لێیان ڕازی بێت)، ئەمەش وەک نەریتێکی زۆربەری بنەماڵەی زانیاران و شێخەکانی ڕێبازی سۆفیگەری بووە، کە ڕەچەڵەکی خۆیان بردۆتەوە سەر بنەماڵەی پێغەمبەری ئیسلام و هاوەڵەکانی، کە لە ئیپمراتۆرییەتی عوسمانییدا بە چاوێکی زۆر پیرۆز و گەورەوە تەماشای ئەم ڕەچەڵەکانەیان کردووە، بەتایبەتی بنەماڵەی پێغەمبەری ئیسلام حەزرەتی موحەممەد (درودی خوای لەسەر بێت).

## لیستی سەرچاوە و پەڕاوێزەکان:

(١) جەرجیس سەبری ئەفەندی: لەزۆربەی سەرچاوەکانی بەردەست وەک: د.محمد علي الصويركي: معجم اعلام الكرد، من منشورات مؤسسه ژين، السليمانية، ٢٠٠٦، محمد امين زكى بك: مشاهير الكرد، من منشورات بنكەی ژين، السليمانية، ٢٠٠٥، مەلا طاهر مەلا عبدالله بەحرکەیی: مێژووی زانایانی کورد، بەرگ ١-٣، چ٢، نووسینگەی تەفسیر بۆ بڵاوکردنەوە و ڕاگەیاندن، هەولێر، ٢٠١٦، ممدوح مزوری: بنەماڵانی بەناوبانگی ڕواندز، چ٢، ناوەندی چاپ و بڵاوکردنەوەی جوندیان، هەولێر، ٢٠٠٩. باس لە ژیان و ڕۆڵی ئەم زانایە ناکەن، بۆیە ڕوو لە توێژەرانی مێژوو و زانایانی ئاینی لە ناوخۆ و دەرەوەی کوردستان دەکەم، کە هەر زانیارییەک لەسەر ئەم زانایان هەیە بۆ دەوڵەمەندکردنی ئەم وتارە زانستییە بۆ بەندەی بنێرن مایەی بێ پایانی سوپاس و پێزانینە، یان هەر توێژەرێکی بواری مێژوو و زانایانی ئاینی وتارێکی سەربەخۆی لەبارەی ئەم زانایە بنووسێت هەر سوپاسی دەکەم و دەستی ماندوونەبوونی دەگوشم.

(2) Osmanlı Arşivi Daire Başbakanlığı(BOA):A.MKT.UM.280/54-1.

(3) Osmanlı Arşivi Daire Başbakanlığı(BOA):A.MKT.MHM.160/72.

(٤) ڕەسووڵ مەستی کوڕی مەحموود بەگ: لە ساڵی ١٨٢٣ لە گوندی سەراوی کوندە لە ناوچەی شارەزوور لە دایک بووە، لەلای زاناکانی هەورامان، ڕواندز و سنە خوێندوویەتی، چۆتە ئیستانبۆڵ لە قوتابخانەی مولکییەی ئیستانبۆڵ زانستە سروشتیی و کردارییەکانی خوێندووە، بۆ دووجار مامۆستای منداڵەکانی وەزیری مەعاریفی عوسمانی (عەبدولڕەحمان سامی پاشا) بووە، مامۆستا بووە لە شارەکانی: مووسڵ، کەرکوک و بەسرا، دواتر بۆتە پشکێنەری پەروەردەی عوسمانی لە شاری وان، بەڕێوەبەری خانەی مامۆستایان لە شاری مووسڵ بووە و هەتا گەیشتۆتە پلەی بەڕێوەبەری پەروەردەی ویلایەتی مووسڵ، چەندین داهێنانی پێشکەشی ئیمپراتۆرییەتی عوسمانی کردووە، سەردانی هەر یەک لە وڵاتانی میسر و ئەوروپا کردووە، پێنج کتێبیی نووسیووە بەناونیشانی (حوادث عناصر ١٨٧٣، سير زلزله ١٩٠١، ڕسالة في تشريح الأفلاك، ڕسالة في إثبات واجب الوجود و عنوان الشرف)، ناوبراو دوای زمانی دایک(کوردی)، عەرەبی، فارسی، تورکی و فەرەنسی زانیووە، شایانی باسە لە ساڵی ١٩٠٨زدا لە ئشاری ئیستانبۆڵ کۆچی دوایی کردووە. شایانی باسە کوڕێکی بەناوی (مەجید بەرقی) ناسراو بە (مەستیزادە) هەبووە، کە ناوودەنگێکی زۆری لە ئیمپراتۆرییەتی عوسمانییدا هەبووە، بۆ زانیاری زیاتر بڕواننەوە ئەم سەرچاوەیە: الدكتور محمد علي الصويركي: معجم اعلام الكرد، من منشورات بنكەی ژين، السليمانية، ٢٠٠٦، ص ٢٨٧، و مەلا طاهر مەلا عبدالله بەحرکەیی: مێژووی زانایانی کورد، بەرگ ١، چ٢، نووسینگەی تەفسیر بۆ بڵاوکردنەوە و ڕاگەیاندن، هەولێر، ٢٠١٦، ل ٣٨٩-٣٩٠. و پ،ی،د. هێمن عومەر خۆشناو: مەستیزادە مەجید بەرقی لە بەڵگەنامەکانی عوسمانیدا، گۆڤاری خاڵ؛

گۆڤارێکی هزریی ڕۆشنبیریی وەرزییە، ژمارە(٢٩)، ئابی ٢٠٢٠، سلێمانی ل١٢٦-١٣١.

(5 )Osmanlı Arşivi Daire Başbakanlığı(BOA):A.MKT.MHM.163/75.

(6 )Osmanlı Arşivi Daire Başbakanlığı(BOA):A.MKT.UM.355/18-2.

(7) Osmanlı Arşivi Daire Başbakanlığı(BOA):A.MKT.MHM.178/54.

(8) Osmanlı Arşivi Daire Başbakanlığı(BOA):I.DH.452/299000.

(9 )Osmanlı Arşivi Daire Başbakanlığı(BOA):A.MKT.NZD.399/90.

(١٠) تەها ئەفەندی: ئەو سەرچاوانەی لەبەردەستی توێژەردان، باسی ئەم زانایە ناکرێت، بەڵام زانایەک لە ناوچەی باڵەکایەتیی هەبووە بەناوی مەلا تەهای کوڕی مەلا محەمەدی کوڕی مەلا عەبدوڵڵای کوڕی مەلا مەحموود لەنێوان ساڵانی ١٢٦٩-١٣٢٩ک/١٨٥٢-١٩١١ ژیاوە و لە نەوەکانی شێخەکانی گوندی شێخ وەتمانە لە ناوچەی باڵەکایەتییدا، چونکە تەها ئەفەندی کە موفتی پێشووی سەنجەق(پارێزگای ئێستا)ی ڕواندزی سەر بە ئەیالەتی بەغداد لەگەڵ شارەزوو بووە و لە ماوەی ساڵانی ١٨٦٠-١٨٦١ لە ئیستانبۆڵ بووە، بەتەمەن زۆر گەورەتر دیار دەکەوێت لە مەلا تەهای مەلای محەمەدی شێخ وەتمانێ کە ئەوکاتی تەمەنی ٨-٩ ساڵان بووە، بۆیە تەها ئەفەندی کە لە بەڵگەنامەکانی عوسمانییدا ناوی هاتووە جیاوازە لە ناوبراو، بۆ زانیاری زیاتر دەرباری ژیانی مەلا تەهای کوڕی مەلا محەمەدی کوڕی مەلا عەبدوڵڵای شێخ وەتمانێ بڕواننەوە ئەم سەرچاوەیە: ممدوح مزوری: بنەماڵانی بەناوبانگی ڕواندز، چ٢، ناوەندی چاپ و بڵاوکردنەوەی جوندیان، هەولێر، ٢٠٠٩، ل ٨٨.

(11)Osmanlı Arşivi Daire Başbakanlığı(BOA):A.MKT.MHM.305/6-2.

(12)Osmanlı Arşivi Daire Başbakanlığı(BOA):A.MKT.MHM.193/75-1.

(13)Osmanlı Arşivi Daire Başbakanlığı(BOA):A.MKT.MHM.193/75-2.

(14)Osmanlı Arşivi Daire Başbakanlığı(BOA):A.MKT.MHM.201/43-1.

(15)Osmanlı Arşivi Daire Başbakanlığı(BOA):A.MKT.MHM.204/91-1.

(16)Osmanlı Arşivi Daire Başbakanlığı(BOA):A.MKT.MHM.346/59-1.

(١٧) ناوەڕاستی ڕەمەزان: لە شێوەی نووسینی عوسمانی لەنێو سەرچاوە و بەتایبەتی بەڵگەنامەکانی عوسمانی دا، مانگەکانی ساڵی کۆچی دابەشی سێ کراون، بۆ نموونە مانگی شەعبان و مانگەکانی تر بەمشێوەیە دابەشکراون: ڕۆژی ١-١٠ سەرەتای مانگی شەعبان، ڕۆژی ١١-٢٠ ناوەڕاست مانگی شەعبان، ڕۆژی ٢١-٣٠ یان ٢١-٢٩ کۆتایی مانگی شەعبان، ئەمەش بە جیا دادەنرێت لەگەڵ ساڵنامەی زائینی و ڕۆمی..هتد. بۆ زانیاری زیاتر بڕواننەوە ئەم سەرچاوەیە:

Yrd.Doç.Dr.Ibrahim Caner Türk ve Yrd.Doç.Dr.Meriç Aybar(Hazırlayanlar): Osmanlıca Imla Müfredatı Okuma-Yazma Kılavuzu، Arı Sanat Yayınları، İsatnbul، 2016، S73.

(18)Osmanlı Arşivi Daire Başbakanlığı(BOA):I.MVL.484/21927-3.
(19)Osmanlı Arşivi Daire Başbakanlığı(BOA):MVL.415/87.

(٢٠) پیر محەمەد ئەفەندی: لە بەڵگەنامەکانی عوسمانییدا پیر محەمەد بە کوڕی عەلی لە قەڵەمدراوە، بەڵام لەوانەیە ناوی باوکی ناوێکی لێکدراو بووبێت وەک: ئەحمەد عەلی، بەڵام تەنها ناوی(عەلی)یان نووسیووە، یەکێک لە کێماسییەکانی نووسراوەکانی ئیمپراتۆرییەتی عوسمانیی نەنووسینی ناوی سیانییە، یاخود نووسینی ناوی یەکەم لەگەڵ پاشگرە باوەکانی وەک: ئەفەندی، ئاغا، پاشا..هتد، بەڵگەیەکی تریش ئەوەیە کە باسی گوندەکەیان دەکات بەناوی(شیمان) کە لەڕاستیدا (شیڤان)ە، ئەم گوندە لە سنووری کارگێڕی قەزای ئاکرێ لە ناحیەی بجیل دایە و یەکێک لە مەڵبەندەکانی بنەماڵەی پیرانی بادینان (سورچیان) بووە و پاڵپشت بەم دوو بەڵگەیە و بەتایبەتی بەڵگەی دووەم (ناوی گوندەکەیان)، ئەوا بەدڵنیاییەوە پیر محەمەدی کوڕی شێخ ئەحمەدی کوڕی شێخ عەبدوڵڵای کوڕی شێخ حاجی کە لە باکووری کوردستانەوە بۆ ناوچەی ئاکرێ و بجیل و گوندەوارەکانی هاتوونە و کەوتوونەتە سەر ڕۆژئاوای زێی بادینان، بەتایبەتی لە گوندێکدا بەناوی (گوندی کولەکان) نیشتەجێ بوونە، ئەم بنەماڵەیە بە پیری بادینان ناسراون و لەسەر ڕێبازی سۆفیگەری نەقشبەندینە، شێخ ئەحمەد باوکی پیر محەمەد ئەفەندی تەریقەتی نەقشبەندی لە شاری سلێمانی لە سەردەستی مەولانا خالیدی نەقشبەندی وەرگرتووە و دوای وەرگرتنی مۆڵەت لە مەولانا خالیدی نەقشبەندی بەشێوەیەکی سەربەخۆ کاری بۆ بڵاوکردنەوەی ڕێبازی سۆفیگەری نەقشبەندی لە ناوچەکانی ئاکرێ، هەریر و ڕواندز تا ناوچەی لاجان کردووە، هەربۆیە دوای مردنی لە ١٢٧٣ک-١٨٥٦ز، کوڕەکەی پیر محەمەد ئەفەندی دەبێتە جێگەداری باوکی و مورید و مەنسوبێکی زۆری لە دەوردا کۆ دەبێتەوە، یەکێک لە خەسڵەتەکانی ئەم پیرەی سۆفیگەرییە کردنەوەی قوتابخانەیەک بۆ زانستە شەرعییەکان و عەقڵییەکان بووە، مامۆستای زۆر باشی بانگهێشتی ناوچەکەی کردوون بۆ دەرسوتنەوە، کە ڕۆژانە مەڕێک یان بزنێکی بۆ خواردنی فەقێ و مامۆستاکانی سەربڕیوە، خودی پیر محەمەد کەسێکی زانا،لە خواترس، بێ فیز و ملکەچ بووە بۆ خوای گەورە، سەرەڕای ئەمانەش مامۆستاییەکی تایبەتی بۆ خۆی دابینکردبوو، لەبەرئەوە نەبووە کە نەخوێندەواری نەبووبێت یان شارەزای کاروباری شەرعی و زانستەکانی نەبووبێت، بەڵکو بۆ ئەوە بووە کە تا دەمرێت قوتابی زانست و فێربوون بێت و کە دەمرێت شەهیدی ئەو ڕێگەیە بێت، پیر محەمەد و شێخەکانی بنەماڵەی پیری بادینان بەهۆی ڕۆیشتنیان بۆ گەرمێن و کوێستان لەگەڵ هۆزەکەیان(سوورچی)، بەتایبەتی لەدوای گەڕانەوەیان لە کوێستانەکانەوە لە سەرەتای وەرزی پاییزدا، خەڵکێکی زۆر لە ناوچەکانی ڕواندزدا بۆ سەردانکردن و خواستنی دوعا دەگەیشتنە خزمەتی ناوبراو، تا ئەمرۆش کوێستان و هەواری مەڕدارەکانی هۆزی سوورچی لە ناوچەی ڕواندز و باڵەکایەتیین، کە ساڵانە لە گوندەکانی ئەم دوو ناوچەیە بەشێوەی کرێ وەریدەگرن، شایانی باسە پیر محەمەدی شێخ ئەحمەدی پیری بادینان(سورچییان) لە ساڵی ١٣٢٦ک-١٩٠٨ز کۆچی دوایی کردووە و لە گۆڕستانی (مەزارا سپی) لە گوندی(بجیل یان بجیلێ) نێژراوە، بۆ زانیاری زیاتر بڕواننەوە ئەم سەرچاوەیە: ممدوح

مزوری: سەرچاوەی پێشوو، ل ١٢٢-١٢٦.

(21)Osmanlı Arşivi Daire Başbakanlığı(BOA):A.MKT.MHM.221/79.

(22)Osmanlı Arşivi Daire Başbakanlığı(BOA):A.MKT.NZD.355/65.

(٢٣) گوندی شیمان: لە بەڵگەنامەکانی عوسمانییدا وەک گوندی بنەماڵەی پیری بادینان، پیر محەمەد ئەفەندی ناوی هێنراوە، بەڵام لە ڕاستیدا ناوی گوندەکە(شیڤان)ە، کە لە ئێستادا دەکەوێتە ناحیەی بجیل لە قەزای ئاکرێ لە پارێزگای دهۆک دا، ژمارەی دانیشتووانی بەپێی ئاماری حکومەتی کوردستان-عێراق لە ساڵی ٢٠٠٩دا نزیکەی (٢٨) کەس بووە، بەرهەمی سەرەکی ئەم گوندە: گەنم و جۆ و لەڕووی ئاژەڵداریشەوە: بەخێوکردنی مەڕ و بزن و ڕەشەووڵاغە، وادیارە لە نووسینی ناوی گوندی (شیڤان) هەڵەکراوە بە (شیمان) نووسراوە، ئەمەش دەریدەخات کە گوندەکانی دەوروبەری ئاکرێ سەر بە سەنجەق(پارێزگای ئێستا) و دواتر قەزای ڕواندزی لە ئەیالەتیی بەغداد بوونە، بۆ زانیاری زیاتر بڕواننەوە ئەم سەرچاوەیە: عەبدوڵلا غەفوور: فەرهەنگی جوگرافیایی دهۆک، چاپخانەی زانکۆی سەلاحەددین، هەولێر، ٢٠١٩، ل ٤٢٦.

(24)Osmanlı Arşivi Daire Başbakanlığı(BOA):A.MKT.NZD.351/100.

(25 )Osmanlı Arşivi Daire Başbakanlığı(BOA):A.MKT.NZD.356/62.

(٢٦) یەحیا بەگ قۆچ بەگ زادە: یەحیا نەزیری بەگ قۆچ بەگ زادە ڕواندزی، وەک مێژوونووسێکی کورد ناسێنراوە، هەرچەندە تەنها یەک کتێبی بەناونیشانی(تاريخ السلطان الغازي) دەربارەی مێژووی عێراق و شەڕەکانی سەردەمی عوسمانی نووسیووە، بۆ زانیاری زیاتر بڕواننەوە ئەم سەرچاوەیە: د.سەروەر عەبدولڕەحمان عومەر: ڕێبازی لێکۆڵینەوەی مێژوویی، چاپخانەی کارۆ، سلێمانی، ٢٠١٩، ل ١٦١.

(27)Osmanlı Arşivi Daire Başbakanlığı(BOA):A.MKT.NZD.324/75.

(28 )Osmanlı Arşivi Daire Başbakanlığı(BOA):A.MKT.NZD.331/73.

(29 )Osmanlı Arşivi Daire Başbakanlığı(BOA):A.MKT.NZD.368/55.

(30)Osmanlı Arşivi Daire Başbakanlığı(BOA):A.MKT.NZD.367/59.

(31)Osmanlı Arşivi Daire Başbakanlığı(BOA):A.MKT.NZD.392/31.

(32)Osmanlı Arşivi Daire Başbakanlığı(BOA):A.MKT.NZD.395/40.

(٣٣)عەبدولقادر ئەفەندی: ئەو سەرچاوانەی لەبەردەستی توێژەردان، زانیارییەکی ئەوتۆ لەسەر ناوبراو بەدەستەوە نادەن.

(34)Osmanlı Arşivi Daire Başbakanlığı(BOA):A.MKT.MHM.278/9.

(35)Osmanlı Arşivi Daire Başbakanlığı(BOA):A.MKT.NZD.249/93.

(٣٦)شێخ عەبدولغەفوور ئەفەندی: ئەو سەرچاوانەی لەبەردەستی توێژەردان، زانیارییەکی ئەوتۆ لەسەر خانەقا و خودی شێخ عەبدولغەفوور ئەفەندی کە سەرۆکایەتیی تەریقەتی نەقشبەندی لە قەزای ڕواندزدا کردووە بەدەستەوە نادەن.

(37)Osmanlı Arşivi Daire Başbakanlığı(BOA):A.MKT.MHM.317/34-1.

(٣٨) شێخ کەمالەددین: شێخ کەمالەددین کوڕی شێخ حاجی سەید شامییە، ڕەچەڵەکی خۆیان بۆ سەر ئیمامی حوسێنی کوڕی عەلی ئەبی تاڵب یان بۆ سەر سەیدەکانی حوسێنیە دەگەڕێننەوە، ئەم بنەماڵەیە لە دوای چارەکی کۆتایی سەدەی نۆزدەهەم لە خۆرهەڵاتەوە هاتوونەتە باشووری کوردستان لە گوندەکانی (زینوە و خەلان)ی ناوچەی باڵەکایەتیی نیشتەجێ بوونە، لە ئێستادا ئەم دوو گوندە لە سنووری ناحیەی حاجی ئۆمەران لە قەزای چۆمانی پارێزگای هەولێر دان، بەپێی سەرچاوەکانی بەردەست ئەم بنەماڵەیە تەریقەتی نەقشبەندییان لە (شێخ سەید تەهای نەهری یەکەم) وەرگرتووە. بۆ زانیاری زیاتر بڕواننەوە ئەم سەرچاوەیە: مەلا ئەحمەدی حەداد دەرگەڵەیی: ڕواندز، باڵەک، برادۆست، ئامادەکردن و پێداچوونەوە: زرار محەمەد مستەفا، چاپخانەی هێڤی، هەولێر، ٢٠١٥، ل ١٣٣-١٣٦.

(39)Osmanlı Arşivi Daire Başbakanlığı(BOA):I.HUS.170/24.

(40)Osmanlı Arşivi Daire Başbakanlığı(BOA):I.MMS.179/32.

(٤١)گوندی دارولئەمان یان تەکیەی دارولئەمان: لە ناوچەی باڵەکایەتییدا هیچ گوندێک بەناوی (دارولئەمان) تۆمار نەکراوە، بەڵکو تەکیە و خانەقای شێخ کەمالەددینی نەقشبەندی لە گوندی (زینوێ و خەلان) بەناوی (دار الامان تکیەسی) بووە، وەک ئەوەی لە بەڵگەنامەکانی عوسمانییدا تۆمار کراوە.

(42)Osmanlı Arşivi Daire Başbakanlığı(BOA):BEO.4246/318406.

(٤٣)سەید عەلائەددین یان شێخ عەلائەددین: کوڕی شێخ جەلالی کوڕی شێخ کەمالەددینی کوڕی حاجی سەید شامە، لە گوندی خەلانی ناوچەی باڵەکایەتیی دانیشتووە، خانەقا و تەکیەکەی لەسەردەمی خۆییدا لە گوندی (خەلان) زۆر هاموشۆی هەبووە و بۆ هەمیشە (١٠٠-٥٠٠) دەروێش و سۆفی تێیدا ئامادەییان هەبووە، لەهەمانکاتیشدا بە باخێکی گەورەی بەرهەمی(قەیسی) کە (٢٥) دۆنمی بووە ناوبانگی لەناوچەکە دەرکردبوو، زۆر یارمەتی هەژار و کەسانی لێقەوماوانی داوە، هەروەها ڕێزی کەسانی خوێندەوار و ڕۆشنبیری و ماموستایانی گرتووە، بۆ زانیاری زیاتر بڕواننەوە ئەم سەرچاوەیە: مەلا ئەحمەدی حەداد دەرگەڵەیی: سەرچاوەی پێشوو، ل١٣٣-١٣٦.

(44)Osmanlı Arşivi Daire Başbakanlığı(BOA):BEO.4445/333355.

(45)Osmanlı Arşivi Daire Başbakanlığı(BOA):DH.ID.177/27.

ئامادەکردن و ڕێکخستنەوەی: عادل صدیق عەلی

# لە هەڵەبجەوە بۆ بەرحوشتر

## بیرەوەری شایەتحاڵێکی تاوانی کیمیاییبارانی هەڵەبجە[1]



(١) ئەم دیدارە شەوی ٥-٢٠٢١/١/٦ لەگەڵ شایەتحاڵ لە ماڵەکەی خۆیان لە هەڵەبجە ئەنجامدراوە.

**پرسیار/ ئەکرێ خۆتان بناسێنن؟**

وەڵام/ ناوم نوری عەبدولکەریم عەبدولڕەحیم محەمەدە، باوکم خەڵکی گوندی بێژاوای چەند کیلۆمەتر ڕۆژئاوای هەڵەبجەیە، دایکیشم ناوی (ئەسمەر ئەحمەد مەحمود)ە و خەڵکی گوندی (گڵێجاڵ)ە، کە ئێستا ناوەندی ناحیەی بەمۆیە. من ساڵی ١٩٦٩ لە گەڕەکی پیر محەمەد لە نزیک مزگەوتی شێخ ئیسماعیل لەدایکبووم، ئێمە سێ برا و سێ خوشکین، من بووکترین کوڕی خێزانەکەمم، براکانی دیکەم حاجی محەمەد کە برا گەورەمە دوای ئەویش حاجی غەریب دێت. هەرچی خوشکەکانمە بریتین لە: توبا، ڕووناک، فاتمە. ئێمە لە بنەڕەتدا خەڵکی گوندی بێژاواین کە گوندێکی هاروونی نشینە، باوکم لە پەنجاکاندا هاتووەتە هەڵەبجە.

هەتا پۆلی شەشی ئامادەییم خوێندووە. یەکەمین قوتابخانەشمان لە کانی ئاشقان بوو، مەکتەبی ئیسلامی (دینی)یان پێ ئەگووت لە نزیک مەکتەبی حەمدوون بوو، مامۆستا جەلالی مەلا ساڵحی گەورە بەڕێوەبەری بوو. قوتابخانەکە عەرەبی بوو، دەرسەکانیشمان ئیسلامی بوون، دوای تەواوکردنی شەشی سەرەتای چووینە-مەعهەدی ئیسلامی. مەعهەدەکە-لە گەڕەکی (کانی قوڵکە) و لە خوار مزگەوتی عومەری کوڕی خەتابی ئێستاوە بوو، کە مامۆستا مەلا تاهیر بامۆکی پێشنوێژ و وتارخوێنییەتی. ئەوکات مامۆستا فەرهادی زاوای مامۆستا مەلا عوسمان عەبدولعەزیز بوو بەڕەحمەت بێت بەڕێوەبەری بوو، ئێستا لە ژیاندا نەماوە و کۆچی دوای کردووە.-ئێمە لە یەکی ناوەندی چووینە ئەو مەعهەدە، پۆلی یەک و دووی ناوەندیمان خوێندوو ئێتر کیمیابارانی بەسەردا هات.

**پرسیار/ ئەوکاتە تەمەنت شمولی ئەوەی نە ئەکرد تێکەڵاوی گرووپ و ڕێخراوە سیاسییەکان ببیت؟**

وەڵام/ نیسبەتێک ئەیکرد، کەمێکیش ئاگاداری بەشی تەنزیماتی پێشمەرگە بووم، بەڵام بەوشێوە نەبوو کە بەشداربم. زیاتر ئاگاداری ڕێکخستنەکانی پارتی بووم، بەوپێیەی هەندێک خزممان لەناو پارتیدا بوون.

**پرسیار/ ئەڵێن بەعس لە هەر خوێندنگایەکدا خەڵکانێکی هەبووە بۆ چاودێریکردن و ڕاکێشانی مامۆستایانی ئەو خوێندنگە؟**

وەڵام/ بێگومان هەبوو، هەموو مەکتەبێک ئەوانەی تیابوو، (ح.م)ێک هەبوو سەرەتا ئەو (طلائع)ی هێنایە هەڵەبجە. نازانم لە چ مەکتەبێک بوو، بەڵام دەزانم سەرەتای (طلائع) ئەو لە هەڵەبجەدا دروستی کرد، بەڵام ئێتر زۆر و زۆرکاری تێدا نەبوو بۆ ئەندامبوون، ئەهاتن پێیان ئەگووتی کە ببی بە ئەندام. بە هەموو کەسێکیان ئەگووت، ئەشیاننووسی

که حیزبیت یان موستەقیلی(سەربەخۆ).

مەبەستیان لە حیزبی بوونەکەش بەعسی بوون بوو.-ئێمە ئەوکاتە وەکو مسولمان پێمان خۆش نەبوو کە ببین بە ئەندامی حیزبی بەعس، جگەلەوەش کورد-بەگشتی بەعسی دوژمنی خۆی ئەزانی. کەواتە ئێمە دوو جار بیانوومان هەبوو بۆ ئەندام نەبوون لەناو ئەو حیزبەدا، ئەمە جارێک فاکتەری ئاینی جارێکی تریش فاکتەری نەتەوەیی بوو، کە بەعسمان بە دوژمنی کورد ئەزانی.

**پرسیار/ لە ساڵی ١٩٨٧ لە هەڵەبجە خۆپیشاندان و ناڕەزایەتییەک روویدا، ئێوە چۆن ئاگاداری ئەو خۆپیشاندانە بوون؟**

وەڵام/ ڕۆژی ڕووداوەکە(١٣ی ئایار) لە نزیک بانگی عەسر من گەڕامەوە بۆ ماڵەوە، سەیر دەکەم مقۆ مقۆ و دەنگۆی ناڕەزایی و خۆپیشاندان هەیە، منیش ڕۆیشتم بۆ ماڵی-توبای خوشکم، تەماشا ئەکەم باسی ڕاکردن ئەکەن، ئەڵێن حیزبی-بەعس وامان لێ دەکا و ئەمەمان لێ دەکات، تەکبیری ئەوەیان ئەکرد کە-چۆن لە شار دەربچن. بڕیاردرا دوای نوێژی مەغریب دەرچین. وتیان خەڵک زۆر دەرەچێت، ماڵی توبای خوشکم وتیان ئێمەش لەگەڵ خەڵکدا ئەڕۆین، منیش هاتمەوە بۆ ماڵەوە، لەگەڵ حاجی غەریبی برامدا وتمان ئەڕۆین، باوک و دایکم زۆر هاواریان کرد کە نەڕۆین. ڕاستییەکەی ترسەکە زۆر بوو، بۆیە ئێمەش بڕیاری دەرچوونماندا، دوای بانگی مەغریب ڕۆیشتین بۆ پشتی کارگەی تووتن(طنقیح)ەکە، لەوێ ناونیشانی ماڵێکیان پێدابووین، ئێستا بیرم نایەت کە ماڵی کێ بوو، بەڵام ماڵی پورە ڕەعنام لە نزیک ئەو ماڵە بوو.

کاتێک گەیشتینە ماڵەکە سەیردەکەین شەست حەفتا نەفەرێک لەوێ کۆبوونەتەوە، هەمووی باسی لەوە ئەکرد لەکێوە بڕۆین و لەکوێوە دەرچین. کاتیش لە نێوان مەغریب و عیشادا بوو، پیاوە گەورەکان بڕیاریاندا کە بچینە مەجموعەی زەمەقی، لەویش ماڵێک هەبوو لە کۆتایی زەمەقییەوە چووینە ئەو ماڵە. ڕاستییەکەی ناوی ئەو ماڵەشم بیر نەماوە، چونکە ئێمە ئەوکاتە منداڵ و تەلەبە بووین و تێکەڵی زۆرمان نەبوو لەگەڵ خەڵکە بەتەمەنەکەدا، ئەوەندە ئەزانم ماڵەکە خەڵکی گوندی پریس بوون، نیوسەعاتێک لە ماڵەکە ماینەوە، کاتێ ئێمە گەیشتینە ئەوێ نزیکەی پەنجا بۆ شەست کەسی تری لێ بوو. بە هەموویەوە ژمارەمان گەیشتە نزیک (١٢٠) کەسێک، دە بۆ پانزە چەکدارمان لەگەڵ بوو، ئەڵبەت ئەو چەکدارانە پێشتر سەر بە حکومەت بوون، بەڵام لەوکاتەدا وەکو دەلیل لەگەڵ خەڵکەکەدا بوون.

**پرسیار/ کەسیانت ئەناسی؟**

وەڵام/ ئێستا هەتا ئەو کاتە نەخێر، بەڵام کۆمەڵێک لە خەڵکە مەدەنییەکە چەکی پێ بوو، نزیکەی (٣٠) چەکێکمان پێ بوو، واتە بە چەکدارە جاشەکان و هاوڵاتییەوە. من ئەوکاتە ئەوەندە گەورە نەبووم کە بڵێم چەکم هەڵگرتبوو، دوای ئەوە وتیان با بڕۆین بەرەو گوندی حەسەن ئاوا کە دێیەکە لە پشتی زەمەقییەوە،-بەرلەوەی بگەینە گوندی حەسەن ئاوا چەمێکی لێ بوو، لەکاتی پەڕینەوەدا لە چەمەکە زیاتر لە دە کەس کە نەعلی لە پێ دا بوو لە ئافرەت و منداڵ نەعلەکانیان ئاو بردی.

**پرسیار/ کەواتە جگە لە پیاو کوڕی گەنج و ئافرەت و منالیشتان لەگەڵ بوو؟**

وەڵام/ هەر خێزان نزیکەی چل خێزان ئەبوو، زۆر زۆر تاریک بوو، بەڵام ئیتر دەلیلەکانمان شارەزابوون، دوای ئەو چەمە ئیتر چەمی حەسەن ئاوای پێدەڵێن لەوێوە بە دۆڵێکدا کەوتینە ڕێ بەرەو ناوچەی نەورۆڵی، لە ترسی ئاشکرابوون نەیان ئەهێشت لایت و چرا دابگیرسێنین، بیرمە منداڵی ساوا بە باوەشی-دایکییەوە ئەگریا دەسیان ئەنا بەدەمیدا هەتا نەگریی و دەنگی دەرنەیەت. ئەو شەوە هەتا سەعات دوو بەو دەشت و دۆڵ و کێوانەی کە هاتنە ڕێگەمان ڕێگەمان کرد هەتا گەیشتینە گوندی سەراوی ناوچەی نەوڕۆڵی.

**پرسیار/ واتە لە ناوچە ئاوەدانەکانەوە نەدەڕۆشتن؟**

وەڵام/ نەخێر بە کەژ و یاڵ و دۆڵەکاندا و دوور لە ئاوەدانی ڕێگەمان ئەبڕی هەتا لە کۆتاییدا گەیشتینە ناو باخێک، وتمان ئێرە کوێیە، وتیان ئەمە گوندی سەراوە. لەوێ کەمێک ئیسراحەتمان کرد، من وەک خۆم لە مەجموعەی زەمەقییەوە کوڕێکی خوشکەزام بەناوی بیلال قادر بەکۆڵمەوە بوو بە پشتێنەکەم بەستبوومەوە بە کۆڵمەوە، لە سەراو پشتێنەکەم لێکردەوە و تۆزێ ئیسراحەتم کرد. دوای ماوەیەک لەوێشەوە بەڕێکەوتین هەتا گەیشتینە گوندی هانەژاڵە.

**پرسیار/ واتا ماڵ ئەو خوشکەت لەگەڵ ئێوەدا بوون؟**

وەڵام/ بەڵێ، ماڵی ئەو خوشکەم لەگەڵ ئێمەدابوون، وەک گووتم بڕیار بوو هەمووومان لە ماڵەکەی پشت کارگەی تووتنەکەوە یەک بگرین، ئیتر ئەوانیش لەوێ بوون بەیەکەوە دەرچووین بەرەو گوندی هانەژاڵە. زۆر حەزەرمان ئەکرد، چونکە ئەو یاڵانە زۆربەیان ڕەبایەی پێوە بوو، هەتا گوێی(کەناری)- سیروان ڕەبایەی حکومەت هەبوو، بەڵام کە چوویتە هانەژاڵە ئیتر بوار نامێنێ، ئەبوو بە جادەدا بڕۆیت، شاخەکەش سەختە لەبەرئەوە کەس نەیدەتوانی پیایدا هەڵگەڕێت، لەبەرئەوە ئێمەیان لە کەلاوەیەک دانا، کەلاوەکە خانوویەکی ڕووخاو بوو، وتیان لێرە دانیشن. لەسەر ڕێگاکە ڕەبییەکی عەسکەری لێ بوو، سەیتەرەیەکیان دانابوو، کۆمەڵێک لە پیاوە گەورە و ڕیش سپی و چەکدارەکان ڕۆیشتن، وتیان ئەڕۆین قسەیان لەگەڵ

ئەکەین ئەگەر ڕێیان پێداین-بڕۆین ئەوە بێکێشە دەرئەچین و ئەڕۆین، خۆ ئەگەر ڕێگەیان پێ نەداین ئەوە بە تەقە-ئەچینە سەریان هەتا ئەیانگرین، ئەو کاتە هەر ئەو دووڕێگە چارە هەبوو، یا ئەبوو تەقەت بکردایە و بە شەڕ دەربچوویتایە یان ئەبوو ڕێکەوتنیان لەگەڵ بکرایە، نزیکەی سەعاتێکیان پێ چوو ئەنجا گەڕانەوە، شوکور بۆخوا ڕێگەیاندابوو کە دەربچین، دوای گەڕانەوەیان وتیان ڕێگەیان پێداوین با بێدەنگ دەرچین. لەوپێشەوە ڕێمان کرد هەتا گەیشتینە گوندی کەوتە، لە کەوتەوە دابەزین بەرەو ئاوی سیروان، کە گەیشتینە سەر ئاوەکە یەک دوو نەفەر هەر بە مەلە لە ئاوەکە پەڕینەوە بۆ بەری ئێران، ئەمەی ئەیڵێم دوای سێی شەوە، وەخت زۆر درەنگ بوو، تەبعەن پێشتر ئێرانییەکان ئاگادار کرابوونەوە.

ئەوەش بڵێم کاتێک ئێمە گەیشتینە ئەوێ تەماشامان کرد خەڵکێکی زۆر لەوێیە. لەوانە: مامۆستا مەلا عوسمان، مامۆستا مەلا عەلی، مامۆستا مەلا عومەر، ئەوانە خەڵکێکی زۆریان لەگەڵ بوو، ئەوانیش لە قۆڵێکی ترەوە هاتبوون، ئەوان پێش ئێمە گەیشتبوونە سەر ئاوەکە، ئەوان پەیوەندییان کردبوو بە ئێرانییەکانەوە کە خەڵک دێت و بێن- بەدەمانەوە، ئێرانیش ئامادەکاری کردبوو بۆی، کە ئێمەش گەیشتین لە وەجبەی ئێمەش دوو نەفەر کردیە ئەوبەر، هەڵبەت بە پرس و ڕای ئەو مامۆستا و جەماعەتەی کە لەوێ بوون، وتیان کێ ئەتوانێ بدا لە ئاوەکە پەیامێکمان پێیە بیگەیەنێت بە پاسدارەکان لەوبەرەوە، دوو نەفەرەکە بە مەلە ڕۆیشتنە ئەوبەر، پەیامەکەیان گەیاند و زۆریان پێنەچوو-کەڵەکیان ناردە ئەمبەرەوە، کەڵەکەکان حەبلیان پێوە بەستبوو لەمبەر ئاوەکەوە بۆ ئەوبەری ئاوەکە، کەڵەکەکان چووپی تایەی گەورەی مەکینە بوون، تەختەیان خستبوونەسەر و بە حەبل بەستبوویانەوە بەچوومەکەوە، هەر دانەیەکیان دوو حەبلیان پێوە بەسترابوو، پێنج پێنج و شەش شەش نەفەر بەپێی حەجمی نەفەرەکان سەرئەکەوتن، ئەگەر کێشیان زۆر نەبوایە تا حەوت نەفەریش کێشەی نەبوو، لەمبەرەوە ئێمە ڕامان ئەکێشا و لەوبەرەوە پاسدار، بیکیش بیکیش ئەیان بردینە ئەوبەرەوە، بەوشێوەیە هەمووومان ئەو شەوە چووینە ئەوبەرەوە.

**پرسیار/ یەک کەڵەک بوو یان چەند دانەیەک؟**

وەڵام/ یەک دانە بوو، بەڵام چوپێکی تایەی سەیارەی گەورە چەند تەختەیەکیان خستبووە سەر بە-حەبل چاکیان کردبوو، من نزیکەی سەعات و نیوێک لەوێ وەستام ئەنجا-سەرەم هات بۆ پەڕینەوەکە، جارجاریش حەبلەکان لەناو ئاوەکەدا گیر ئەبوون لە دار و شت، بەوهۆیەوە کەڵەکەکە مەسافەیەک دوورەکەوتەوە دواتر حەبلەکەیان ڕزگار ئەکرد و کەڵەکەکەیان ئەهێنایەوە و ڕایان ئەکێشا هەتا ئەیانکردنە ئەوبەرەوە، وەزعێکی ناخۆش بوو، لەگەڵ ماڵی خوشکەکەمدا بەیەکەوە پەڕینەوە و لەوبەریشەوە

هەر بەیەکەوەبووین، کە گەیشتینە خاکی ئێران هاوکاری زۆریان کردین.

بەدروستی، لە گوندی کەوتە(کەوتەی کۆن)ی خۆمانەوە پەڕینەوە بەری ئێران، بەری ئێران پێیان ئەگووت (قن سەخت)، ئێرانییەکان (فستەق، ناوکەکولەکە،-گوڵەبەرۆژە، ئاوی خواردنەوە، بسکیت، شیری منالّ، مەمکەمژە... تاد)، هێنابوویە-گوێی ئاوەکە، هەرکەس پێویستی بە خواردن بووایە پێیان دەدا، دوای کەمێک پشوو دەبوو کەژێکی زۆر سەخت کە نزیکەی نیو سەعات سێ چارەکێک ڕێگە ئەبوو ببڕین ئەنجا دەگەیشتینە ڕێگا سەرەکییەکە، ئەوەش بۆ کوڕێکی ئازا کە ئەوکاتە ئێمە گەنج بووین ئەمانتووانی،-کاتێک گەیشتینە سەر ڕێگاکە تەماشا دەکەین سەیارەیەکی زۆر هاتووە و چاوەڕێی خەڵکە ئاوارەکە ئەکات. زۆربەی سەیارەکانیش میکزەمینی ئێرانی بوون، لەوێ سواریان کردین، دوای ماوەیەک لە ڕێکردن لە شوێنێک دایان بەزاندین، کە مزگەوتێکی لێ بوو، ئەو شوێنە پێیان ئەوت قن سەخت، قن سەخت لادێ بوو. لە بەحرەکەش کە چووینە ئەوبەر هەر پێیان ئەگووت قن سەخت، چواردەوری ئەو-دێیە سنوری ئەوانە. تاریک بوو نەیاندەهێشت زۆر بگەڕێیت، خۆشمان زۆر هیلاکبووین خەومان ئەهات و برسیشمان بوو. تەقریبەن پێش مەلا بانگدان بوو، لەوێ دایان ناین، بڕوابکە ماوەی سەعاتێکی نەبرد چێشت و نان و خواردنیان بۆ هێناین. بەڕاستی نان و ئاو و خواردنێکی باشیان-دا بە خەڵک. وەک قسعەی عەسکەری هەرکەسە بەشی خۆیان پێ ئەدا، وتیان بۆ خۆتان ئیسراحەت بکەن و بخەون. لەوێ ماینەوە هەتا ڕۆژ بوویەوە، لە نزیک سەعات هەشت و نۆی بەیانی دیسان سەیارەیان بۆ هێناین-سەریان خستین بۆ سەلاسی باوەجانی. نزیکەی سەعات و نیوێک بە میکزەمینی بەڕێوەبووین هەتا گەیشتینە لادێیەک لە سالاسی باوەجانی، مەکتەبێکی گەورەی هەبوو، حەوشەکەشی گەورە بوو، هەر لە حەوشەکەدا شەست حەفتا خێمەیان هەڵدا بوو.

ئەوەی کە سەڵت(زگورد) بوو لە ڕیزی خوارەوە دایان-دەنا، ئەیانگووت چوار چوار و پێنچ پێنچ خۆتان ڕێکبکەون و بڕۆنە-خێمەیەکەوە. ژوورەکانی مەکتەبەکەش پێنچ عایلە و شەش عایلەیان تێ دەکرد. ئیتر بەپێی گەورەیی ژورەکان، هەندێک لە ژووری مەکتەبەکە -گەورەتر بوو هۆڵێکی داخراوی لێ بوو نزیکەی بیست عایلەی تێ چوو بوو. چوار عایلە و -پێنچ عایلە و شەش عایلە ئەچوونە یەک ژوور. وەلحاسڵ ئەوەی ئەو شەوە چوویە بەری ئێرانەوە هەر هەمووی-لەو مەکتەبەدا کۆکرایەوە.

ئەو شەوەش کەشوهەوا خۆش بوو، باران و شت نە بوو، نە سارد بوو نە گەرم، جەوێکی خۆش-بوو، بەڵام زۆر تاریک بوو، کەس بەرقاچی خۆی نە ئەبینی.

**پرسیار/ لێرەوە کە ڕۆشتن هیچ جل و بەرگێکتان پێبوو یان هەر بە سەڵتی ڕۆشتن؟**

وەڵام/ هەندێکی عەلاگەیەک و هەندێکیشی گوێنییەک پێداویستی پێ بوو، بەڵام ئێمە وەکو-خۆمان هیچمان پێ نەبوو، تەنانەت بیریشمان لەوە نەکردەوە کە هیچ شتێک لەگەڵ خۆمان بەرین، من وەک خۆم هەژدە دیناری ئەوکاتەم پێ بوو، لە گیرفانی خۆمدا بوو، داوای پارەم لە ماڵەوە نەکردبوو، بەکورتی خەڵک بیری لەوە نەکردبوویەوە کە کەمێک پێداویستی لەگەڵ خۆی ببات، ترسەکە زۆر بوو بۆیە تەنها بیریان لەوە کردبوویەوە کە چۆن ڕزگاریان بێت. ماوەی نزیکەی سێ مانگێک لەناو مەکتەبەکەداماینەوە.

**پرسیار/ خۆشتن و خواردنتان چۆن بوو؟**

سەبارەت بە خواردن و خۆشتن، حەمامێکی تێدا بوو، عمومی بوو، بەپێی ناو بوو، هەفتانە سەرەت ئەهات، واتە هەفتانە ڕۆژێک ڕێگەت پێ ئەدرا خۆت بشۆی. بەنیسبەت خواردنیشەوە ڕۆژانە بەشە خواردنیان دابەش ئەکرد، جەماعەتێک تەباخ بوون و ڕۆژانە خواردنیان دروست ئەکرد، ئەو جەماعەتە ئێرانی و فارس بوون، خواردنەکە بە لۆری ئەیان هێنا، کە بریتی بوو لە: برنج، ڕۆن، شەکر، مریشک، گۆشت... تاد، لەڕاستیدا خزمەتێکی تایبەتیان ئەکردین، دوو ڕۆژ جارێک-مریشک هەبوو، ئەگەر ئەمڕۆ گۆشت هەبووایە بەیانی مریشک هەبوو، ڕۆژی دوای ئەوە-ئەیانکردەوە بە گۆشت، ئیتر بە جۆری جیاواز شلەکان دروست ئەکرا، باوەڕ ناکەم کەموکورتییان هەبووبێت لە دابینکردنی پێداویستی و خۆراک، مەبەستم ئەو کاتەیە کە ئێمە لەو مەکتەبە بووین.

**پرسیار/ ئەی جلوبەرگ و پێداویستی تر؟**

وەڵام/ جلوبەرگی کۆنەی خەڵکیان ئەهێنا، یارمەتیان دەنارد بۆمان، بەشێکی ئەو خەڵکە ئاوارە خزم و کەسوکاری هەبوو لە ئێران، بۆیە خزم و کەسوکارەکانیان یارمەتییان بۆ ئەهێنان. لە سەرەتاشدا نەیاندەهێشت کەس بڕواتە دەرەوەی مەکتەبەکە، جگە لە پیاوە گەورەکانی وەک مامۆستا مەلا عەلی و مامۆستا مەلا عوسمان، ئەوانە خەڵکانێکی دیار و ناسراوبوون، ڕێگەی ئەوانیان ئەدا، ئەوان بەتەمای دروستکردنی حیزب و شت بوون، ئێران خۆشی پێشتر ئاگادار بوو لەوە. ئەگینا وەکو خەڵکە مەدەنیەکەی تا دوو مانگ نەیان هێشت بڕۆنە دەرەوەی مەکتەبەکە دوای دوو مانگەکە وەرەقەی ڕێگە پێدانیان-ئەکرد بۆ شەوێک بۆ دوو شەو بۆ سێ شەو، ئیتر لە سێ شەو زیاتر نەبوو.

**پرسیار/ دوای ئێوە ڕۆژانی داهاتووش خەڵک دەهات؟**

وەڵام/ خەڵک ئەهات، بەڵام بەو زۆرییە نەبوو، ڕۆژانە دوو عایلە و سێ عایلە و چوار عایلە ئەهات. تەقریبەن تا پانزە شەو خەڵک ئەهات، لە دوانزە و سیانزە و چواردەدا یەک عایلە و دوو عایلە ئەهاتن.

**پرسیار/ لەوانەیە بۆ شوێنی تر ڕۆشتبن بۆ لای ئێوە نەهاتبن؟**

نەخێر تەنها ئێمە بووین لەوێ، ئەوکات شەڕی ئێران و عێراق بوو، چەند جارێک هاتن ئەیانگووت تەیارە بۆردومانتان ئەکات، دوو سێ جار تەیارەی عێراق هاتوچۆی کرد بەسەر ناوچەکەدا. بۆیە خێرا سەیارەیان ئەهێنا ئەیانگووت ئینزار کراوین سەرکەون، یەک نەفەریان نەئەهێشتەوە، دووریان ئەخستینەوە بۆ ناوچەیەک پێیان ئەگووت(چوچان)، لە لادێیەک دایان ئەنان کە سەعات و نیوێک دوور بوو لە شوینی خۆمانەوە. تا ئێوارە لەوێ-ئەبووین و ئێوارە ئەیانهێنانەوە بۆ شوێنی خۆمان. ئەم حاڵەتە چەند جارێک دووبارە بوویەوە، بەیانیان سەریان ئەخستین و ئەیانبردین، ئێوارە ئەیانهێنانەوە.

**پرسیار/ دوای سێ مانگەکە چیتان بەسەرهات؟**

وەڵام/ دوای سێ مانگەکە وردە وردە سەرما هەڵیکرد، ئێستا جەو گۆڕاوە، ئەوکات وەک ئێستا نەبوو دنیا هەر ئاو بوو، ساڵ هەبوو مانگی نۆ پەڵەی داوە. خەڵکەکە بیری لەوە ئەکردەوە زستان لە کوێ بەسەر بەرێت. من ئەوکاتە بە حوکمی ئەوەی کە سەڵت بووم زوو زوو ئەڕۆشتمە دەرەوە، بەرپرسی ئۆردوگاکە پیاوێکی باش بوو بووبە هاوڕێم، زوو زوو بانگی ئەکردم بە سەیارەکەی خۆی ئەیبردم بۆ جوانڕۆ و ڕوانسەر.

سەبارەت بەجۆری ڕەفتاریان لەگەڵ ئاوارەکاندا، ئەو ساڵە کە ئێمە ڕۆیشتین هەر بتگووتایە عێراقیم-(ئەوکاتە هەڵەبجە ناوی نەبوو) ئیحترامت هەبوو، سەد جار سواری سەیارە ئەبووین کە لە شارێکەوە ئەڕۆشتین بۆ شارێکی تر پارەیان لێ وەرنەدەگرتین، کە قسەت ئەکرد ئەیانزانی عێراقیت یان ئێرانی، پرسیاریان لێ ئەکردی خەڵکی کوێیت؟ ئەمانگووت عێراقین یان هەڵەبجەیین ئیتر کرێی سەیارەکەیان لێ وەرنەدەگرتین. من لەبەرئەوەی هەر خۆم بووم و خێزاندار نەبووم، کۆمەڵێ خزمان هەبوو لە ڕوانسەر چووم بۆ ماڵی ئەو خزمانە.

دوای ئەو سێ مانگە حکومەت بیری لەوە کردەوە بەرەو زستان ئەڕۆین و ئەوانیش مەکتەبەکەیان پێویست بوو، شوێنێکیان بۆ دیاری کردین لە نزیک شارۆچکەی پاوە، پێیان ئەوت سەریاس، سەریاس لە بەردەمی کەژێکدا بوو، ئاو و باخی لێ بوو، شوێنێکی خۆش بوو، خێمەیان بۆ ئاوارەکان هەڵدا. لە سەرەتاشدا-بەس خێمە بوو، تەوالێتەکانیش بە خێمە و گوێنی دروستکرابوون، ئاوارەکانیان لەوێ جێگیر کرد، هەر خێزانێک لە پێنچ کەس زیاتر بووایە دوو خێمەیان پێ ئەدا، لە پێنچ کەس کەمتریش یەک خێمە.

زگوردەکانیش (٢٠٠)مەتر لە خوار عایلەکانەوە خێمەیان بۆ هەڵدان، وتیان ئەمە شوێنی زگوردەکانە، ئیتر خۆمان چوار چوار لەگەڵ ڕەفیق و برادەردا ڕێکەوتین و لەوێ ماینەوە.

من وەک خۆم ئەو زستانە لەوێ نەمامەوە، بەڵام خەڵکەکەی تر زستانیان لەوێ بەسەر برد، ئەو زستانە بەفرێکی زۆر باری، ئێرانییەکان کە زانیان خێمەکان دەرەتان تیایاندا قورسە ڕێگەیان بە خەڵکیدا ڕووبکەنە ناو شار و لادێکان بۆ لای خزم و ئاشناکانیان، یاخود شوێنی نیشتەجێبوون بۆ خۆیان بدۆزنەوە.

لە ئۆردووگای سەریاس، خواردنی حازر نەما، وشکەیان پێ ئەداین، کە پێیان ئەگووت(جیرە)، مانگانە بەشە خۆراکیان بەپێی ژمارەی ئەندامانی خێزان یان خێمەکە پێ دەدایت. بەکورتی بە هەموو شێوەیەک هاوکاری هەبوو، تەنانەت تەئسیساتی ئاویان بۆ ئۆردووگاکە کرد.

> **دوای بانگی عیشا لە سەرووی شەخسەکەی گوڵانەوە مەکینەیەك بەهێواشی لە پێشمەوە ئەڕۆیشت. فرسەتم هێنا و سەرکەوتم، لە هەر شوێنێکی ناو عەرەبانەکە قاچم دائەنا هەر نەرمایی بوو، تومەز هەمووی لاشەیە، نزیکەی پازدە تەرمی تێدابوو، تەنها یەك ژنی بەتەمەن لەلای سەرووی عەرەبانەکەوە دانیشتبوو، هۆرەیەکی خەمناکی ئەچڕی!!**

بەگشتی حکومەتی ئێرانی خۆی ئیدارەی ئەو هاوکارییانەی ئەکرد، وەکو سەردەمی بەعس لای خۆمان چۆن بایەعات هەبوو، کە ئەهات هەموو پێداویستییەکی تیابوو، یانی ماڵێک چی پێویستبوو بیخوات حکومەت مانگانە بۆی دابین ئەکردن، ئەڕۆیش لای بایەعەکەی وەریدەگرت، بەڵام لەوێ ئێمە خۆشمان نەدەچووین، بەڵکو هەموو خواردنەکان ئەکرایە گوێنی، عایلەیەک چەنی پێویستبووبێ لە (نۆک، فاسۆلیا، برنج، نیسک ... تاد) ئەکرایە گوێنیەک و سەری مانگ بەپێی ناوی خۆت کە ئەخوێنرایەوە پێت دەدرا.

**پرسیار/ ئەنجومەنتان هەبوو؟**

وەڵام/ لەوکاتەدا ئێمە لەگەڵ مامۆستا مەلا عوسمان و ئەواندا بووین، ئەوانیش خۆیان هەموو شتێک بوون، ئەوان لەگەڵ دەسەڵاتدارانداا دائەنیشتن، بەڵام بازگەیەکیان دانابوو لە چواردەوری خەڵکەکە و ئوردووگاکە، بازگەکە ئێرانی تیابوو، بۆ دەرچوون و هاتنە ناوەوە بۆ ئۆردووگاکە پێویست بە بەڵگە هەبوو، یان بڕۆیشتیتایە بۆ ناو شار دەبوو ئیجازە بکەیت.

لە سەرپاسیش بە بەڵگە ئەڕۆیشتی و ئەگەڕایتەوە، بەڵام زۆر ڕێگریان نەدەکرد و کێشەیان بۆ دروست نەدەکردی، ڕۆژێک ترس دروست بوو، دەنگوباس هەبوو دیموکرات هاتوون و داویانەتە ئەو کەژ و کێوە، گوایە هاتوون بۆ گرتنی مامۆستا مەلا عوسمان و مامۆستا مەلا عەلی....و ئەو جەماعەتەی کە ئیعلانی حەرەکەیەکی ئیسلامیان کردبوو، بۆ تەعقیبات قواتێکی ئێران هات ئەو ناوە هەمووی گیرا، خەڵک ترسی لێنیشت.

**پرسیار/ تا چەند ئێوە ئاگاداری دروستبوونی بزوتنەوە بوون؟**

وەڵام/ من وەکوو خۆم هەر لە هەڵەبجەوە ئاگاداربووم کە ئەم کۆمەڵە پیاوە بەڕێزە ئەیانەوێت ڕزگاریان ببێت لە دەست ئەم زوڵمە و ڕابکەن بۆ ئێران و لەوێ ئیعلانی جیهاد بکەن. ئێمە ئاگاداری ئەوە بووین. ئێمە کۆمەڵێک تەلەبە بووین لە مزگەوتی شێخ ئیسماعیل لە گەڕەکی پیرمحەمەد دەرسی قورئانمان ئەخوێند، مامۆستاکەمان ناوی عوسمان حەسەن بوو، دواتر بەیەکەوە بڕیارماندا کە بڕۆین. ئەوانەیان کە بیرم مابن: بایەر عەبدولمحەمەد، حەمەسەعید عەبدولقادر، یاسین عەلی حسێن بوون، نزیکەی ٢٠ تەلەبە ئەبووین، لەو ڕێژەیە شەش حەوت تەلەبەیەک بووین کە لەگەڵ مامۆستا ڕۆیشتین، مامۆستا خۆی بڕیاریدابوو کە بڕوات، بەڵام زۆری لە ئێمە نەکرد کە بڕۆین لەگەڵی، وتی من ئەڕۆم لەگەڵ جەماعەتدا هەرکەس دێت بابێت، ئێمەش شەش بۆ حەوت تەلەبە لەگەڵی ڕۆیشتین.

کە بزووتنەوەش لە ئێران ڕاگەیەنرا، وتیان کێ ئەیەوێت ببێت بە چەکدار با ناوی خۆی بنووسێت. لەڕاستیدا ئەو ڕۆژە من لەوێ نەبووم کە ناو نوسرابوو، پێنجەم ناو ناوی من نوسرابوو بۆ چەکداری. غەریبی براشم کە ئێستا حاجی ـ یە خۆی نوسیبوو. تەدریب دەستپێکرد، من بەشداریم نەکرد، بەڵام غەریبی برام بەشداری کرد. وەجبە وەجبە خەڵکیان ئەبرد، دەبوو چل شەو تەدریبت بکردایە، هەموو ئەو تەدریبانەی کە لە سەربازگەکاندا ئەکرێت هەموویان بەو چەکدارانە کرد. سەری مانگ مەعاش هات وتیان وەرن مەعاش وەرگرن، خەڵک هەمووی ناوی خوێندرایەوە و مەعاشی وەرگرت،

بەڵام من وەرم نەگرت. ئێستا بیرم نەماوە کە بڕەکەی چەند بوو، بەڵام ئەوەندە ئەزانم کە غەریبی برام هاتەوە بەستەیەک پارەی تمەنی پێ بوو، وتی بڕۆ وەریگرە، وتم من چەکداری ناکەم لەبەرئەوە مووچەکەش بە حەڵاڵ نازانم، من کە هیچ نەبم مووچە چی وەرگرم. تۆ ئەگەر ئەیکەی حەقی خۆتە وەری بگری، بەڵام من بەتەمانیم بیکەم، ئیتر من زۆر لە سەریاس نەمامەوە، گەڕامەوە بۆ هەڵەبجە.

هاتنەوەکەشم لە ڕێگەی خزمێکمانەوە بوو بەناوی جەبار ئەحمەد فەتاح (مەلا بەرزان) کە پێشمەرگەی پارتی بوو، داوام لێکرد وەرەقەیەکم بۆ بکات لەگەڵ دوو برادەری خۆمدا کە یەکێکیان بەڕەحمەت بێ ئێستا کۆچی دوایی کردووە و ناوی حەمەئەمینی عەلی عەسا بوو، ئەویش زۆر حەزی ئەکرد بێتەوە. ئەوی تریشیان کاک ئەحمەدی برای مەلا حەسەن شەمێرانی بوو. من بەحوکمی ئەوەی کە چەکدارییەکەم نەکرد و لێرەش تەلەبە بووم وتم با بڕۆمەوە خوێندنەکەم نەفەوتێت. جارێ با خوێندنەکەم بکەم و تەواوی بکەم ئەوسا بزانم چۆنە ئەبێ، تۆزێکیش دۆخەکە ئاسایی ببوویەوە.

لێرە حکومەت زۆر زەختی لە مەلا حەسەن ئەکرد داوای ئەو کوڕەی برایان ئەکرد، ئەیانگووت هەرچۆنێک بێ ئەبێ بیهێنێتەوە ئەگەرنا لێی قبوڵ ناکەن، کاک ئەحمەدیش زۆر فەقیر بوو هەرچی ئەکرد نەیئەتوانی چۆن بگەڕێتەوە، هات تەکلیفی لە من کرد وتی نوری هەرچیت بۆخۆت کرد بۆ منیشی بیکە، منیش وتم بە مەلا بەرزان کە ئامۆزای دایکم بوو شتێکی ئاوا هەیە، بەڵکو لەڕێگەی خۆتەوە وەرەقەیەکمان بۆ بکەن. دوای (١٠) ڕۆژێک وەرەقەیەکی بۆ کردین، تەماشام کرد ناوی هەرسێکمانی تیایە، مەلا بەرزان گووتی ئەم وەرەقەی ئیجازەیە بۆماوەی حەفتەیەکە، ئەویش نەک بۆ گەڕانەوە بۆ عێراق، بەڵکو لە سنووری ئێراندا ئەتوانن پێی بگەڕێن، بەڵام ئێوە دەتوانن لەماوەی ئەم هەفتەدا خەمی خۆتان بخۆن.

بەوەرەقەکە چووینە کرماشان، لە کرماشانەوە بە سەیارە چووینە سنە، لە سنەشەوە سواری سەیارە بووین، بۆ بانگی مەغریب چووینە دزلی لە مەنتیقەی هەورامان لای مەریوان، ئەو شەوە لە مقەڕێکی پارتی لە دزلی ماینەوە، بەیانی لەگەڵ کۆمەڵێک پێشمەرگە و بەناوی پێشمەرگەوە هاتینە کەڕەجاڵ لە پشتی ئەحمەئاوا، شەوی دواتر لەوێوە بەپێ بەم دێیانەی شارەزووردا کەوتینە ڕێ، لەوکاتەدا ئێمە گەشتبووینە لادێیەک کە پێی ئەڵێن تەپەکورە، لەوێ بووین و قەسف دەستیپێکرد(٢:٣٠شەو)، ئێمەش بەناو ڕاجیمەکانی ئێراندا کە سیروانی پێ بۆردومان ئەکرد تێئەپەڕین، ئەو بۆردومانە وایکرد کەس ئاگای لەکەس نەمێنێ، ئەگەرنا قواتی عێراقی و ئەمن و ئیستیخبارات ئەگەڕان بەدوای خەڵکدا.

ئەوکاتیش دێهات هیچی نەمابوو، هەموویان ڕاگوێزرابوون و چۆڵکرابوون، ئێمە کە گەیشتینە تەپەکوڕە چووینە مزگەوتی گوندەکە، زۆر ماندوو بووین، حەوز و ئاوێکی هەبوو، نیوسەعاتێک لەسەر حەوز و ئاوەکە دانیشتین هەتا ئیسراحەتمان کرد، دەم و چاومان شۆرد و خۆمان فێنک کردەوە، چونکە هیچمان نەمابوو، هەتا سوکە نانێکیشمان خوارد، چونکە خواردنمان پێ بوو.

ئەوەش بڵێم هەتا تەپەکورە مەفرەزەیەکی پارتیمان لەگەڵ بوو، کە سلێمانی حاجی فەرەجی شەمێرانی لێپرسراویان بوو، چەکدارەکانیشی زیاتر کەسوکاری خۆی بوون. لەوێ پێشمەرگەکان وتیان ئێمە ئیشوکاری خۆمان هەیە و ئێوەش بۆ کوێ ئەڕۆن بڕۆن.

ئەو پێشمەرگانە هەر لە کەڕەجاڵەوە لەگەڵمان بوون و بەیەکەوە دەرچووین، چونکە ئێمە کە گەیشتینە ئەوێ ئەوان حازربوون بۆ دەرچوون. مەلا بەرزانیش هەتا کەڕەجاڵ لەگەڵمان بوو. لەوێ مەلا بەرزان بانگی کاک سلێمانی کرد و پێی گووت: ئەم منداڵانەم بۆ ئەگەیەنیتە ئەو شوێنەی کە خۆیان ئەیانەوێت، ئەویش بەڵێنیدا کە بمانگەیەنێتە ئەو شوێنەی کە ئەمانەوێت. بەڵام کە گەیشتینە تەپەکوڕە لەو تاریکایی شەوەدا ئێمەیان جواب کرد، ئێمەش هیچ شارەزاییەکمان نەبوو، هەتا ئەو تەمەنە هیچکامان لە ماڵ دوورنەکەوتبووینەوە.

بەنیسبەت منەوە کە هاتمە تەپەکوڕە نەمدەزانی هەڵەبجە و سیروان دەکەونە کوێوە، دواتر کاک سلێمان گووتی ئەوە سیروانە کە گڵۆپەکانی داگیرساوە و ئەوەش هەڵەبجەیە بۆ هەرکامیان ئەڕۆن بڕۆن، بەڵام بەقسەی من ئەکەن مەڕۆن بۆ هەڵەبجە با تووشی کێشە نەبن، چونکە چواردەوری هەڵەبجە بە عەسکەرییە گیراوە، سیروان ئارام ترە و پشتی سیروانیش هەمووی زەراعەت و تووتن بوو، وتی بەناو ئەو توتنەدا وردە وردە بڕۆن هەتا خۆتان دەکەن بەناو کۆڵانەکانی سیرواندا، لەوێ بچنە ماڵە ناسراوێک. ئێمەش بە قسەمانکرد و بەوشێوەیە هاتین هەتا چووینە ماڵی مامەیەکی ئەحمەدی برای مەلاحەسەنی شەمێرانی هەتا بەیانی لەوێماینەوە.

مامەی ئەحمەد ئەیزانی ئەم ڕۆیشتووە و ئێستا هاتووەتەوە. ئێمە زۆر هیلاک بووین خواخوامان بوو کەس قسەمان لەگەڵ نەکات، تەنها بهێڵن سەعاتێک ئیسراحەت بکەین و بخەوین. من بە جلەکانی بەرمەوە دانیشتبووم، گوێنییەکم پێبوو کەلوپەلی خۆمانی تیابوو، لەپاڵ خۆمدا دامنابوو، دوای نان و ئاو و چایی خواردن ئەوەندە ماندوبووین من و ئەو کاک ئەحمەدە بەرامبەر یەک دانیشتبووین قسەیان لەگەڵ ئەکرد ئەوەندە هیلاک بوو بەدەم قسەوە خەوی لێکەت. منیش شانم دادا بوو بەسەر گوێنییەکەدا و خەوم

لێکەوت، بەیانی من لە دەنگە دەنگ خەبەرم بوویەوە، مەجموعەیەک ڕەسمم پێ بوو، کوڕێکی ئامۆزام بەناوی باهیر عەبدولقادر کە پارتی بوو، شەهید بووە، دوو سێ ڕەسمی ئەوم پێ بوو، ڕەسمی مەلا مستەفا و مەسعود بارزانی و نێچیرڤانم پێیە، کۆمەڵێکیانم هەر لەبەر ڕێگە هەڵگرتبوو، بێجگە لەو کوڕەی مامەم کە شەهید ببوو و حەزم ئەکرد وێنەکانیم پێ بێت و بیبەمەوە لەگەڵ خۆمدا وێنەکانی تر تەنها لەبەرئەوە هەڵمگرتبوو کە لەڕێگا بیانوویان پێگرتم بڵێم پارتیم و مەلا مستەفام خۆشەوێت و ئەوانە. بەڵام  ئیتر لە کۆڵەکەمدا بوو، لە ڕێگا مەجالی ئەوەم نەبوو دەریان بهێنم و فڕەییان بدەم.

بەیانی کە هەستام لە خەو تەماشا ئەکەم لە دەرەوە دەنگە دەنگە، پیاوێک بوو بە دەنگی بەرز قسەی ئەکرد، من بە دەنگی ئەو خەبەرم بوویەوە. تەماشام کرد چەکدارە و دەمانچەی پێیە، تاقم  تفەنگێکی پێوەیە، وتم  ئەمە کێیە؟ وتیان  ئەمە حەمەکەریمی خولە گێسکەیە. ئێ ئەم پیاوە بۆ گەیشتووەتە ئێرە، پێشتر ناویم بیستبوو، ئەمزانی کە پیاوی ئیستخبارات و یەکەم پیاوی حیزبی بەعس بوو لەم مەنتیقەدا. وتم بۆ هاتووە بۆ ئێرە؟ وتیان هەر کە ئێوە گەیشتوونەتە جێ، مامەی ئەحمەد خێرا سەیارەیەکی گرتووە و چووە بۆ هەڵەبجە بۆ لای مەلا حەسەن بۆئەوەی هەواڵی گەڕانەوەی ئەحمەدی پێ بدات کە هاتووەتەوە و ئێستا لە ماڵی ئەوانە.

بەحوکمی عەشرەتایەتی و کەسایەتی حەمەکەریم خزمیان بوو، هەروەها پیاوی حکومەتیش بوو، لەپێناو نەگیرانی ئەحمەد ئەویان ناردبوو بەدەمییەوە، کە بزانێ چی بۆ ئەحمەد بکات و چۆن تەسلیمی حکومەتی بکاتەوە کە زیانی پێ نەگات. منیش تۆزێک بێتاقەت بووم کە چاوم بەو دیمەنە کەوت، جگە لە حەمەکەریم کە هاتبوویە ژوورەوە یەک دوو چەکداری تریش لە دەرەوە بوون. لە سەرەتاوە  تۆزێک ترسم لێنیشت، وتم لەوانەیە هاتبێ ئێمە بگرێ، بەڵام کە دوایی وتیان خزمی ئەحمەدە تۆزێک ترسەکەم ڕەوییەوە. کە هەستام ویستم بڕۆم بۆ تەوالێت، تەوالێتی ئەوکاتیش شەرقی بوو لە نزیک درگای حەوشەکە بوو، کە چوومە حەوشەکە بیرم لەوە کردەوە لە دیواری حەوشەکەوە باز بدەم و ڕابکەم بۆئەوەی ڕزگارم ببێ لەدەستی ئەم پیاوە. بەڵام بیرم کردەوە ئەگەر ئەم پیاوە نیەتێکی خراپی هەبوایە ئاوا دانەئەنیشت قسە بکات، بەڵکو ئەهات بە شەق خەبەری ئەکردمەوە و ئەیبردمە ناو سەیارەکە و تەسلیمی ئەکردم. دواتر وتم جارێ بابزانم چی ڕووئەدات. کە ڕۆیشتمەوە ژوور تەماشام کرد گوێنییەکە کراوەتەوە و حەمەکەریم ڕەسمەکانی دەرهێناوە و سەیریان ئەکات، ڕەسمێکی لادا وتی خۆ ئەمە مەلا مستەفایە!! منیش نەمدەتوانی بڵێم ئەو نییە، ئەو لە من باشتری ئەناسی، وتم بەڵێ ئەوە...

سێ تەڵاقەی خوارد وتی ئەتوانم بەم ڕەسمە بتدەم بە ئیعدام، ئەمە چی ئەکات بە تۆ؟ منیش تۆزێ بیانووم بۆ هێنایەوە، ئەویش لەبەرئەوەی مەلا حەسەن ناردبووی و خزمیان بوو نەیدەتوانی هەڵسوکەوتی خراپم لەگەڵ بکات، لەڕاستیدا پیاوەتییەکی گەورەشی لەگەڵ مندا کرد، پێشتر لە ئەحمەدیان پرسی بوو کە چۆن هاتوویتەتەوە و چۆن ڕزگارت بووە؟ ئەویش وتبووی من هیچم نەکردووە، هەمووی بەهۆی یارمەتی ئەم کوڕەوە بووە، لە ڕێگەی خزمێکییەوە وەرەقەی بۆ کردووم و هەتا ئێرەش لەگەڵمدا بووە، هەتا ئەحمەد لەڕێگا قاچی لەجێ چوو، من کۆڵەکەم بۆ هەڵگرت، چونکە نەیدەتوانی، ئەحمەد وتبووی تەنانەت خۆشم بووم بەبار بەسەریەوە، ئازایەتی خۆم نییە، هەموو شتێک ئەم کوڕە کردوویەتی بۆم.

حەمەکەریم وتی مادام ئەم کوڕەت بۆ هێناوینەتەوە هەرچیت بوێ بۆت ئەکەم. وتم کاکە من پێویستم بەهیچ نییە و مەمنوونم، وتی ئێستا تۆ مەمنوعی لەم وڵاتە، ئێستا ناوت هەیە. پرسیاری لێکردم وتی تۆ پێشتر چی بووی؟ تەلەبە بووی یان چەکدار؟ بۆچی ڕاتکردووە؟ ئیشوکارت چی بووە؟ وتم تەلەبە بووم، وتی ئێستا لە مەکتەبەکەی خۆتەوە ناوت چووەتە ئیستخبارات، کە ئەم کوڕە نەماوە و ڕایکردووە، ئیتر چۆن پێویستت بە هیچ نییە. وتی مادەم ئەو کوڕەت هێناوەتەوە ماڵتان لەکوێیە من ئەتگەینمە ماڵەوە،، هەتا ئەو کاتەی ئەگەیتەوە ماڵ لەگەڵت ئەبم، حەمەکەریم پیاوی بەعس بوو. دوای ئەم مشتومڕە لەگەڵ ئەحمەددا سواری سەیارەکەی کردین بردینی بۆ ئیستیخبارات، لە ڕێگا وتم بە حەمەکەریم کە ماڵمان لە هەڵەبجەیە، وتی دەی هەتا دەگەینە هەڵەبجە بیرکەرەوە ئەگەر پێت باشە ئەتبەم تەسلیمت ئەکەمەوە بەیانی بڕۆ دەوام بکە، من خۆم یەکە پیاوی ئیستیخباراتم نا هێڵم یەک قسەت بێتە سەر، ئەگەر پێشت باش نییە ئەتبەمەوە ماڵی خۆتان و ئاگاداریشت ئەبم.

منیش بیرم کردەوە کە من یەکجاری هاتوومەتەوە ئەمەوێت بڕۆمەوە بۆ خوێندنەکەم، ئەمیش پیاوی ئیستخباراتە و لەم باشترم دەستناکەوێت، ئەنجا لەگەڵ ئەحمەدیشدابم باشترە، چونکە خزمی ئەوە، لەبەر ئەحمەدیش بێت کە من هێناومەتەوە ناهێڵێت تووشی هیچ کێشەیەک ببم، وتم قیروسیا خۆم تەسلیم ئەکەم. حەمەکەریم لە ڕێگا هەموو شتێکی خۆی بۆ باسکردین، وتی دەنگوباس و خەبەرات، خەڵک لەوێ چۆن باسی من ئەکات؟ باسی شۆڕشی کرد و کوردایەتی و ئەوانە، هەتا سێ بەسێ تەڵاقی خوارد وتی چی بەو شاخەوەیە من لە هەموویان پیاوترم، تەنانەت وتی ئەم مانگەش (٥٠٠) دینارم بۆناردوون، پێنج سەد دیناری ئەو کاتە زۆر زۆر بوو، وتی کاتێکیش من پێشمەرگە بووم

ئەوانە هەر هیچ نەبوون، بەڵام ئەزانم هیچ ناکرێ، بۆیە هاتوومەتەوە. ئێستا لێرە یەکێک ئەدەم بە ئیعدام سێ کەسیش ڕزگار ئەکەم. ئەمانەی لەناو سەیارەکەدا بۆی ئەگێڕاینەوە...

که هاتین لە خوار زەمەقییەوە سەیتەرەیەکی تیابوو، ئەو سەیتەرە توند بوو، بەڵام لەبەرئەوەی ئێمە ئەومان لەگەڵ بوو ئەویش زۆر حوڕ بوو یەکسەر ڕۆیشتین، خۆی عادەت وایە لە سەیتەرەدا هەر ئەبێت تۆزێک بووەستی، بەڵام ئەم هەر نەوەستا و یەکسەر تێپەڕی، زۆر بە ئاسایی ئەسڵەن ڕێزیشیان بۆ دانا، لەبەرئەوەی پیاوی خۆیان بوو. دواتر بردینی تەسلیمی ئیستخباراتی کردین، ئیستخباراتیش لە شوێنی ئاسایشە کۆنەکەی سەروو باخی گشتی ئێستادا بوو.

پێشتر لە ڕێگا پێی وتبووین هەرچییان لێ پرسین بڵێن نازانین، گووتی هەڕەشەتان لێ ئەکەن و ئەتانترسێنن، بەڵام ئێوە مەترسن. پێی گووتین مودیری ئیستخبارات پیاوێکی تورەیە، دوو قسەت کرد بەدڵی نەبوو هەڵەستێتەوە بۆکس ئەکێشێت بە مێزەکەیدا لەبەرئەوەی بترسی، لەوانەیە بێت گوێچکەت بگرێ یان زلەت لێبدا، وتی بڵێن کەس ناناسین، من منالم خەڵک ڕای کردووە منیش ترساوم لەگەڵ ئەو خەڵکە ڕۆیشتووم و ئێستا گەڕاومەتەوە، چونکە ئەزانم وڵات و حکومەتەکەی خۆم باشترە و خاکەکەی خۆم بەجێناهێڵم. کە چووینە ژوورەوە حەمەکەریمیش دانیشتبوو، هەتا زۆرجار ئیشارەتی بۆ ئەکردم ئەیگووت ئاوا بڵێ و ئاوا مەڵێ، پرسیارەکانیش زۆر بوون. لەڕاستیدا منیش هەر قسەکانی ئەوم دووبارە ئەکردەوە. دوای تەحقیق وتیان ئەتوانی بڕۆی، بەڵام بەیانی هەشت ڕەسمان بۆ ئەهێنیت بۆ ئێرە، ئەگەر نەیهێنی وەک ئەوە وایە هەر نەهاتبی، منیش گووتم باشە ئەیهێنم.

ژورێکی لێ بوو وەکو دوکانی قەساب قولاپیان پیادا هەڵواسی بوو، وتی ئێستا هاوڕێکەشت بانگ ئەکەم ئەگەر قسەکانی وەکو تۆ نەبێ و جیاوازیتان هەبێ لە قسەدا ئەتکەم بەو قولاپەوە، پێشتر لە ڕێگا حەمەکەریم ئەمانەی بۆ باسکردبووین، کە ئەمانەتان پیشان ئەدەن بۆئەوەی بترسن، بەڵام ئێوە نەترسن. تەحقیق تەواو بوو لە ئیستخبارات هاتمە دەرەوە، حەمەکەریم دیار نەبوو، مەسافەیەک لە ئیستخبارات هاتم بەرەو خوار گەیشتمە تەنیشت باخی گشتی و حەمەکەریم بە سەیارەیەکەوە لە بەردەممدا وەستا، منیش تۆزێک ترسام، وتم لەوانەیە ئەمیان ناردبێتەوە بە شوێنمدا، حەمەکەریم وتی سواربە، وتم بۆ کوێ؟ وتی نیوەڕۆیە و نان خوراوە و ئێستا خەڵک هەمووی خەوتووە، ئەتبەمەوە بۆماڵی خۆمان، حەمامێک بکە و نان بخۆ و ئیسراحەت بکە دواتر بە سەیارەکە ئەتبەمەوە بۆ ماڵی خۆتان، وتم نەوەڵا ماڵمان نزیکە، ماڵت ئاوا و مەمنوونم،

ئیتر خواحافیزیم لێکرد، پەنجا مەتری تر ڕۆشتمە خوارەوە دیسان هاتەوە بەردەمم، وتم ئەمجارە چیە برا؟ دەستیکرد بە گیرفانیدا (١٠)دیناری ئەو کاتەی دەرهێنا و گووتی ئێستا بڕۆیتەماڵەوە مەجالی نانخواردن نابێت، کەسوکارەکەت ئەڕژێن بەسەرتدا، ئا لەوێدا حەمامێک بکە و نان بخۆ، با هەر جلەکانت بمێنێت لە ماڵەوە بیگۆڕی. من تا مردن ئەوانەم لەبیر ناچێت، لەڕاستیدا من ئێستاش و ئەوکاتیش حەمەکەریمم خۆشم نەویستووە، چونکە ئەوکات لەناو خەڵکدا ناوی بە خراپ ڕۆیشتبوو، بەڵام ئەو پیاوەتییانەی بۆ من هەبوو، حەمەکەریم ئێستاش ماوە و پێشمەرگەی پارتییە و مەسئولییاتی هەیە.

دوای گەڕانەوەم پەیوەندیم کردەوە بە خوێندنگاکەمەوە و شەش مانگێک دەوامم کرد، بەڵام ساڵی پێشووم فەوتا.

**پرسیار/ با بڕۆینە سەر کیمیاباران، ئەو فەترەی پێش کیمیاباران بارودۆخی هەڵەبجە چۆن بوو؟**

وەڵام/ بارودۆخی ئێرە ئاسایی بوو، هیچ دەنگوباسێک نەبوو، خەڵک بە ئیسراحەت ئەژیا، ئەگەرچی بەدرێژایی ساڵانی جەنگی عێراق ئێران، ئێرانییەکان ڕۆژانە و چەند ڕۆژ جارێک لە دزلییەوە ڕاجیمەی ئەنا بە هەڵەبجەوە، ئەم حاڵەتە بەدرێژایی ئەو حەوت هەشت ساڵە هەر هەبوو، سەدان کەس شەهید و بریندار بووە بەهۆی ئەو بۆردومانانەوە. لەو بۆردومانانەشدا فەرقی هیچ شوێنێکیان نەدەکرد، ئێمە هەر لەم گەڕەکی شێخ ئیسماعیلە بووین، ماڵی شێخ نووری برای شێخ عێزەدین و شێخ نەجمەدین دراوسێمان، کە هەر چەند ماڵێک نێوانمانە لەگەڵیان ڕاجیمەیەک دای لە ماڵیان، خانووەکەیان دار بوو، منالێکیان لەناو بێشکەدا بەرکەوت بەوهۆیەوە منالەکەیان گیانی لەدەستدا. ئیتر ڕۆژانە ئەو بۆردومانانە هەبوون، بەڵام زۆرجار موجەمەعی عەنەبی ئەگرتەوە و بەر ئەوێ ئەکەوت. هۆکارەکەشی ئەوەبوو عەنەب مەعەسکەری لێ بوو، بەڵام هەر ئەهات بۆ شارەکەش، ئێران دەستی نەدەپاراست.

**پرسیار/ ئەو دوو سێ ڕۆژەی پێش کیمیاباران کە هێرشەکە دەستیپێکرد بارودۆخی شار چۆن بوو؟**

برایەکم بەناوی حاجی محەمەد حەرەسی مەکتەبی حەمدون بوو لە گەڕەکی کانی ئاشقان، هاتوچۆی بەغداشی ئەکرد، بەڕازیلییەکی پێبوو نەفەراتی ئەبرد بۆ ئەوێ، ئەو جارانەی کە درەنگ دەکەوت لە گەڕانەوە ئەیگووت نوری برام سەعات چوار بڕۆ حەرەسیاتەکەم بۆ بگرە، نەوەک من دوابکەوم کلیلەکە لە حەرەسەکەی پێش من وەربگرە. دواکەوتنەکەشی بەهۆی پەنچەربوونی تایەی سەیارەکەی یان دواکەوتنی نەفەرات یان

جەنجاڵی ڕێگاوبانەوە بوو، هەربۆیە من جارجار هەتا خۆی ئەگەیشتەوە ماڵەوە لەبری ئەو ئەچووم بۆ حەرەسیاتەکەی.

سێ ڕۆژ بەر لە کیمیابارانی هەڵەبجە، من ڕۆشتم بۆ حەرەسیاتەکەی کاکەم، لەوێ دوو پیاوم بینی، هاتن لەبەردەم سووچی مەکتەبەکەدا وەستان و قسەیان ئەکرد، منیش گوێم بۆ گرتن، بە فارسی قسەیان ئەکرد، منیش بە حوکمی ئەوەی پێشتر چووبووم بۆ ئێران لە قسەکانیان تێ ئەگەیشتم، یەکێکیانم ئەناسی، دواتر پرسیارم لە کوڕە ناسراوەکە کرد، وتم ئەمە کێ بوو؟ وتی پاسداری ئێرانە، بەکورتی پێشوەخت پەلکێش کرابوون بۆ ناو شار، دواتر هێزەکانی ئێران بە ڕێنوێنی حیزبەکانی خۆمان کە کەوتبوونە پێشیان هێنانیان، بە قەرار ئەڵێن فەرماندەی ئەو هێزەی عێراقیش کە لەم ناوچەیە بوو ناوچەکەی فرۆشتبوو، ئەگەرنا بە ئاسانی ئێرە نەدەگیرا، چونکە هێزێکی تۆکمەی عێراقی لەم شاخانە و ناو شار هەبوو، بەڵام وەک گووتم فەرماندەی مەنتیقەکە ئێرەی فرۆشتبوو، پێشمەرگەش کەوتنە پێشی پاسدار و هێنانیان، لەڕاستیدا لەکاتی گرتنی هەڵەبجەدا خەڵکی زۆر نەکوژرا، تەنانەت پێشڕەویان کرد و ڕۆیشتن بەرەو سەیدسادق.

**پرسیار/ شەوی دوانزە لەسەر سیانزە پەلامار دەستپێدەکات لەم شاخانەوە تەق و تۆق و زرمە هەیە، ئێوە بیرتان لەچی ئەکردەوە، ئەتانویست بڕۆن و دەرچن لە شار؟**

وەڵام/ تەوەقوعی ئەوەمان نەئەکرد کە هەڵەبجە بگیرێت، چونکە جەیشێکی زۆری عێراق لێرە بوو، ئێمە لە ماڵەوە دانیشتبووین، هەتا ئێوارەی پانزەی مانگ کە هاتنە ناوشار، شەوەکەشی هەر لە ماڵەوە خەوتین، ئێمە نەمان ئەزانی مەسیرمان چی بەسەردێ...

ئەو ئێوارە کە پاسدار و پێشمەرگە هاتنە ناو شار مەجموعەیەک دوکان بڕا و کۆمەڵێک خەڵک کوژران، هەروەها لە پاسدار و سەربازی عێراقیش زۆر کوژرا و زۆریش بەدیل گیران، ئەو ئێوارە بەچاوی خۆم لە گەڕەکی کانی ئاشقان پاسدارم بینی (١٠ بۆ ١٢) بوون و جلی مەدەنییان لەبەردا بوو، بەڵام بە فارسی قسەیان ئەکرد، بەڵام پێشمەرگەم نەبینی، هەتا بەیانی ڕۆژ ٣/١٦ کە ئیتر هەموویان هاتنە ناو شارەوە.

بیرمە هەر ئێوارەی (٣/١٥) دوو سێ هەلیکۆپتەری عێراقی بێ ئاگا لەوەی ناوچەکە گیراوە لە نزیک گوندی عەنەب کۆمەڵێک سەربازیان دابەزاند، بەڵام خێرا پاسدار و پێشمەرگە گەمارۆیاندان و گرتنیان، ئەوانەی ئەگیران کەمتر ئەکوژران، لەڕاستیدا زۆربەیان بەرلەوەی سوپای پاسداران بگاتە ناوشار ڕایانکرد، بەتایبەتی دوای ئەوەی کە زانیبوویان ئامرەکەیان هەڵهاتووە بۆ ئێران، ئەوە وایکردبوو جەیشەکە پشتی بشکێ و بەشی زۆریان بگەڕێنەوە ناو شار و بەو کۆڵانانە بەپێ ئەڕۆیشتن.

سەرلەبەیانی ڕۆژی ٣/١٦ من لەناو بازاڕ بووم پێشمەرگە و پاسدار هاتن، لەم مەنتیقەی پیرمحەمەدا خەڵکێکی زۆر کۆببوویەوە، چونکە ترس نەبوو، ئەو ڕۆژە خەڵک نەک هەر لە پێشمەرگە نەدەترسا، بەڵکو پێشی خۆشبوو، کە ئەوان گەیشتنە ناوشار.

لێرە بەدواوە ئێمە بیرمان لەوە کردەوە کە دەربچین بڕۆین بۆ ئەو کەژ و کێوانە نەک بەرەو سلێمانی، وەک عایلەی خۆمان، وتمان لەوانەیە ئەم هێزەی ئێران و پێشمەرگە سەعاتێکی تر بشکێ، لەبەرئەوەی عێراق حکومەتە و هوجوم ئەکات و لەوانەیە بیگرێتەوە، چونکە ئەمانزانی حکومەت بەئاسانی دەست لەم مەنتیقە هەڵناگرێ. ئەگەر هێشتی دائەنیشن لە شوێنی خۆمان و ئەگەر نەشیانهێشت ئەڕۆین بەرەوخوار، ئێمە ئاوا بیرمان ئەکردەوە.

بەیانی تەماشامان کرد ئەو هێزەی هاتووەتە ناو شار زۆرە، لەڕاستیدا فڕۆکەش زۆر ئەگەڕا، بەڵام بەبێ ئەوەی بۆردومان بکات، ئێمە لەو هاتنی فڕۆکانە زۆر ترساین، هەر ئێمە نەبووین خەڵکی بەگشتی زۆر ئەترسا، ئەو ترسە وایکرد خەڵک بیر لە ڕاکردن بکاتەوە. ئێمە وەک خۆمان غاباتێک(دارستانێک) هەبوو لە پشتیماڵمانەوە لە نێوان هەردوو گۆلاندا، غاباتەکە حوکمی بوو، پڕبوو لە دار و درەخت و میوەی جۆراوجۆر، وتمان ئەم فڕۆکانە هەروا نایەن و بڕۆن، ئیلا بۆردومان هەر ئەکەن، با لەشار دەرچین ئەگەر شتێک بوو با دوربین لەناو شار، چووینە ناو ئەو غاباتەکە، درەختی ناو غاباتەکەش بەرز بوو.

لە ترساندا کۆڵمان پێچابوویەوە، حازربوو، تەنیا ماڵی حاجی محەمەدی برام نەبێ، کە ڕۆیشتن بۆ کارگەی توتنەکە، کە ئەوکات پێیان ئەگوت تەنقیحەکە، دەکەوتە ئەوبەری جادەکەوە، کارگەکە پێنج شەش قات بوو، دیوارەکانی زۆر ئەستور بوو، لایەکی هەڵەبجە لە ترسدا بۆ خۆپاراستن ڕۆیشتبوون بۆ ئەوێ، ئەیانگووت ئەگەر تەیارەش بۆردومان بکات ئێمە لێرە پارێزراوین، بەڵام وەک پێشتر گووتم ئێمە بۆ ناو غاباتەکە کە دەکەوتە پشتی هەڵەبجە ڕۆیشتین، تەنها ماڵی حاجی محەمەدی برام ڕۆیشتن بۆ ئەوێ.

سەعات نۆی سەرلەبەیانی لە ماڵ دەرچووین و چووینە ناو غاباتەکە، لەوێوە هەموو شارمان لێ دیار بوو، سەیری تەیارەمان ئەکرد چۆن ئەهاتن و چۆن ئەڕۆیشتن، خەڵکەکەی ناوشاریش بەعام دایانە ئەم شاخی شنرۆییە بۆئەوەی بەرەو ئێران ڕابکەن، تەنانەت شەوەکەی خەڵک گەشتبوویە گوندی دەڵەمەڕ و ئەو شاخانەی ئەوبەرەوە بۆئەوەی دەربچن، بەڵام پیشمەرگە ڕێگەی لێگرتبوون و نەیهێشتبوو دەربچن. شەوکەتی حاجی مشیر، کە نوێنەری مام جەلال بوو، لەگەڵ چەند مەسولێکدا پێشی خەڵکەکەی گرتبوو، وتبووی ئێوە تازە ڕزگارتان بووە، بەیانی ئەڕۆین سلێمانی ئەگرین و دوو

بەیانیش بەرەو کەرکوک ئەڕۆین!!

بەکورتی، ئەوان ڕێیان لە خەڵک گرتبوو کە دەربچن، خەڵکەکەش بەناچاری گەڕابوونەوە بۆ ناوشار، ئێمەش هەر لە غاباتەکەدا بووین، دەوروبەری نیوەڕۆ دروست نازانم سەعات چەند بوو بۆردومانی فڕۆکەکانی عێراق دەستیپێکرد. ئێمە تەماشامان ئەکردن، بەچاوی خۆمان ئەمان بینین، وەڵاهی تەیارەیەکم بینی ئەوەندە بەخێرایی هاتە خوارەوە و خۆی دانەواند بۆ قەسفی مەعمەلی توتنەکە وامزانی ئەڕواتە ژوورەوە، ئاخر بینای مەعمەلەکە زۆر زەخم و گەورەبوو، هەتا لێرەوە(غاباتەکە) درگاکانی دیاربوو، چونکە زۆر گەورە بوون، دووهێندەی ئەم هۆدەیە(مەبەستی ئەو ژوورەیە چاوپێکەوتنەکەمان تێدا کردووە) ئەبوون، تەیارەکە قەسفی بیناکەی کرد و عەموودی لێدا و بەرزبوویەوە، ئیتر قەسف دەستیپێکرد، خوا پەنامان بدات چ حەشرێکمان بینی! تەیارەکان پۆل پۆل ئەهاتن، چوار و پێنچ بەیەکەوە لە سەیدسادقەوە ئەهاتن. واتە زۆرتر لە سەیدصادقەوە ئەهاتن، بەڵام کە ئەگەیشتنە سەیدصایەق بڵاوەیان ئەکرد، سیانیان ئاواوە ئەڕۆی و دوانیان ئاواوە ئەڕۆی، چواریان ڕاست بەرەو هەڵەبجە ئەهات لەبەر بۆردومانکردنی زۆرترین شوێن و خۆپاراستنیش لە دۆشکە و دژە فڕۆکەی ئێرانی کە هێنابوویان لەگەڵ خۆیاندا.

دوای بۆردومانی تەنقیحەکە من و دایکم خوا عەفوی بکات لە حەیبەتی ماڵی حاجی محەمەدی برام بەڕاکردن غاباتەکەمان جێهێشت و گەڕاینەوە بۆ ناوشار، وتمان ئێستا کەسیان نەماوە لەناو مەعمەلەکەدا، ئەوەندە بەخێرایی ڕامانکرد لە غاباتەکەوە هەتا تەنقیحەکە ئەوپەڕی (١٠)دەقیقەمان پێ چوو، ئێمە کە گەیشتین دەرگا و شتی بیناکەی فڕێ دابوو، ناو بیناکە هێشتا پڕبوو لە تەپوتۆز و کەس کەسی نە ئەبینی، کچێکی مناڵی کاکەم بەناوی بەیان ببوو بەژێر خەڵکەکەوە، چونکە هەمووی کەوتبوو بەسەر یەکدا، خەڵک تاک و تەرا و دانەدانە هەڵەسانەوە و من لام ئەبردن، بەڵام خۆشبەختانە زەخمی و بەهێزی بیناکە وایکرد قوربانی لێ نەکەوێتەوە.

لەکاتی بۆردومانەکە ژمارەیەکی زۆر پاسدار لەسەر جادەکەبوون و بەرکەوتبوون، بەچاوی خۆم قاچی پاسدارم بینی بە قەدی درەختی تووەکانی بەردەم مەعمەلەکەوە، ئەو پاسدارانەی کە لەسەر جادەکە بوون بڕواناکەم کەسیان دەرچووبێ، هەتا قاچی پاسدارم بینی لەبنی ڕانییەوە قرتابوو لەسەر قەدی دارە تووەکان بە پۆساڵەکەوە گیرسابوویەوە، شوکور بۆ خوا ماڵی کاکەم سەلامەت بوون، یەکە یەکە مناڵەکانی ماڵی کاکەمم هەموویان دۆزیەوە و لەگەڵ خۆماندا بردماننەوە بۆ غاباتەکە، لەوکاتەدا غاباتەکە خەڵکێکی زۆری لێ بوو.

دوای دەرچوونی ئێمە هەرچی لە تەنقیحەکەدا مابوویەوە هەموویان دەرچوون، چونکە ئەمەلیان نەما کە لەوێ بمێننەوە، وتیان ئەمجارە لێی بداتەوە هەموو بیناکە ئەڕوخێنێ بەسەرماندا، پێشتر خەڵک پێیانوابوو ساروخێکی بەسیتە ئەو دیوارانە نا بڕێت، بەڵام ئەو بەناپاڵم لێیدا.

ئیدی ئێمە لە غاباتەکەوە سەیری فڕۆکەکانمان ئەکرد کە چۆن بۆردومانی شار ئەکەن، چی بۆردومان کراوە و داویەتی لە شار ئێمە بینیومانە. بەو حاڵەشەوە ئێمە هەر چاوەڕێمان ئەکرد هەتا سەعاتێک ڕۆژی مابوو، چونکە نەمان ئەوێرا لە غاباتەکە دەرچین، نزیکەی سەعاتێک سەعات و نیوێک ڕۆژی مابوو فڕۆکەکان دەنگیان نەما. ڕاستە کیمیاییان وەشاندبوو، بەڵام ئێمە نەماندەزانی کیمیایی داوە لەناو شار، ئێمە پێمانوابوو هەر بۆردومانەکە تەواو بووە، چونکە بۆردومانی کیمیایی ئێمەی نەگرتەوە، ئێمەش نەچووینەوە بۆ ناوشار هەتا بزانین کیمیایی وەشاندووە یاخود نا.

**پرسیار/ باس لە چۆنیتی هەڵاتن و گیرسانەوەتان لە ئێران بکە.**

دوای کەمبونەوەی هاتوچۆی فڕۆکەکان و بۆردومان ئێمە بیرمان لەوە کردەوە بڕۆینەوە بۆماڵەوە کەمێک خواردن و پێداویستی دیکە لەگەڵ خۆماندا بهێنین و ئەنجا بەیەکجاری غاباتەکە جێبهێڵین، کە هاتینە ماڵەوە کەلوپەلەکان حازربوون، جلوبەرگمان پێچایەوە، هەتا ئەمانەمان کرد بانگی مەغریبیدا، لە ماڵ هاتینە دەرەوە بەپێ بەرەو گوڵانی ژوورو بەڕێکەوتین، ئیتر هەر خەڵک بوو ڕێی ئەکرد، هەتا کە هاتینە دەرەوە ماڵێکی دراوسێمان تراکتۆریان هەبوو مەکینە و عەرەبانەی پێ بوو، تەماشام کرد پڕە لە خەڵک، کوڕێکی هاوڕێمی تیابوو بەناوی ئیسماعیلی حاجی عەبدوڵڵای هەسەنی پریسی ژوورو، بانگی کردم وتی نووری مەڕۆ، ئێمە بە مەکینە ئەڕۆین، وەرە سواربە بابەیەکەوە بین، تۆ کۆڵێکی قورست پێیە، ئەو قسە و هەڵویستەی ئەو کاتێک بوو هیچ کەس نەدەوەستا بەدیار کەسی ترەوە!

منیش وتم ئێوە بڕۆن من نایەم، من لەگەڵ دایک و باوکمم و ئەوان جێناهێڵم، ئەوان ڕۆیشتن، هێشتا زۆر ڕێیان نەکردبوو، وابزانم هەر پێنج دەقەیەک بوو، مەکینەکەیان وەرگەڕا بەوهۆیەوە چوارکەسیان کە یەکێکیان ئیسماعیلی هاوڕێی من بوو گیانیان لەدەستدا، دراوسێیەکی ترمان هەبوو بەناوی حاجی محەمەدی تریفەیی دوو کچی منداڵی ئەویش هەر لەو ڕووداوەدا مردن. خوشکی مامۆستا ئەزهەر بوون کە ئێستا دوکانی مەوادی کارەبایی لەناو بازاڕدا هەیە، کوڕێکی گەنجی دیکەشی تێدا مرد، بەڵام نازانم ئەوەیان کێ بوو، ئەو تراکتۆرە سی چل نەفەری تیابوو هەموویان بریندار بوون، یەکێک

دەستی شکابوو یەکێک قاچی شکابوو، هەتا دایکی ئەو دوو کچەی کە مردن وەزعی زۆر خراپ بوو، باڵی لە ملیدا بوو، دوای پانزە ڕۆژ لە ئێران بینیمەوە، چونکە کەوتینە یەک مەکتەبەوە، تەمەشام کرد دەستیان گرتووەتە گەچ و هێشتا نەیانکردووەتەوە.

هەرچۆنێک بێت ئێمە شەوی ١٦ لەسەر٣/١٧ بەڕێکەوتین هەتا گەیشتینە گوڵانی ژوورو، لەوکاتەدا سێ مانگامان هەبوو، باوکم خوا عەفوی بکات وتی ڕۆڵە بیانهێنە با جێ نەمێنن، لەگەڵ دراوسێیەکماندا بەناوی حاجی حەسەنی نوەری ئەویش سێ چوارێکی هەبوو، دامانە بەر، بەڵام بەهۆی زۆری خەڵکەوە وڵاخەکان سڵیان ئەکردەوە و نەئەڕۆیشتن، بۆیە لە قەبرستانی گوڵانی سەروو بەجێمانهێشتن، چارەکێک بیست دەقە ڕێمان ئەکرد بەو تاریکییە، فڕۆکەش هەر ئەگەڕا. کاتێک گەیشتینە لای شەخسەکەی گوڵان فڕۆکەکان هاتنەوە، لەسەری مەزاری شەهیدانی ئێستاوە یەک ڕەتڵیاندا لەناو شار. ئەو بۆردومانە هەموو شاری ڕووناک کردەوە، ڕووناکییەکە بەشێوەیەک بوو هەموو خانووەکانمان ئەبینی، بەڵام نازانم ئەوە کیمیایی بوو یاخود هەر بۆمبی ئاسایی، لە نزیک شەخسەکە ئێمە هەستمان بەچاو کزانەوە و ئاو بەدەم و لووتدا هاتنەخوارەوە ئەکرد، بەڵام ڕاستییەکەی هەتا ئەوکاتەش نەماندەزانی فڕۆکەکان کیمیاییان وەشاندووە یاخود نا. لەمکاتەدا تراکتۆرێک لە پێشمانەوە وەکو خەڵکەکە لەسەرخۆ ڕێی ئەکرد، وتم باشە ئەم مەکینە لە پێشی منەوەیە بۆچی نەڕۆمە ناوی بەم کۆڵە قورسەوە؟ بەدەم ڕێوە دەستمگرت بەدوای مەکینەکەوە و خۆم بەرزکردەوە بۆ ناو عەرەبانەکەی، ئەوکات گەنج بووم ئەمتوانی، کاتێک چوومە ناو عەرەبانەکە هەرچی پێم دائەنا ئەکەوتە سەر نەرمایی، ڕۆیشتمە ئەولاتر هەر وابوو، کەمێک ڕۆیشتمە ئەولاتر هەر قاچم ئەکەوتە سەر نەرمایی، هەنگاوێکی تر ئەچوومە ئەولاوە هەر بەوشێوەیە بوو، تومەز ئەمە هەمووی خەڵکە و لەناو ئەم مەکینەدا مردوون، بڕوابکە ناو ئەو عەرەبانەی مەکینە نزیکەی پانزە جەنازەی تیابوو، تەنها پیرەژنێک لەلای سەرووی عەرەبانەکە دانیشتبوو کەمێک لێی نزیک بوومەوە کەوتم، ژنەکە بەدەم گریانەوە هۆرەیەکی خۆشی ئەکرد. وتم دایە ئەم مەکینە چی تیایە؟ وتی ڕۆڵە ئەوە یەک عایلەین بەکاملی، تەنها من دەرچووم، ئیتر لە ترساندا لە تراکتۆرەکە دابەزیمە خوارەوە، بەڵام هەر لە مەکینەکە دابەزیم هەستم کرد ئیتر ئاو بە دەم و چاو و لوتمدا دێتەخوارەوە و نەئەوەستا، یانی تا ئەو دەقە ئێمە نەمانزانی کیمیایی دراوە لە شار، چونکە دووربووین لە شوێنی بۆردومانەکانەوە.

ئەمەی باسی ئەکەم ئێمە بەڕێوە بووین لە سەروو شەخسەکەوە تەقریبەن ماوەیەکی کەم ئەڕۆی هەورازێکە، من لەو هەورازەدا سواری ئەو مەکینە بووم، ئیتر ئاو بە دەم و

لوتمدا ئەهاتە خوارەوە.

هیچ کەی ئەتوانی ڕۆشنایی هەڵبکات، تەنها ڕێگاکە هەبوو پیایدا بڕۆی، کۆمەڵێک خەڵکی ئەو گەڕەک و مەنتیقەی سەرەوە هەبوون، خەڵکی لادێکانی ئەو سنوورە بوون، ئەوان شارەزای ڕێگاکە بوون، هەموو خەڵک بەدوای ئەواندا ئەڕۆیشت، ڕێگاکە ئەوەندە قەرەباڵغ بوو، بڕوا ناکەم دوو نەفەر کەسی یەکبن و پێکەوە مابووبێتنەوە، هەمووی لە یەک دابڕابوو.

تا ئەوکاتەش ئەوە بۆ ئێمە مەعلوم نەبوو کە ئەڕۆینە خاکی ئێرانەوە یان هەتا سنوور ئەڕۆین، ئەمانویست ڕاکەین تا سنووری ئێران، لەمکاتەدا پێشمەرگەیەک هات، ئیتر نازانم چەکدار بوو یاخود نا، وتی بڕۆن بۆ ئێران، لەوبەری سیروانەوە ئێران هەموو شتێکی بۆ حازرکردوون، لەسەر سیروان بەلەمی بۆ حازرکردوون خەڵک ئەکاتە ئەوبەرەوە بۆ ناو خاکی ئێران، وتی کەس نەوەستێ و گشتی بڕوات، ئێمەش بەڕێکەوتین، لەڕاستیدا ئەو عایلانەی ماڵی خۆمان کە پێکهاتبوو لە ماڵی برا و خوشک و کەسوکارەکەمان زۆر بووین. کە لە ماڵ و شار دەرچووین هەموومان بەیەکەوە بووین، بەڵام دوای نیو سەعات ڕەنگە دووکەس بەیەکەوە نەمابێ، لە ڕێگا ئەماندا بەلای یەکدا یەکترمان ئەبینی و دەنگی یەکمان ئەناسی هەتا مەودایەک دواتر لە یەک دائەبڕاینەوە.

نزیک سەعات نۆ و دەی شەو بوو من بە تەنها ئەڕۆیشتم و کەسم لەگەڵدا نەبوو، گوێنییەکم بەکۆڵەوە بوو، دوو بەتانی و گوێنییەک کە خواردن و شتی تیابوو پێ بوو، ڕۆیشتم هەتا گەیشتمە ڕووناکی خوشکم، مناڵێکی کچی پێبوو بەناوی سەحەر، وتی نوری برام ئیتر من پەکم کەوت، وتی ئەم کچەم لێ بگرە، منیش کچەکەم لە ئەو گرت و خستمە سەرشانم. مەجالی ئەوەم نەبوو بیخەمە باوەشم، چونکە کۆڵ و شتم پێبوو، بۆیە خستمە سەر شانم، هەردوو دەستیم گرتبوو، چارەکێکی تر ڕێم کرد، گوێم لە دەنگێک بوو، وتی ئەی براڕۆ قاچم شکا، بە دەنگەکەدا ناسیمەوە، وتم بەخوا ئەمە خوشکە بچووکەکەمە، بەدەم دەنگەکەوە ڕۆیشتم تەمەشا ئەکەم فاتمەی خوشکمە، وتم ئەوە چیە؟ وتی کەوتم و ئەم قاچەم شکا، هەرچی هاوارم کرد بابە قاچ چۆن ئەشکێ هەستەوە، هەرچۆنێک بێت غیرەتم دایەبەری و هەستایەوە، قاچی لەجێ چووبوو، بە شەلەشەل و بەو وەزعەوە هەتا گوێی سیروان هات، ماوەیەک لەگەڵ مندا ڕێی کرد، دواتر وتی نوری تۆ لە پێشمەوە بڕۆ من وردە وردە دێم، من زۆر پێشکەوتم، باوک و دایکم و ئەوان هێشتا لە دواوە بوون. من ڕێم کرد هەتا شوێنێک کە پێیان ئەگووت گەچێنە، گەچێنە زۆر تاریک بوو، لە دوورەوە پیاوێکم بینی پێنچ شەش مناڵی وردی پێبوو، ئاگرێکی کردبوویەوە، ئەم

منداڵەش کە بە منە(سەحەر) هیچ جوڵەیەکی نییە، تەبعەن ئەوەندەی سەرما بووە، بەس بەرمدایە ئەکەوت و جوڵەشی نەبوو!

بەرەو ئاگرەکە ڕۆیشتم، وتم با لە پاڵ ئەم ئاگرەدا ئیسراحەتێک بکەم، کەسوکارەکەشم بێن ئەیانبینم، ئیتر لێرە یەک ئەگرینەوە، کاتێک نزیکی پیاوەکە بوومەوە پێم هەڵکەوت لە بەردێک و کەوتم، سەحەرم لەدەستبەربوویەوە و ڕۆیشت، هەرچی ئەگەڕام و دەستم ئەخشاند بەو تاریکی شەوە نەمئەدۆزییەوە، ناچار ڕۆیشتم بۆ لای پیاوەکە، چرایەکیان پێبوو، کە لە شار دوورکەوتینەوە وردە وردە خەڵک ئاگر و شتی کردبوویەوە، ڕۆشنایی هەڵکردبوو، بە چراکەوە گەڕام تەماشا ئەکەم سەحەر کەوتووەتە ناو چاڵێک کە پێشتر زینان بووە، ڕۆیشتمە ناو چاڵەکە و سەحەرم دەرهێنا و هەڵمگرت، هێنام بۆ لای ئاگرەکە و کەمێک گەرمم کردەوە، لەوکاتەدا مامەیەکم بەناوی حاجی نەجیم پەیدا بوو.

لەوێ هەندێ قسەمان کرد بەیەکەوە، وتی ئەمە چییە پێت؟ وتم ئەمە کچی ڕووناکی خوشکمە، وتی خۆ ئەم منداڵە مردووە، بۆ کوێی ئەهێنی؟ با چاڵێکی بۆ هەڵکەنین و بیخەینە ناوی، وتم وەڵا مامە هەتاکوو یەک مانگی تریش هەڵی گرم هیچی لێ ناکەم، ئیلا ئەبێ بیدەمەوە دەستی دایکی خۆی، چونکە دواتر قورئانی ماڵی خوای بۆ بخۆم ئەڵێ جێیهێشتووە، بۆیە من هەر هەڵی ئەگرم، خوا یارمەتیمان بدات زۆرمان نەماوە، هەرچۆنێک بێت ئەو شەوە هەتا بەرەبەیان ڕێمان کرد، لە مامەشم دابڕام، بەیانی کە ڕۆژبوویەوە هەر خۆم بە تەنها بووم و کەسم لەگەڵ نەبوو، لەمکاتانەشدا فڕۆکەکان هەر ئەهاتن، شوێنێک هەیە لەبەری ئێران پێی ئەڵێن سیمان، فڕۆکەکان بۆردومانی کیمیاییان کردبوو، بەوهۆیەوە خەڵکێکی زۆری کوشت و بریندار کرد، چونکە بەشێک لە خەڵکەکە لەوێوە ڕۆیشتبوون، بەڵام لای ئێمەیان بۆردومان نەکرد.

کە ڕۆژبوویەوە لەگەڵ خۆرکەوتندا من گەیشتمە سەر سیروان، لەو شوێنەی کە خەڵکەکە ئەپەڕییەوە بۆ ناو خاکی ئێران، ئێرانییەکان بەلەم و شتیان ئامادە کردبوو، من سواری بەلەمەکە بووم بە منداڵە مردووەکەوە، سی کەس ئەچووە ناو یەک بەلەم، خەڵک هەر خواخوای بوو بپەڕێتەوە، گوێی لە خنکان نەبوو، بەلەمەکان ئەوەندە خەڵکیان تێدابوو پەنجەت بەر ئاوەکە ئەکەوت، هەموو خۆی بۆ ناو بەلەمەکان ئەکوتا، پاسدارەکان بەزۆر خەڵکیان دائەگرت و ئەخستەخوارەوە، خەڵک ئەیگووت بەس بڕۆمە ناوی بشخنکێم قەینا، بۆئەوەی لەم خاکە دەرچم. ئەو ساڵە ڕێژەی بارانیش زۆربوو، بەوهۆیەوە سیروان ئاوی زۆر ببوو.

هەرچۆن بوو پەڕیمەوە ئەوبەر، کچەکەشم هەر بەباوەشمەوە بوو، دەموچاوی زۆر

پیس و پۆخڵ بوو، ئەو شەو و ڕۆژەش سەرمای زۆر ببوو، برسی بوو، چونکە هیچیشی نەخواردبوو، بەوهۆیەوە  بێهۆش کەوتبوو، سەرەتا لە سیروان کەمێک ئاوم هێنا و دەموچاوی کچەکەم پێ شۆری، وتم با جارێک دەم و چاوی پاک ببێتەوە، یەکەمجار کە ئاوەکەم کرد بە دەم و چاویدا جوڵەی نەبوو، بەڵام دووەم جار کە ئاوەکەم کرد بەدەموچاویدا کەمێک لێوی جوڵاند، وتم دەی ئینشائەڵڵا ماوە، مشتێک ئاوم لە سیروان دەرهێنا بە تکەتکە ئاوەکەم تکاندە ناودەمی، وردەوردە هەستم کرد کە گیانی تێدا ماوە، لەگەڵ ئەوەشدا هێشتا جوڵەیەکی وای نەبوو، بەڵام ئەمزانی کە ماوە و هەناسەی خەریک بوو تەبیعی ئەبوویەوە، لە ترسی سەرما ئەوەندە پەڕ و پاڵی پێوە پێچرابوو لە سەرەتا هەستت بە هەناسەکەشی نەئەکرد.

کە چووینە ئەوبەرەوە خێوەتێک هەبوو، کۆمەڵێک پاسدار خواردنیان هێنا بۆ ئەوێ، هەتا شیری مناڵیشیان پێ بوو، بەحوکمی ئەوەی ساڵی پێشوو من لە ئێران بووم و هەروا سێ چوار کەلیمەی فارسی شارەزا ببووم، پێم وتن شتێکی ئاوا هەیە، پاسدارەکە ڕۆیی پەرداخێک شیری بۆ هێنام، هەر بە پەرداخەکەوە کردم بەدەمییەوە، نیوەی خوارد، هەر بەو نیوەیە کە خواردی چاوی کردەوە، ئیتر من هەر لەوێ مامەوە و نەڕۆیشتم، فڕۆکەش ئەهات و ئەگەڕا، بەڵام دژە فڕۆکەکانی ئێران کە بەڕاسەرمانەوە بوون، چونکە ئەو ناوچە هەمووی شاخ و کەژە، هەمووشیان دانەیەک دووانی پێوە بوو، لە بیست لاوە تەقەیان لە فڕۆکەکان ئەکرد، بەوهۆیەوە فڕۆکەکان نەیانئەتوانی زۆر نزیکی ئێمە ببنەوە.

من لەوێ زۆر مامەوە، وەختێکم زانی کچێکی حاجی محەمەدی برام(کاکەم) بەناوی بەناز دەرکەوت، کە  تەمەنی هەشت ساڵ بوو، خۆی بە تەنها هاتبوو، بانگم کرد و گلمدایەوە لەلای خۆم، تۆزێک خواردنم لەلای پاسدارەکان هێنا و ئامادەم کرد، کە بەشی دە دوانزە کەسی ئەکرد، وتم ئێستا ئەو کەسوکارە دێن هەمووشیان برسییانە، با نان ئامادەبێ، کە هاتن بیاندەمێ، کچەکەم خستە باوەشی بەناز، وتم تۆ ئاگات لەمە بێت منیش با ئاگام لەو خەڵکە بێ کە دێن، دوای چارەکێک کوڕێکی خاڵۆم بەناوی ئەرسەلان محەمەد هات، ئەویش هەر مناڵ بوو، تەمەنی حەوت هەشت ساڵ بوو، ئەویشم بانگ کردە لای خۆم و دامنا، دوای ماوەیەک فاتمەی خوشکم کە قاچی لەجێ چوو هات، ئەویش هەر تەنها بوو، ئەویشم بانگ کرد و لای خۆم گلمدایەوە، ماوەیەکی تری پێچوو کچێکی حاجی نەجیمی مامەم بەناوی ئاواز هات. دواتر برایەکی ئاواز بەناوی جەمال هات، تا ئەمەمان کرد ئیسراحەتمان کرد و نانمان خوارد و برسێتیمان شکا، بەڵام ئیتر بەرەو تاریکی ئەڕۆیی، کەوتینە دوای بانگی عەسر وتم کاکە تا ڕۆشنایی هەیە با خەمێک

لەم منداڵانە بخۆین جەمالی مامەمساڵێ دوو ساڵ لە من گەورەتر بوو، وتم با ئیتر ئێمەش بڕۆین و سواری گەلابەیەک ببین، چونکە ئێرانییەکان گەلابەی زۆریان هێنابوو، خەڵک سوار ئەبوون، هەرچۆنێک بێت ئێمەش سواری گەلابەیەک بووین، دوای گەلابەکە پڕ بوو لە قسڵ، قسڵ وەکو گەج وایە، سایەقەکەی نەیکردبوو ئاوێکی پیا بکات، بەسوغرە گرتبوویان و ئەویش هەر بە قسڵەکەوە هاتبوو، بڕوابکە هەروەکو کیمیاییەکە خۆڵ چووە چاومان، هەر نەتدەوێرا چاو بکەیتەوە، هەتا بردینیانە سەریاس ئەوە حاڵمان بوو.

ئەو ڕۆژە کەس ئاگای لە کەس نەبوو، سەد بانگت ئەکرد کەس جوابی نەبوو، ئەوەندە خەڵک نێوانی کەوتبوو لەگەڵ کەسوکارەکەی، بەنموونە من نزیک سەعات هەشتی بەیانی لە سیروان پەڕیمەوە ئەوبەر هەتا عەسر دانیشتووین لەو خێزان و کەسوکارە زۆرەی ئێمە هەشت نەفەر هاتووە، ئەوەی کە لەبەر قاچ و قولی نەیتوانیبێت یان تەمەنێکی بووبێت ڕۆژێک دواتر گەیشتووەتە ئەوێ، ئیتر با ساڵێک بانگ بکەیت، لەکوێ ئەوانت بۆ ئەدۆزرێتەوە؟

وەک گووتم دوای عەسر بوو سواری ئەو گەلابە بووین تا سەریاس دایان نەنایین، لە سەریاس تاریکی کرد، ئێمە کە گەیشتینە ئەوێ بەفرباری بوو، تەقریبەن چوار پەنجە بەفر لە ئەرزا بوو، من لە ڕێگا کە بینیم گەلابەکە بەرەو ئەوێ ئەڕوات زۆرم پێخۆش بوو، وتم سەریاسە و شارەزای ئەو ناوەم، خەمی منداڵەکانم بوو، وتم منداڵەکان ئەدەمە دەستی ئەم کوڕەی مامم و خۆم بۆ سۆراغی کەسوکارەکەم ئەگەڕێمەوە بۆ گوێی سیروان، بەلام کە چووینە ئۆردووگاکە مەسئولی ئۆردوگاکە ڕێگەی پێ نەدایین دابەزین، هەرچی هاوارمان کرد، هەرچی سایەقەکە پاڕایەوە بۆمان وتی شوێن نییە، ئەبێ لێرە بڕۆن، دیسان گەڕاندینیانەوە بۆ سەر جادەی قیر، لەوێوە سەیارە کەوتەڕێ هەتا سەعات دەونیوی شەو ڕێی کرد، گەیشتینە شارێک بەناوی هەرسین، لەوێ بردینیانە هۆڵێکی گەورەی داخراو، کە ئێمە گەیشتین تەماشا ئەکەین دووسەد هەر خێزانی تیایە، سوبحانەڵا دوای نیوسەعات لە تەنیشتمانەوە ژنێک منداڵی بوو!

ئێمە زۆر ماندووبووین هەر دانیشتبووین و سەیرمان ئەکرد، بەلام ئەوەی زووتر گەیشتبوو ئیسراحەتی کردبوو، مێردی ژنە منداڵبووەکە لێپرسراوی هۆڵەکەی ئاگادارکردەوە کە شتێکی وا هەیە، کتریی و قۆریی و مەمکە مژەیەک و شیرێکی قوتوو و عەلادینیان بۆ هێنا و دایانگیرساند، لەوکاتەدا کە دوو پاسدار شتەکانیان هێنایە ژوورەوە من قۆڵی یەکێکیانم گرت، بە فارسی پێمگووت منیش ئەم منداڵەم پێیە دایک و باوکیم ونکردووە، هاوکارییەکی منیش بکەن، شیر ئەخوات و منیش شیرم پێ نییە تەنها قوتوویەک شیر و مەمکەیەکی شیرم بۆ بهێنی بۆ ئەم منداڵە خۆم لەم کتریی و قۆرییە

ئاوی بۆ گەرم ئەکەم، ماڵی ئاوابێت ڕۆیشت شەمسەدینێک و کترییەک و دوو کیلۆ شەکر و قوتوویەک شیری بۆ هێنام.

ئێمە سێ ڕۆژ لەو هۆڵە ماینەوە، هۆڵەکە نزیکەی هەزار کەسی تیابوو، شوێنەکەش مەکتەب نەبوو هەر هۆڵێکی گەورەبوو، وەک ئەم هۆڵی تەربیەی لای خۆمان(١)، ئەوەندە قەرەباڵغ بوو، کاتێک ئەڕۆیشتی دەستێک بەئاو بگەیەنی هەتا ئەگەڕایتەوە کەسێکی تر لە شوێنەکەتدا خەوتبوو..

هۆڵەکە بریندارێکی زۆریشی لێ بوو، هەتا ئەو ژنەی(تەڵعەت) کە دوو منداڵەکەی مردبوو لەوێ بوو، لە نەخۆشخانە چاکەت و بیجامەیەکیان کردبوویە بەری، دەستە شکاوەکەی لە ملیدابوو، چاوی شین ببوویەوە بە لەفاف پێچابوویان، ئەیگووت ئازارم زۆرە، هەرچی پەراسوومە شکاوە، هەتا ڕەوانەی نەخۆشخانەکانی تارانیان کرد، ئەویش بە تەنهابوو، لە ماڵ و لە کوڕ و کچ دابڕابوو، بەڵام بە تەنها کەوتبوویە ئەوێ، هات وتی نووری بەڵکو بێیت لەگەڵمدا بۆ نەخۆشخانە، منیش وتم وەڵا دادە تەلعەت من ئەم منالانەم پێیە، چییان لێ بکەم، تۆ بە یەکێک بڵێ کە زگورد بێت یان دوو خوشک یان دوو برابن یەکێکیان بەریت لەگەڵ خۆتدا، لەڕاستیدا زۆرم پێناخۆش بوو کە دەستم بەڕوویەوەنا، چونکە هەم دراوسێمان بوو لە هەڵەبجە و هەم لێقەوماویش بوو، بەڵام ئیتر منیش حاڵەتەکەم وابوو، حەوت منالم بە سەرەوە بوو، نەمدەتوانی ئەو منالانە بێ ساحێب جێبهێڵم، بەڕاستی وەزعێکی ناڕەحەت بوو، وەک گووتم سێ ڕۆژ لەو هۆڵە ماینەوە.

دوای سێ ڕۆژەکە تەکلیفم لە مەسئولی ئەو پاسدارانە کرد، وتم کاکە عەلەل عەقەل هاوکاریەکم بکەن ئەگەر خەڵکی تری هەڵەبجەی تیایە با بگەڕێم با بزانم دایک و باوکی ئەو منالەی تیا نادۆزمەوە، هەر تەنها ئەوان بدۆزمەوە منالەکانی تر گەورەن و زۆر کێشەیان نییە. وەڵا ئیتر ماڵی ئاوابێت ڕۆژێک هات بە سەیارەی خۆی بردمی، هەشت مەکتەب لە هەرسین ئاوارەی تیابوو، مەکتەب بە مەکتەب گەڕاندمی، سوبحانەڵڵا لەو کەسوکارەی ئێمەدا تەنها خالۆزایەکی باوکم بینی، نە باوک و دایک نە برا نە خوشک نە مام نە خاڵ کەسیانم نەبینی. نەتیجە هاتە سەر ئەوەی وتی کاک نوری من هەر ئەوەندەم لە دەسەڵاتدایە، لەم شارەدا هەر ئەم هەشت مەکتەبە هەیە، بەڵام قەرارە خەڵکی تر بێت، بەڵکو دایک و باوکی ئەم منالەش پەیا ببێ. هاتینەوە و دانیشتین، دوو ڕۆژی تر واتە بوو بە پێنج ڕۆژ لەوێ ماینەوە، دوای پێنج ڕۆژەکە، ڕۆژێک سەیارەیەکیان هێناو لە هەرسین

---

١. مەبەستی هۆڵی بۆنەکانی هەڵەبجەیە، کە کەوتووەتە بەرامبەر بەڕێوەبەرایەتی گشتی پەروەردەی هەڵەبجە.

دەریان کردین، بردینیانە بنی شاخێک، لەوێ خێمەیان هەڵدابوو، ئۆردووگایەکی تریان دروستکردبوو، دوو خێمەیان پێداین، لەو دوو خێمەدا ماینەوە. ئێستا ناوی ئەو شوێنەم بیر نەماوە، بەڵام نیو سەعات سێ چارەک لە هەرسینەوە دوور بوو، ناوی کەژێک بوو.

بەم منداڵانەوە نزیکەی هەژدە ڕۆژ لەوێ ماینەوە، لەوێ سەد خێمەی لێ بوو، هەر خێمەیەک یەک نەفەری تیابوو، هەمووی وەک ئێمە لە خزم و کەسوکاری دابڕا بوو، کابرا دە سەر خێزان بوون لەوێ بە تاقی تەنها لە خێمەیەکدا بوو، هەواڵی کەسیانی نە ئەزانی، ئیتر من بە حوکمی ئەوەی تۆزێک لە فارسییەکە شارەزا بووم، لەگەڵ یەکێکیاندا پەیوەندیم پەیداکرد، بەبۆنەی منداڵەکانەوە هاوکاری ئەکردم و شتی بۆ ئەهێنام، ڕۆژێک پێمگووت شتێکم بۆ بکە بۆ ئەم منداڵە، وتی باشە، ڕۆژێک هاتبوو بە شوێنمدا من لە خێمەکە نەبووم، لەلای هاوڕێیەکم بووم، وتبووی کە هاتەوە بینێرن بۆ پاسگاکە، کە ڕۆیشتمەوە منداڵەکان وتیان هاتوون بە شوێنتا، منیش بەپەلە ڕۆیشتم ناو و عینوان و شتم پێدابوو، وتم بەڵکو هەواڵێکی پێ بێت، کە ڕۆیشتمە ئەوێ، وتی کاکە نووری، وتم بەڵێ، وتی ئەم ئێوارە لەگەڵ بانگی عەسرا پاسێک دێت بۆ ئێرە یەکەم کەس تۆم نووسیوە سوار ببی، چەند منداڵت پێیە گشتیان ئەبەی لەگەڵ خۆتدا، ئەچێتەوە هەرسین، کۆمەڵێک خەڵکی تر هاتوون، ئەم سەیارە ئەتانباتە ئەوێ، لەوێ سەرلەنوێ بگەڕێ ئەگەر دایک و باوکیانت بۆ دۆزرایەوە سواری پاسەکەیان بکەو بیانهێنە بۆ ئەم خێمەی خۆت، ئەگەریش لەوێ نەبوون ئەم پاسە لەوێوە ئەڕوات بۆ شارێکی تر بەناوی (گالیاران). پاسەکە بردینی بۆ هەرسین، دیسان مەکتەبەکان گەڕاین کەسیانمان نەدۆزییەوە، ئیتر لەوێوە بەڕێکەوتین هەتا گەیشتینە گەلیاران، کە نزیکی هەمەدانە، یەکەم مەکتەب کە گەڕاین ئەوانی لێ نەبوو، دووەم مەکتەب کە چووینە ناوی، ناوی شەهید بەهەشتی بوو، تەماشا ئەکەم دایک و باوکی کچەکە و دایک و باوکی خۆم و کەسوکارەکانی ترمان هەموویان لەوێن. لەخوا بەزیاد بێت هەموویان سەلامەت بوون، تەنها برینداری ئەوەبووین کە ڕێژەیەکی کەم کیمیایی لێیدابووین، کاریگەرییەکی کەمی لەسەر دەم و قوڕگ و لوت و چاومان دانابوو.

ئێمە هەتا پێنج شەش ڕۆژی سەرەتا کە لەوێ گیرساینەوە و ئیسراحەتمان کرد، ئەگەر کلێنسی ئێستات سەرف بکردایە، ڕۆژی سێ پاکەتت ئەویست، بەس بۆ لوت و چاو کە بیسڕی، ئاویان پیادا ئەهاتە خوارەوە. تەنگە نەفەسیمان نەبوو، بەڵام سەرئێشەمان هەبوو، ئەویش پێویستی بە چارەسەر نەکرد و بەکارمان نەهێنا.

لە سەرەتاشەوە هەر ژوورێک نزیکەی دەماڵی تێدابوو، دە ماڵی قەرەباڵغ نا، بەڵام ژوورەکانی گەورە بوو، پاسدارەکان خۆیان ئەگەڕان دە خێزانیان ئەدۆزییەوە، خێزانی

دوو نەفەر و سێ نەفەر ئەیان خستە ژوورێک، بەڵام ئەوانەشیان کە زۆربوون پێنج و شەش خێزانیان بەیەکەوە دادەنا، واتە بەپێی ژمارەی ئەندامانی خێزان بوو، ئەوان سەیری ژمارەی خێزانەکان و قەبارەی ژوورەکەیان ئەکرد، ئەیانزانی چەند کەس جێی ئەبێتەوە تیایاندا.

پێموابێت دوو سێ مانگێک لەو مەکتەبە ماینەوە، بارودۆخمان ناخۆش و نارەحەت بوو، چونکە وەک سجن وابوو، ڕێگە نەبوو بێیتە دەرەوە، هەتا ڕۆژێکیان منداڵێکی خوشکەزام بەناوی عیرفان هاتبووە دەرەوە، لە بەردەم مەکتەبەکەدا ماتۆڕێک لێی دابوو زۆر بە نارەحەت هێشتیان بڕۆینە دەرەوە، لە عایلەیەکی گەورەی پەنجا کەسی تەنها ڕێگەی سێ کەسیاندا بچێتە دەرەوە و لەگەڵی بڕوات بۆ نەخۆشخانە. ئەوەش بڵێم، ڕاستە ئێمە لەناو ڕووداوەکانی هەڵەبجەدا بووین و دواتر وەک چۆن باسم کرد هەڵهاتین بۆ ئێران، بەڵام نەمانزانی دوای ئێمە چی ڕوویداوە، دوای گەیشتن و گیرسانەوەمان لە ئێران لە ڕێگەی ڕادیۆ و تەلەفزیۆنەوە زانیمان شار تەواو وێران بووە و ئەو کارەساتە گەورە بووە بەهۆی شەید بوون و برینداربوونی ئەو ڕێژە زۆرەی خەڵک.

یەک شتی ترم بیرنەچێ، ئەوکاتەی کە لە مەکتەبەکەی شەهید بەهەشتی سەراب فەرش بووین پێموابێت چل بۆ پەنجا شەو دوای کارەساتەکە بوو، حکومەت هات بڕیارێکی دەرکرد کە خەڵکی هەڵەبجە ئەتوانن بگەڕێتەوە بۆ ناو هەڵەبجە ئەو خواردن و مومتەلەکاتانەی کە لەوێ بەجێیان هێشتووە بیهێنن، سەیارەیان ئەداینێ ئەیانگووت بڕۆن هەرچیتان جێماوە لەگەڵ خۆتاندا بیهێنن بۆ ئێرە. هەر سێ ماڵ و چوار ماڵ و دوو ماڵ سەیارەیان بۆ دابین ئەکردین. ئێمە و ماڵی حاجی حەمەسەعیدی پریسی خواروو و کاک قادری زاوامان لۆرییەکیان پێداین، بەلۆریەکە لە پاوەوە هاتینە تەوێڵە و لەوێشەوە بۆ هەڵەبجە، پاسدارمان لەگەڵ بوو، دەبوو تەنها بڕۆیتە ماڵی خۆت، کەس نەیدەتوانی بڕواتە ماڵی ترەوە، ئەو پاسدارانە ئاقڵیش بوون چاودێرییان ئەکردی بزانن ماڵی خۆتە یاخود نا، هەرچی کەلوپەلێکی ماڵەکانمان کە جێمابوو و بەکەڵک ئەهات لەگەڵ خۆماندا بردمانەوە بۆ ئێران. کاتێک ئێمە گەڕاینەوە بۆ هەڵەبجە، پاسدار و پێشمەرگەمان ئەبینی، بارەگا و مقەڕاتیان لێرە هەبوو، شارێکی کش و مات و خامۆش و وێرانبوومان بینی، بەڵام هیچ لاشە و تەرمێکمان بەرچاو نەکەوت، وادیاربوو هەموویان ئەسپەردە کردبوو.

**پرسیار/ ئەڵێن ڕۆژانە پاسدار گەڕاون بە مەکتەبەکاندا وتوویانە کێ بەچەی ونبووە ئەدرەسیان وەرگرتووە، یان منداڵیان پێ بووە بە ئۆردووگا و مەکتەبەکاندا گێڕاویانە بۆئەوەی بیاندەنەوە بە دایک و باوکیان، ئەوە چۆن بووە؟**

وەڵام/ ئێرانییەکان سەرژمێرییان ئەکرد، چەند کەس بوون و ئێستا چەندن؟ مناڵەکانتان لەکوێ ونبووە، کەستان لێ مردووە یان چییان لێهاتووە، یانی ئامارییان وەرئەگرت، چۆن بڵێی تەحقیقێکی کاملیان لێ ئەکردین تا بزانن لەوێوە کەوتووینەتە ڕێ، چەند کەس بووین و ئێستا چەندین، چەنێک گەیشتووەتە ئەوێ، چەندمان سەلامەتە و چەندمان بەر کیمیایی کەوتوون، ئەو زانیارییانەیان هەمووی وەرئەگرت لە خەڵکی نێو مەکتەبەکان، هەتا لەقەبیشیان دائەنا بۆ زۆر کەس.

**پرسیار/ دوای ئەو سێ مانگە چوونە کوێ؟**

وەڵام/ دوای دوو سێ مانگە ئێمەیان برد بۆ گەلیاران، ئەوێش ئۆردووگایەک بوو، ئۆردووگاکە خێمە بوو، هەتا پاییز لەناو ئەو خێمانەدا بووین، دوای ماوەیەک خانوویەکی زۆریان دروستکرد بۆ خەڵک. من نازانم ئەو خانووانە حکومەت لەسەر ئەرکی خۆی دروستی کردن یاخود لەسەر ئەرکی ڕێکخراوی بیانی بوون، بەڵام بۆ خەڵکەکەی ئێمە باش بوو، ڕۆژانە ئەڕۆیشتن کرێکاریان ئەکرد، وەستای ئێرانی ئەهات و ئێمەی عێراقیش کرێکار بووین لەبەردەستیاندا، خانووەکان لە تەواوبووندابوون، حکومەتی عێراق لێبوردنە گشتییەکەی دەرکرد.

ئەو چەند مانگەی لەوێ بووین ڕۆژانە خواردنی وشکەیان پێ ئەدایین وەک برنج و ڕۆن و شەکر و چا... تاد پێ ئەدایین، بە فەردە پەتاتە و پیازیان ئەهێنا و ئەیاندا بە ماڵان، هەر ماڵە و فەردەیەکی پێ ئەدا. سەرەتا حەفتانە بوو دواتر بوو بە مانگانە، چونکە فریا نەدەکەوتن بۆیە کردیان بە مانگانە، لەبری ئەوەی چوار هەفتە لەسەر یەک وەرتبگرتایە مانگانە هەموو حسەکەیان پێ ئەدایت.

بەنیسبەت چوونە دەرەوەشەوە، دوای چوونمان بۆ ئۆردووگا خەڵک کەمێک ئازاد بوو، ئەیتوانی جارجار بڕواتە دەرەوە، وەرەقەیان بۆ ئەکردی ئەڕۆیشتی بۆ کرێکاری یان بۆ ناو شار بۆ کرێکاری یان بۆ ئەو باخانە سێوت ئەچنی، بەکورتی بەڵگەی چوونە دەرەوەیان بۆ ئەکردی.

بەگشتی مامەڵەشیان باش بوو، لێدان و شت نەبوو، مەگەر یەکێک خۆی خراپ بوویێت، ئیحتیرام و ڕێز هەبوو، ئیحترامی خۆت بگرتایە ئەوانیش ئیحترامیان ئەگرتی، بەڵام هەبوو شەڕی ئەفرۆشت ئەوانیش لێیان ئەدا، یان هەر لەناو ئۆردوگاکە لەگەڵ خەڵکی خۆمان شەڕی ئەکرد، ئەوانیش پێیان ناخۆشبوو، چەند حاڵەتێکی لەوشێوەیە هەبوو، بەڵام بەگشتی مامەڵەیان باش بوو لەگەڵمان.

هەم لەناو مەکتەب و هەم لە ئۆردووگاش نمایندەمان هەبوو، لەناو خەڵکەکەی خۆماندا

دانیشتن ئەکرا کە بڕۆین داوای چی بکەین و داوای نەکەین، هەتا بۆ مەسەلەی ڕێگەدان و چوونەدەرەوە کۆمەڵێک پیاو کۆبوونەوە بۆئەوەی قسە لەگەڵ لێپرسراوەکان بکەن کە ئیتر ڕێگە بە خەڵکی بدەن بتوانن بڕۆنە دەرەوە، چونکە ئێمەش وەک ئێرانیمان لێ هاتووە.

بەگشتی ئەو چەند مانگەی کە لەوێ بووین ئیسراحەت بووین، بەڵام لەوێ بەزمێکی تر ڕوویدا، عێراق هێرشێکی کرد، دیموکراتی خستە پێش خۆی و هاتە کرماشان، خەڵک لەوێش ترسی لێنیشت، خەڵک ڕایکرد، ئێرانی لە کرماشانەوە ئەهات بەلای ئێمەدا ڕایئەکرد و ئەڕۆیشت، بۆیە لەوێش هەر ترسمان هەبوو، بەڵام ئیتر لەخوا بەزیادبێت سەرنەکەوتن و ڕەوشەکە ئاسایی بوویەوە.

**پرسیار/ واتە ئێوە ئەو چەند مانگەی دواتر هەر لە گەلیاران بوون؟**

هەر لەوێ بووین هەتا حکومەت لێبوردنەکەی دەرکرد، خەڵک بە بەردەوامی گوێی لە ڕادیۆ ئەگرت، بۆیە کە لێبوردنەکە دەرچوو خەڵک بەگشتی  ئاگاداربوون. ئێمە زانیمان ماوەی لێبوردنەکە یەک مانگە، بەڵام وتمان ئەگەر لە ماوەی ئەو یەک مانگە نەبێ دوو ڕۆژیش تێپەڕێت هیچ نابێت، خەڵک نەیدەزانی کە ئەگەر کاتەکە تەواو ببێت نارەحەتی لەدوا بەجێ ئەمێنێ، بەنموونە ئێمە نزیکەی (٢٥-٢٧) ڕۆژ بەسەر لێبوردنەکەدا تێپەڕی ئەوکات بیرمان لەوە کردەوە کە بگەڕێینەوە. دوای ئەوەشی کە بڕیاری گەڕاندنەوەماندا خۆمان سەیارەمان گرت، خزم و کەسوکار لە دایک و باوک و خوشک و برا هەموومان بەیەکەوە گەڕاینەوە. هەرچیمان هەبوو لەگەڵ خۆمان هێنامان، تەنانەت شتومەکی زیاتریشمان کڕی وەکو فەرش و خواردن، هەڵنەبم سێ ماڵ چوار ماڵ بووین لۆرییەکمان گرت، لۆرییەکە هەتا تەوێڵە هێنایینی.

لە تەوێڵە خەڵکێکی زۆری ئاوارەی گەڕاوەی لێ بوو، ئەبوایە سەرەت بگرتایە بۆ ناونووسین، لە ئێران کیتابێکیان پێدابووین، ئێرانییەکان کیتابەکەیان پیشانی لایەنی عێراقی ئەدا، ئەوانیش تەنها سەیرێکیان ئەکرد، عێراقییەکانیش کیتابێکیان بۆ ئەکردی و سەیارەیەکی ئیڤا یان لۆرییەکان پێ ئەدایت، تۆش شتەکانت لە سەیارە ئێرانییەکە دائەگرت و ئەتخستە سەیارە عێراقییەکە. بەڵام بواری ئەوەیان ئەدا کە سەیارەکان بگەن بەیەک، ئەوەش هەر باش بوو، سەیارەکان دووایان ئەکردە یەک و شتەکان لەم سەیارەوە ئەگواستەوە سەیارەکەی تر.

**پرسیار/ مامەڵەی عێراقییەکان چۆن بوو لەگەڵتان؟ دوای گەڕانەوە لەکوێ گیرسانەوە؟**

وەڵام/ سەبارەت بە مامەڵەی لایەنی عێراقیش لەگەڵ ئاوارەکان، هەبوو ئەیوت زۆر ئیهانەیان کردووین، بەڵام لە تەوێڵە لەگەڵ ئێمە باش بوون. ئێمە پێمان واشبوو بۆ

هەڵەبجەمان ئەگەڕێننەوە، خۆ ئەگەر خەڵک بیزانیایە بۆ هەڵەبجە نییە، لە سەدا بیستی نەدەهاتەوە، دوای ئەوەی لە سێ ڕێیانی زەڵم لەبری بەرەو هەڵەبجە بەرەو سەیدسادق بردینیان ئیتر زانیمان کە ناگەڕێینەوە بۆ هەڵەبجە بۆیە ترسمان لێ نیشت. هەرچۆنێک بێت سەیارەکان گەیاندینیانە ناحیەی عەربەت، بەعس لەوێ مونەزەمەیەکی هەبوو، لیژنەی عایدونەکەیان لێ دانابوو، بە چواردەوریدا پاسەوانیان بۆ دانابوو، بۆئەوەی هیچ کەس نەتوانێت دەربچێت. نەفەر بە نەفەر پەنجەمۆریان پێ ئەکردین و تەحقیقیان لێ ئەکردین، لەکوێ بوون؟ چۆن ڕۆیشتن؟ لە کوێوە ڕۆیشتن؟ لەکاتی لێکۆڵینەوەدا هەڕەشە و تورەبوون و گرتنی تێدا بوو، خەڵکێک کە ناوی هەبووایە یان قسەی بەرزونزمی بکردایە لەگەڵیاندا و پێیان نارەحەت بووایە یان یەکێک هەڵەبجەیی نەبوایە ئەزیەتیان ئەدا. هەڵەنەبم کۆتا ڕۆژی عەفوات بوو ئێمە گەڕاینەوە، چونکە ڕۆژی دواتر هەرچی گەڕایەوە ئەنفالیان کرد.

ئەوەش بڵێم، ئەوەی خزم و کەسوکاری هەبوو لە عەربەت چاوەڕێی کردوون، چونکە ئەیانزانی ئاوارەکان ئەهێننە ئەوێ، خەڵکێکی زۆر ڕۆژانە لە عەربەت چاوەڕێی گەڕانەوەی کەسوکاریان ئەکرد، هەتا لەم دوایەشدا منیش ئەهاتم چاوەڕێی ماڵی مامەکانم ئەکرد.

دوای لێکۆڵینەوەکە وتیان هەر بە عەینی سەیارە بیانبەن بۆ بازیان، کەل و پەلەکانمان هەر لە سەیارە عەسکەریەکەدا بوو، زۆر وەستاندینیان، پێموابێت دوو سێ سەعاتێک ئێمەیان لەو مونەزەمە هێشتەوە.

هەرکەسێکیش کە فیرار بووایە هەر لە مونەزەمەکەوە نەیان ئەهێشت لەگەڵ عایلەکەیدا بڕوات، خێرا ئەیاننێردەوە بۆ شوێنی خۆی. ئێمەش زۆر برسی و تینوومان بوو، نەیان ئەهێشت بێینەدەرەوە و شت بکڕیت، هاتە سەر ئەوەی وتیان ئەمە کیتابەکەیان و بیانبەن. لەڕێگا کەوتینە قسەکردن لەگەڵ شۆفێرەکەمان، بە پارەیەکی کەم قایلمان کرد لەبری بازیان بۆ زەڕایەنمان ببات، پارەکە بۆ ئەو ڕۆژە بۆ شۆفێرەکە باش بوو. سایەقەکەش دەیتوانی ئەو کارە بکات، چونکە لە ڕێگای زەڕایەن یەک سەیتەرییەی تیابوو ئەویش ئەیتوانی خۆی لێ لابدات و لە شوێنێکی ترەوە بڕوات، سەیتەرییەکە لەسەر پردەکەی قەرەگۆل بوو، شۆفێرەکە بۆئەوەی نەدات لە سەیتەرییەکە لە نەصر و باریکەوە ڕۆیشت، چونکە شارەزابوو، سەفەری تری کردبوو، لە پشتی سەیتەرییەکەوە چووینەوە سەر جادە سەرەکییەکە و لەوێشەوە بۆ زەڕایەن.

لە زەڕایەن چووینە ماڵی خزم و کەسوکار، لەوێ ماوەیەک ماینەوە، بەڵام بارودۆخمان زۆرباش نەبوو. لەوێ ناویان لێنابووین ئێرانی، لەژێر چاودێریدا بووین، هەر دوو ڕۆژ و

چوار ڕۆژ جارێک ئەیانگووت ئەگەڕێن و ئێرانی ئەگرن، ئێمەیان کردبوو بە ئێرانی و بە هەڵەبجەیی نەمابووین، بانگەوازیان ئەکرد هەرکەسێک ئێرانی بردبێتە ماڵەکەی، ماڵەکەی بەسەرا ئەڕوخێنین، هەتا ئێمە لە ماڵی پورزایەکی دایکمدا بووین زۆرمان خۆشەویست و زۆریشی خۆشەویستین، فەقیرە زۆر ترسابوو، چونکە ئەگەڕان تەقەیان لە دەرگا ئەدا و ئەیانگووت ئێرانی لە ماڵتاندایە یاخو نا؟ کابراش ئەگەر ماڵی هەڵەبجەیی لە ماڵیدابوویە نەیدەوێرا بڵێت نەخێر، لەوە دەترسا خانووەکەی بەسەردا بڕوخێنن.

ڕۆژێک کە گەڕابوون، دایابوویان لە دەرگاکەمان، ئەو پورزای دایکمە( پورێ وەنەوش) ڕۆشتبوو درگاکە بکاتەوە، وتبوویان ئێرانی لە ماڵتاندایە؟ دایکیشم لە پشتییەوە بوو، وتبووی ئەسمەری پورم بڵێم چی؟ دایکیشم وتبووی وەڵا بڵێ ماڵێکی تیایە، ئەوانیش وتبوویان بانگیان بکەن، دایکیشم خواعەفووی بکات، هاتبوویە دەرەوە، لێیان پرسی بوو هەر خۆت لێرەی؟ ئەویش وتبووی نەخێر عایلەیەکین، وتبوویان کوان؟ ئەوانی دیکەشمان بۆ بانگ بکەن، دایکم وتبووی لە ماڵەوە نین، ئیتر دایکمیان بە تەنها بردبوو بۆ منەزەمەکەی زەڕایەن، ئەو ڕۆژە سی و حەوت ماڵیان بەوشێوەیە بردبوو، ئەو ڕۆژە دایکم و پەریخانی براژنم کە خێزانی حاجی محەمەدی برامە گیرابوون و بەر ئەو هەڵمەتە کەوتبوون. کە گەڕابوون پیاوەکان لە ماڵ نەبوون، بۆیە زۆربەیان ژنەکانیان گیرابوو، دوای ئەوەی پیاوەکانیان گەڕابوونەوە بۆ ماڵەوە و لە هەواڵەکە ئاگاداربوون، ڕۆشتبوون بەدوایاندا بۆ مونەزەمە، کاتێک چووبوون ماوەی یەک ڕۆژیان بۆ دانابوون بۆ خۆکۆکردنەوە و ڕۆیشتن بۆ ئۆردووگاکانی هەولێر.

ئۆردووگایەکیان لە نزیک هەولێر بۆ کردبووینەوە، پێیان ئەگووت بەرحوشتر، تازە کرابویەوە، هەزار ماڵێکی بۆ چووبوو، خەڵکی بادینانیشیان بۆ هێنابوو، کیتابیان بۆ کردین و وتیان ئەبێ بە سەیارەی خۆتان بڕۆن بۆ بەرحوشتر، ئەم سی و حەوت ماڵە سەیارەمان گرتوو دووبارە ماڵمان بارکردەوە بۆ ڕۆیشتن بۆ بەرحوشتر.

دوای بانگی عیشا گەیشتینە ئەوێ، تەماشامان کرد، خاکەکەی یەک پارچە دڕک و داڵە، نە ئاو نە ژیانی تیا نیە، سارد و سەرمایە، پێش ئێمە خەڵکی بۆ برابوو، ئەوەی زووتر ڕۆشتبوو شوێنی خۆی پاکردبوویەوە، زۆربەی پیاوە گەورەکانی ئەم خێزانانە ڕۆیشتن کلیلی مەکتەبەکە لە حەرەسەکەی وەربگرن بۆئەوەی ئەو شەوە هەتا بەیانی بڕۆنە ناو مەکتەبەکە، کە چووینە ناو مەکتەبەکە شوێنی دانیشتنی هەر نەبوو، چونکە وەرزی زستان و سەرما بوو، ناچار پەلی ماڵ و منداڵمان گرتوو هەموومان ڕۆیشتینە ناو مەکتەبەکە هەتا بەیانی.

ئەو پارچە زەوییانەی کە دواتر لەو ئۆردووگایە وەرمانگرت، هەموویان ڕەقەم کرابوون و پێشتر دابەشکرابوون، بە فەترەیەکی کەم تەئسیساتی ئاو و جادەی چەوڕێژیان بۆ کردبوو، کۆڵان کۆڵان و پارچە پارچە هەموویان جیای کردبوویەوە، کە ئەمە سنوور و ناوچەی تۆیە، ئەمەش ڕەقەمی پارچە ئەرزەکەی تۆیە. لەڕاستیدا خەڵک لەویش ئەترسا، لەوێ ژێرزەمینێکی گەورە و زەخمیان دروستکردبوو، قولاپی پێوە بوو، بڕوابکە ئەو ژێرزەمینە جێی پێنج هەزار نەفەر ئەبوویەوە، ئەوەندە گەورە بوو، لە تەواوبوندابوو، ئێمەش هەر بیرمان لەوە ئەکردەوە کە ڕۆژێک دێت هەموومان ئەکەن بەو قولاپانەوە، ئەوەندە ئەترساین، تەنانەت ئاگادارکراینەوە لەکاتی کرنەوەی ڕادیۆدا جگەلە ڕادیۆی عێراق هیچ ڕادیۆیەکی تر نابێ بکرێتەوە و هەموویان قەدەغەبوون.

ئەوکات خەڵک بۆ هەواڵ ڕادیۆی مۆتی کالۆ و ئێرانی ئەگرت، وتی جگەلە سەوتی عێراق یەک سەوت ببیستین لە ڕادیۆی یەکێکەوە ڕاستەوخۆ خۆی بەرپرسیارە. بەڵام چوونە دەرەوە هەبوو، ئۆردووگاکە مونەزەمەیەکی تیابوو ئەچووی لەوێ وەرەقەت ئەکرد، ڕێگەیان ئەدا بڕۆشتیتایە بۆ بەسرەش.

**پرسیار/ ئەڵێن خەڵکی هەولێر زۆر هاوکارییان کردوون؟**

وەڵام/ لەڕووی هاوکارییەوە خەڵکی هەولێر هاوکاریان دەنارد، بەڵام حکومەت ڕێگری لێ ئەکردن، ئەوانیش بەدزییەوە هاوکارییەکانیان دەنارد، خەڵکیش دوای ئەوەی کەمێک چاوی کرایەوە و جێگیربوو هەرکەس بەپێی ئیمکانیاتی خۆیماڵەکەی دەستکاری ئەکرد، ئێمە دوو هۆدەمان هەر بە قوڕ و بلۆک دروستکرد، باوکم خوا عەفوی بکات ئەو بلۆک و شتەی کڕیبوو، ئێمەش هەرچۆنێک بێت کردمان بە دوو هۆدە و چووینە ناوی، بەڵام خەڵکی واهەبوو هەر لەناو نایلۆندا ئەژیا، دارێکی لە ناوەڕاستی نایلۆنەکەدا هەڵدابوو، چرایەکی هەڵکردبوو، ئەتووت تەلەفزیۆنە کە سەیرت ئەکرد، هەموو خەڵک ئەیبینین چۆن هەڵەسن و دائەنیشن. بڕوابکە نزیکەی ساڵێک و ئەوەندە لەوێ ماینەوە خەڵک هەبوو هەر لەو نایلۆنەدا بوو، ئیمکاناتی ئەوەی نەبوو کە شوێنێکی باش بۆ ماڵ و منالّی دروست بکات.

لەڕووی مامەڵەوە ئەوانەی عەربەت کە سەرەتا ئیفادە و شتەکەیان لێوەرەگرتین زۆر توند بوون، بەڵام ئەوانەی بەرحوشتر زۆر چاکبوون، جارجار مەسیرەیان ئەکرد بە خەڵک، وایان ئەزانی ئەو خەڵکەی کە چووەتە ئێران گشتی بووە بە پێشمەرگە، ئەیانویست مێشکیان بشۆنەوە و بیانکەنەوە بە ئەندامێکی حیزبی بەعس، بەڵام ئێمە وەک عایلەی خۆمان نە دایک نە باوک نە خۆم نە خوشک کەسمان بەشداریمان نەکرد،

لەڕاستیدا ئێمە جەرگمان قایم بوو، ئەگەرنا ئەوەی تۆزێک بترسایە لە ناچاریدا بەشداری ئەکرد، بەڵام لە دڵەوە پێی خۆش نەبوو.

بەوحاڵەوە نزیکەی ساڵ و شتێک لەوێ ماینەوە، ئێمە من ساڵێکی مەکتەبم(پێنجی ئامادەیی) لە هەولێر تەواوکرد، تەواوکردنەکەش چۆن بوو، کە چووینە بەرحوشتر کە دەوام خوێند دەستپێکردەوە، منیش هاتم لە سلێمانی مامۆستا محەمەدێکمان هەبوو کاتی خۆی لە هەڵەبجە کە خەڵکی سلێمانی بوو، ببوو بەڕێوەبەری پەیمانگا ئیسلامییەکەی ئەوێ، چوومە لای دوای ئەوەی مەرحەبایی و چاک و چۆنێم لەگەڵ کرد، وتم مامۆستا شتێکی ئاوا هەیە، من تەلەبەبووم لە هەڵەبجە، هاتووم بۆ ئەوەلیاتێک شتێک، ئەوکاتە ئەوەلیات گشتی ئەگەڕایەوە بۆ سلێمانی، بەڵکو ئەو ئەوەلیاتەم بدەنێ و بتوانم لە هەولێر درێژە ب خوێندن بدەم، خوا هەڵناگرێ ئەوەلیات و شتەکەی بۆ دۆزیمەوە و بۆی تەرتیب کردم و پێیدام، منیش ڕۆشتمەوە بۆ هەولێر، نەک هەر من زۆربووین، هەموومان لەوێ جارێکی تر دەستمانکردەوە بە خوێندن.

دوای ئەمانە لێبوردنی دووەم لە ساڵی ١٩٨٩ دەرکرا. کە لێبوردەکە دەرچوو، ئیتر ڕێگەی خەڵکیاندا بگەڕێتەوە، هەرش بوو مەیلی گەڕانەوەی نەبوو، هەتا ماڵ بوو لەوانە ماڵ مامۆ ئەولکەریمی شوکرە هەتا ئەم چوار پێنج ساڵەی پێشوو لەوێ یانەوە، یانی گەڕانەوە بەزۆر نەبوو، وتیان کێ ئەیەوێت ئەتوانیت بگەڕێتەوە، ئێمە دیسان ماڵمان بارکردەوە و هاتینەوە بۆ زەڕایەن، لە زەڕایەن خانوویەکمان کڕی بۆ خۆمان، براو(حاجی محەمەد) خوشکەکانیشم( توبا و ڕووناک) لەوێ خانوویان کڕی ماینەوە.

ڕاستە ئێمە ماڵمان لە زەڕایەن بوو، بەڵام من لە سلێمانی ئەمخوێند، پۆلی شەشی ئامادەیم لە پەیمانگا ئیسلامییەکەی سلێمانی تەواوکرد.

ڕاستییەکەی ئێمە سێ برابووین هەرسێکمان فیراربووین، دوای ئەوە ڕاپەڕینی بەهاری ١٩٩١ی بەسەردا هات، ئێمە هەرزو خۆمان گەیاندەوە ئێران، دوای ئەوەی لە ئێران گەڕاینەوە ڕاستەوخۆ گەڕاینەوە بۆ هەڵەبجە و بەیەکجاری لێرە نیشتەجێ بووین.

## پێشەکی

هەر لەسەرەتای درووستبوونی شارستانییەتی ئیسلامی حەزێکی زۆری پرۆسەی وەرگێڕان، بۆ تێگەیشتن و نزیکایەتیی لەگەڵ نەتەوەکانی دیکە و بەمەبەستی بڵاوبوونەوەی بیر و باوەڕ و بۆچوونی ئیسلامی بیرۆکەی وەرگێڕان لای مسوڵمانان سەریهەڵدا. یەکەم قۆناغی مێژووی زانستی مسوڵمانان لە چالاکییە سەرەتاییەکانی وەرگێڕانی مسوڵمانانەوە لە سەردەمی ئومەویدا، دەست پێدەکات. بزووتنەوەی سەرەتایی وەرگێڕان لە کۆمەڵگەی ئیسلامیدا لە خالید بن یەزید بن المعاویە (لە ساڵی ٧٠٤ کۆچی دوایی کردووە دەست پێ دەکات.

لە سەرەتای بڵاوبوونەوەی ئیسلامدا، نیمچە دوورگەی عەرەبی بە قۆناغێکی نەزانیدا تێدەپەڕی و لەم قۆناغەدا جگە لە زانیاریی و کۆکردنەوە و پێشهاتەکانی پەیوەست بە بواری ئەدەب، بوارەکانی دیکەی زانست پشتگوێ خرابوون. بەپێچەوانەوە کاتێک سەیری میسر، سوریا، ئەنادۆڵ، جوگرافیای عێراق – ئێران و هیندستان لە سنووری بیزەنتین و ساسانی دەکەین، ئەو چالاکییە زانستیانەی کە بۆ ئەو سەردەمە زۆر بە پێشکەوتوو دادەنرێت، لە هەندێک شار یان ناوچەی گرنگی ئەو شوێنانەدا بە کاریگەرییەکانی زانست بە قووڵی دەردەکەون. ئاشنابوونی مسوڵمانان بە کولتوور و زانستەکانی ئەو شوێنانەی دەرەوەی بازنەی نیمچە دورگەی عەرەبی بە پەیوەندی ئابووری دەستپێکرد و بە چالاکییەکانی وەرگێڕان گەیشتە لوتکە. شارەکانی وەک حەڕان (١٨ک/٦٣٩ز)، جوندیشاپور (١٧/ک٦٣٨ز) بە ناوەندی فێربوون دادەنران و هەموو ئەم ناوەندانە لە سەردەمی عومەری کوڕی خەتاب ( ١٣-٢٣ک/٦٣٤-٦٤٤ ز)دا کەوتنە دەست مسوڵمانان.

ئەو هۆکارە بابەتییانەی کە ڕێگەیان بۆ سەرهەڵدانی بزووتنەوەی وەرگێڕان خۆش کرد:

١- فەتحەکانی ئەسکەندەری مەزن بووە هۆی بڵاوبوونەوەی زانستە یۆنانییەکان لە ڕۆژئاوای ئاسیا و میسر، ئەمەش سیمایەکی تایبەتی بەم ناوچەیەدا، کە هەندێک لە مێژوونووسان ناویان ناوە کولتووری هێلینیستی، ئەمەش لەماوەی ژیانی ئەسکەندەری گەورە لە ساڵی ٣٢٣ پ.ز تاکوو سەدەی حەوتەمی زایینی، درێژبۆوە.

٢- ئەو فیکرانەی کە ئایینی ئیسلامی بڵاوی کردۆتەوە، ئەوەی لە دڵی لایەنگرانیدا دروستی کردووە کە خۆشەویستیان بۆ زانست زیاد بکات و هاندەریان بووە، بەهۆی ئایەتەکانی قورئانی پیرۆز و فەرمایشتەکانی.

٣- فەتحە ئیسلامییەکان کە فاکتەری لێک نزیکبوونەوە بوون لە نێوان کولتووری

عەرەبی و کولتوورەکانی ئەو گەلانەی کە چوونەتە ناو ئیسلامەوە و باوەڕیان هێنا و سەرسام بوون بە فێربوونی قورئانی پیرۆز و فەرموودەکانی پێغەمبەر. ئەمانە لە فاکتەرە گرنگەکان بوون لە سەرهەڵدانی بزووتنەوەی وەرگێڕان، لە جیهانی ئیسلامیی.

٤- پێویستی مسوڵمانان بە زانستگەلێک کە ئاسانکاری بۆ جێبەجێکردنی ئەرکە ئاینییەکانیان بکات، کە پێویستی بە حیسابکردن و هەڵسەنگاندن و کات دانان هەیە، ئەمە وایکرد پرۆسەی وەرگێڕان بە ئاسانی قبوڵ بکەن.

٥- گواستنەوەی پایتەختی خەلافەت لە مەدینەوە بۆ دیمەشق و لە دیمەشقەوە بۆ بەغدا تەنها گواستنەوەی پایتەخت نەبوو، لە وڵاتێکەوە بۆ وڵاتێکی تر، یاخود تەنیا گواستنەوەی جوگرافی و فەزایی خەلافەت نەبوو، لە سەردەمێک بۆ سەردەمێکی تر، لە نەوەیەکەوە بۆ نەوەی نوێ. بەڵکوو ئەزموون و تێکەڵاویی کلتوور و کاریگەریی نزیکایەتی جوگرافیی لەسەر وڵاتە هاوسێکانی دروست کرد کە زمانیان عەرەبی نەبوو.

٦- ڕاستییەکی مرۆیی و کۆمەڵایەتی هەیە کە دەڵێت گەشەسەندنی زانست یەکێکە لە ئاکامەکانی سەقامگیریی و شارستانیەت، هەر کە دەوڵەتی ئیسلامی سەقامگیر بوو و لەڕووی سیاسیی و ئابووریی و کۆمەڵایەتییەوە گەشەی کرد، ڕوویان لە بزووتنەوەی فیکری کرد، کتێبە فارسی، یۆنانی و سریانییەکان، وەرگێڕان و گەنجینەکانیان لە زانستدا گواسترانەوە بۆ سەر زمانی عەرەبی.

٧- کێبڕکێی نێوان مسوڵمانان و پۆپۆلیستەکانی دەرەوەی خەلافەتی ئیسلامیی یەکێک بوو لە هۆکارە گرنگەکانی سەرهەڵدانی بزووتنەوەی وەرگێڕان.

## هۆکاری نابابەتیی خەلافەت بۆ ڕووکردنە پرۆسەی وەرگێڕان

١- عەرەبەکان خەمی زانستی پزیشکییان هەبوو، بۆئەوەی ئاشنابن پێی، سروشتی بوو لە زمانە ڕەسەنەکەیەوە بیگوازنەوە بۆ زمانی خۆیان، "یەکەم گواستنەوەش لە سەردەمی خالید بن یەزید بن معاویە بوو (٨٥ک/ ٧٠٤ز)، کاتێک ڕەبەنێکی ئەسکەندەری بەناوی ماریانۆس کتێبی کیمیای لە یۆنانییەوە گواستەوە بۆ زمانی عەرەبی." خالید بن یەزید بن معاویە ئاواتەخوازی خەلافەت بوو، کاتێک بێ ئومێد بوو لە بردنەوەی خەلافەت، بەدوای کات بەسەربردنێکی شەرەفمەندانەدا دەگەڕا کە لەگەڵ پێگەی خۆیدا بگونجێت، بینی کە ئەگەر بتوانێت کانزاکان بگۆڕێت بۆ زێڕ، ئەوا دەتوانێت سەرنجی خەڵک و خەلیفەکان بۆ لای خۆی بگۆڕێت، ئەویش پێگەیەکی دەبوو بە ئەندازەیەک کە

خەلیفەکان ئیرەیی پێ دەبەن.

هەروەها ئەمە لەلایەن پزیشکی فارسی جولەکە بە ڕەچەڵەک سریانی، زمانی مەسرگۆیە، هەوڵەکانی خەلیفەی ئومەوی عومەر بن عەبدولعەزیز لە بواری پزیشکیدا بە باڵاترین ئاست گەیاند، کە قەشە ئاهارۆن بن عەین لە ئەسکەندەریە بۆ زمانی یۆنانی دانرا، هەروەک عومەر بن عەبدولعەزیز کۆمەڵگەی پزیشکی لە ئەنتیکە فراوانتر کرد بەهێنانی پزیشک لە شاری ئەسکەندەرییە و ڕێنماییکردنیان و وەرگێڕانی هەندێک ئەدەبیاتی پزیشکی بۆ زمانی عەرەبی.

٢- فراوانکردنی گواستنەوەی بزووتنەوەی وەرگێڕان لە سەردەمی عەباسی، بەتەواوی فراوان بوو. بەوپێیەی ئەو سەردەمە ڕێنێسانسێکی پزیشکی بوو هاوتەریب لەگەڵ ڕێنێسانسی شارستانی گشتگیر لە هەموو ئاستەکاندا، هەربۆیە هەموو زانستەکان گەشەیان کرد، بە زانستە پزیشکییەکانیشەوە، بەوپێیەی بەغدا شوێنی مەبەست بوو بۆ ئەو کتێبانەی کە لە هەموو بەشەکانەوە هاتبوون. خەلیفە عەباسییەکان کە ڕۆڵێکی گەورەیان هەبوو لە هاندانی وەرگێڕان و پێشخستنی و ئەمانەش ئەبوجەعفەری مەنصور، هارونە ڕەشید و مەئموون بوون.

سەبارەت بە مەنصور، لە کۆتا ڕۆژەکانیدا (١٤٨ی کۆچی) تووشی نەخۆشییەکی گەدە بوو، ئارەزووی خواردنی نەمابوو. گوتیان: لە سەردەمی ئێمەدا کەسێک نییە وەک گۆرگیاس، سەرۆکی پزیشکی قوتابخانەی جوندیشاپور، ئەویش گۆرگیاس بن بەختیشوع سریانییە. هەربۆیە مەنصور بەپەلە بەدوایدا ناردی و باسی نەخۆشییەکەی خۆی بۆ کرد، گۆرگیاس ڕێوشوێنێکی سەرەتایی گرتەبەر، بۆیە مەنصور هەر زوو چاک بووەوە و گەڕایەوە بۆ باری ئاسایی خۆی.

لە سەردەمی هارونە ڕەشیددا یۆحەنا ئیبن مەساوییە کتێبە پزیشکییە کۆنەکانی وەرگێڕاوە، خەلیفەش هەموو ئەو کتێبانەی پێ سپاردووە کە مسوڵمانان لەکاتی فەتحەکانیاندا دەستیانکەوتووە، خاوەنی چەندین کتێبە لەوانە: کتێبی ژەهرەکان و کتێبی سەرئێشە. لە باسکردنی سەردەمی مەئمون. ماڵی حیکمەت کە قوتابخانەیەکی ڕۆشنبیری، زانستی، مەعرفی بووە و بەناوکی عەقڵانی دادەنرا خەلیفە مەئمون دایمەزراند، ئەمەش وایکردووە ببێتە ناوەندێک بۆ زانست و زانایان.

دیارترین وەرگێڕەکانی خەلافەت

ئیبن الندیم لە (الفهریست)دا ناوی وەرگێڕەکانی بەدرێژایی سەدەکان باس کردووە و بەناوبانگترینیان ئەمانەن:

١- حەنین بن ئیسحاق: یەکێکە لە وەرگێڕە بەناوبانگەکانی سەدەی سێیەمی کۆچی، عەرەبی بە ڕەچەڵەک مەسیحی، هاوچەرخی سەردەمەکانی مەئمون، موعتەسەم، ئەلوەسیق و موتەوەکیل، بە شارەزایی لە چەندین زمانی عەرەبی، سریانی، یۆنانی، فارسی ناسرابوو، حەز و ئارەزووی بۆ توراسی پزیشکی یۆنانی گەیشتە ئەو ئاستەی کە بەمەبەستی بەدەستهێنانی کتێب گەشتێکی بۆ وڵاتانی دیکە کرد.

هەربۆیە بەدەوری عێراق و شام و میسردا گەڕا و دواجار بە بارێکی پەردەدارەوە گەڕایەوە و تەنها نزیکەی نیوەی کتێبەکانی لە دیمەشق لەگەڵ خۆیدا بردەوە، حەوت کتێبی وەرگێڕا بۆ زمانی عەرەبی، لەوانە هیپۆکرات و هەموو بەرهەمە پزیشکییەکانی گالین گواستەوە بۆ سەر زمانی عەرەبی.

- بنەماڵەی بوختیشو: ئەوان لە سریانی و نەستوورییەکانن، یەکەمیان گۆرگیاس بن بوختیشو پزیشکی مەنصورە و کوڕەکەی بوختیشو بن گۆرگیاس شوێنی گرتەوە، ئەلڕەشید لە جوندیشاپور، دوای پشکنینەکەی بە سەرۆکایەتی پزیشکان دایمەزراند، دواتر کوڕەکەی بوختیشو بن جبریل شوێنی گرتەوە. جبریل بن عوبەیدڵڵا بن بەختیشو، جێنشینەکەی، عوبەیدڵلا بن جبریل.

- بنەماڵەی قوررە: ئەوان لە بەغدا زانستیان بە میرات گرتووە، بەناوبانگترینیان پابیت بن قوررە بووە، شارەزا بووە دەربارەی گەدە و بەردەکان کە لە میزڵداندا دروست دەبن، هەروەها دەربارەی ئەو نەخۆشیانەی کە لە جەستەدا دەردەکەوێت.

- قوستای کوڕی لوقا البعلباکی: بە ڕەچەڵەک یۆنانی بوو، یەکێک بوو لە وەرگێڕانی سەدەی سێیەمی کۆچی، شارەزای زمانی یۆنانی و سریانی و عەرەبی بوو، لە کاری وەرگێڕاندا زۆرباش بووە، لەگەڵ باشی دەربڕین و شێواز، هەروەها چاکسازی لە هەندێک لەو وەرگێڕانەدا کرد، کە لە سەردەمەکانی پێشوودا کرابوون. هەندێک کتێبی گالین و ئەرستۆی وەرگێڕا.

بەوپێیەی ژمارەی وەرگێڕەکان ١٠٠ کەسی تێپەڕاندووە، هەندێک خێزان تایبەتمەند بوون بە کاری وەرگێڕان و گواستنەوە، هەروەها قوتابخانەی تایبەتیان هەبووە بۆ فێرکردنی وەرگێڕان و ئەوەی وەریانگێڕاوە چۆن چاکی بکەنەوە. ئەمانە وەرگێڕە دیارەکانی ئەوکات بوون، کە لەلای دەوڵەت پشتیان پێ دەبەسترا، بە فەرمی بۆ کاری وەرگێڕان ڕاسپێردرابوون، بەڵام وەرگێڕانی دیکەش هەبوون، کە لە خوارەوە بەدرێژی باسی هەموویان دەکەین.

## گرنگترین کتێبە وەرگێڕدراوەکانی ئەو سەردەمە بۆ سەر زمانی عەرەبی

١- کتێبەکان کە لە زمانی یۆنانییەوە نووسراون: چەند کتێبێک لە پزیشکی یۆنانی هیپۆکراتیس وەرگێڕدراون، لەوانە کتێبی کنجکاوی، پێشکەوتنی زانین، نەخۆشییە توندەکان، پەتازانیی نوکتەکان، سروشتی مرۆڤ، پەیمانی هیپۆکراتیس. گوێڕایەڵی، پەلسی، چارەسەری نەخۆشییەکان، پێنج بابەتەکە، ستایلست، کتێبی میزاج، هێزە سروشتییەکان، نەخۆشییەکان، زانینی نەخۆشییە ڕازییەکان، ژێری بێتاوانی و چەندانی تر. زۆربەی ئەم کتێبانە لەلایەن حونەین کوڕی ئیسحاقەوە بۆ سەر زمانی عەرەبی گواستراوەتەوە.

٢- کتێبەکانی گواستراوە لە زمانی هیندییەوە: لەنێو ئەو کتێبە پزیشکییانەی کە لە سەردەمی عەباسییەکانەوە لە زمانی هیندییەوە وەرگێڕدراون و گواستراونەتەوە بۆ سەر زمانی عەرەبی، کتێبی سەسارد لە پزیشکیدا، کتێبی ناوی مادده هۆشبەرەکانی هیندستان، کتێبی ئیدانەکردنی تەواوی، کتێبی کورتەی هیندستان لەسەر مادده هۆشبەرەکان، کتێبی ڕۆزا ئەلهندییە لە چارەسەرکردن بۆ ژنان، کتێبی وەهم لە نەخۆشی و نەخۆشییەکان، کتێبی هیندستان لە ڕەگەزەکانی ژیان و ژەهرەکانیاندا.

## کاریگەری بزووتنەوەی وەرگێڕان لە پزیشکی ئیسلامیدا

ڕوونە لەم سەردەمەدا گرنگترین شت کە یارمەتی پێشخستنی پزیشکی ئیسلامی و گەشەسەندنی دا بزووتنەوەی وەرگێڕان بوو، کە ڕێگەی بە پزیشکانی مسووڵمانان دەدا بە پزیشکی یۆنانی و بەناوبانگترین پیاوەکانی ئاشنابن و ئەمەش پێش دامەزراندنی پزیشکی عەرەبی بوو، لە ژمارەیەک قوتابخانەی پزیشکی بەناوبانگی پەیمانگای جوندیشاپور و لە هیندستانەوە لە سەردەمی خەلیفە ئەبو جەعفەر مەنصورەوە ئەوەی بە چاودێریی و گرنگیدانی خەلیفەکانەوە وەریانگرت، کە هانی دەرکەوتنی پزیشکانی تری دەدا، کە زانستی پزیشکی خۆیان بڵاوکردەوە. جا چ زانست، چ بە فێرکردن، چ بە وەرگێڕان یان نووسین بێت، بۆئەوەی پزیشکی ئیسلامی توانای لەگەڵ بنەمای زانستییەکاندا خۆیان ڕاست بکەنەوە، کارەکانیان لەسەر بنەمایەکی زانستی تۆکمە بێت، کە دواتر لە هەریەک لە کەسایەتیی ئەلڕازی و ئیبن سینادا بەرجەستە بووە.

"ئیبن خەلدون لە زانستگەراکانی ئیسلامدا لە بواری زانست و پیشەسازییەدا لەپێشەنگەکان بوون، الرازی، المجوسی، ئیبن سینا، لە خەڵکی ئەندەلوسیشەوە ئیبن زەهرە لە بەناوبانگترینیان بوون".

ئەگەر بمانەوێت بزانین تا چەند بزووتنەوەی وەرگێڕان کاریگەری خۆی بەسەر

زانستی ئیسلامیی بەجێیهێشتووە، تەنیا دەبێت سەیری ئەو گۆڕانکارییە قووڵانە بکەین کە لە پزیشکی عەباسیدا ڕوویانداوە، کە هیچ پەیوەندییەکیان بە پزیشکی پێش ئیسلامەوە نەبووە. یان ئەوە بەراورد بکەین کە پزیشکەکان لە پێش ئیسلامدا چییان نووسیوە – هاوشان لەگەڵ ئەوەی کە لە سەردەمی عەباسیدا نووسراوە.

## سەردەمەکانی هاتنی پرۆسەی وەرگێڕان بۆ جیهانی ئیسلامی

هاتنی بزووتنەوەی وەرگێڕان بۆ جیهانی ئیسلامیی بۆ چەند قۆناغێکی جیدا دابەش دەبێت، بەپێی دابەشکارییەکە، نوێگەریی و زیادبوونی زانستەکان و داهێنانەکان، کە لەو سەردەمانە خراونەتەڕوو لە خوارەوە بەپێی قۆناغەکان باسی لێوە دەکەین.

- سەردەمی دەستکەوتی زانست (دووەمی کۆچی/ هەشتەمی زاینی).

ئەو سەردەمە ناسراوە بە سەردەمی گەیشتن بە زانست (دووەمی کۆچی/هەشتەمی زاییني) فەتحکردنی شارەکانی وەک ئەسکەندەرییە، حەڕان و جوندیشاپورە، دواتر چالاکییەکانی وەرگێڕانی سەرەتایی کە ئاماژەیەکی ڕوونن بۆ کاریگەریی زانست لەسەر مسوڵمانان لەم شارانەدا و لەم سەردەمەدا حەزێکی زۆر هەبووە بۆ قبوڵکردن و فێربوونی زانست لە هەر شوێنێکدا بووبێت، ئامانجیش بەدەستهێنانی زانست و وەرگێڕانی بوو بۆ زمانی عەرەبی، جیاوازی نەبووە لەوەی ئەو کەسەی زانستی نووسیوەتەوە، جا یۆنانی بووێت، یان هیندی یاخود ئێرانی. بەتایبەت پەیوەندی نێوان مسوڵمانان و نەتەوەکانی دیکە کە بە پەیوەندییە ئابووری بازرگانیی لە فەتحەکانەوە دەستیپێکرد، بە چالاکی وەرگێڕان گەیشتە ترۆپک، لەژێر کاریگەری چالاکییەکانی وەرگێڕان، مسوڵمانان سیستەمێکی نوێی فەرهەنگی و ئایدیۆلۆژییان لە مێژووی جیهاندا پەرەپێدا. لەنێو سەرچاوەکانی سیستەمی بیرۆکەکانی پێشنیازکراوی مسوڵمانان، لەپاڵ ئەدەبیی عەرەبی و ئیسلامی سەردەمی جاهیلی، وەرگێڕانەکان لە کولتوورە کۆنەکانەوە، بەتایبەت لە بوارەکانی فەلسەفە، لۆژیک، بیرکاری، فەلەکناسی، فیزیا، کیمیا، پزیشکی، ڕووەکناسی و ئاژەڵناسی، شوێنێکی گرنگی داگیرکردووە.

ئەگەر سەیری مێژووی کولتووری مرۆڤایەتی بکەین، بزووتنەوەیەکی بەرفراوانی وەرگێڕان دەستیپێکردووە. بۆ نموونە سیستەمی بیری یۆنانی کۆن بە وەرگێڕانەکانی سۆمەری – ئەنادۆڵی، فینیقی و میسری، سیستەمی فیکری ئیسلامی بە وەرگێڕانی یۆنانی و ئێرانی و هیندۆسی، لە دەرەوەی سەرچاوە زانستییەکانی خۆی سوودی بینیوە، سیستەمی بیری ڕۆژئاوا بە وەرگێڕانی ئیسلامی و جووڵەکانی بۆ یۆنان، وەرگێڕانەکان

گەشەی پێدراوە. بەواتایەکی تر سێ جۆر مەعریفە و بیرۆکە هەیە کە بە درێژایی مێژووی شارستانیەتی مرۆڤایەتی بڵاوبووەتەوە.

یەکەم: هاتنە ناوەوەی بیرۆکەی کۆنی میسری، میزۆپۆتامیا، هیندۆسی و ئێرانی بۆ ناو بیری یۆنانی (سەدەی پێنجەم و شەشەمی پێش زایین).

دووەم: هاتنە ناوەوەی بیرۆکەی یۆنانی و بیرۆکە کۆنەکانی تر بۆ ناو جیهانی عەرەبی و ئیسلامی (سەدەی ٨ و ١٠ز).

مسوڵمانان سەرەتا ئاشنا بوون بەو بەرهەمە زانستی و فەلسەفییانەی جیهانی کۆن کە لەسەر دەستی دراوسێ نوێیەکانیان ئاڵوگۆڕ دەکران. بێگومان ئەم بەرهەمانە لە ڕێگەی وەرگێڕانەوە ناسێنراون. چالاکییەکانی وەرگێڕان تا سەردەمی خەلیفەی عەباسی مەئمون زۆر کاریگەر نەبوون، تەنیا لە چەند هەوڵێکی تایبەت پێکهاتبوون. یەکەم کەس کە دەستی بەو چالاکییانە کرد، میراتگرێکی تەختی ئومەیی بوو، خالید بن یەزید بن المعاویە (٧٠٤/٨٥). خالید لەلایەن مەروان بن حەکەمەوە لەسەر تەختی پاشایەتی لابرا، دواتر خالید کە حەزی لە کیمیا و پزیشکی و فەلەکناسی دەبێت و لە ڕێگەی ستیفانۆس و مارانۆسەوە بەرهەمە یۆنانی و قیبتییەکانی وەرگێڕاوە بۆ زمانی عەرەبی کە لە بوارە جیاوازەکاندا نووسراون.

بزووتنەوەی وەرگێڕان، لە سەردەمی خەلیفە ئومەوییەکان مەروان بن حەکم (٦٤-٦٥ک/٦٨٤-٦٨٥ز) و عومەر بن عەبدولعەزیز (٩٩-١٠١ک/٧١٧-٦٨٥ز) لە بوارەکانی پزیشکیدا بەردەوام بوو. پزیشکی مەروان، ماسێرجیڤیچ، لە پزیشکانی ئەکادیمیای ئەسکەندەریە بوو، بەرهەمی پزیشکی ئەهرۆن (هارۆن/ هارون)ی بە ناوی «کونەش» (٧٢٠ز). وەرگێڕاوە بۆ سەر زمانی عەرەبی.

چالاکییەکانی وەرگێڕان کە لە سەردەمی ئومەویدا تەنیا لە بوارەکانی وەک پزیشکی و کیمیا و فەلەکناسیدا سنووردار بوون، وەلێ لە سەردەمی خەلیفە عەباسییەکان مەنسوور (١٣٦ک / ٧٤٣ز) دا فراوانتر بوون بۆ بوارەکانی وەک بیرکاری و لۆژیک و میتافیزیک (١٥٧ک /٧٥٤ز یان ١٥٨ ک/٧٧٥ز). لەنێو وەرگێڕانی فارسی بۆ عەرەبی، لەم سەردەمەدا، گەورەترین و دیارترین کەسایەتی عەبدوڵڵا بن المقافە (ابن المقافا)، بوو، کە بە ڕەچەڵەک فارسی بووە و یەکێک بووە لە نووسەرە کاریگەرەکانی ئەو سەردەمە. کتێبی بەناوبانگی «کەلیلە و دمنە»ی وەرگێڕاوە. هەروەها بهشێک لە کۆمەڵە بەرهەمەکانی ئەرستۆی پەیوەندیدار بە لۆژیک بەناوی «ئۆرگانۆن» و بەرهەمەکە بهناوی «ئیساگوجی» لەلایەن پۆرپیۆس وەگێڕاوەتە سەر زمانی عەرەبی.

هەر لە سەردەمی مەنسور کە لە مێژوودا بە بنەماڵەی وەزیر ناسراون، سریانی، هیندۆس، حەڕان و نەباتایی (ئارامی) لە ئەکادیمیای جوندیشاپور بەهەمان شێوە بەشداربوون لە چالاکییەکانی وەرگێڕان. چەندین سەدە لە زمانەکانی وەک یۆنانی، پەهلەوی، هیندی/سانسکریت، سریانی، نەباتایی ئارامییەکان /بابلی و قبتییەوە وەرگێڕانیان بۆ سەر زمانی عەرەبی کردووە. لەو ماوەیەدا زانایانی هیندستان بە هاوکاری زانایانی ئێرانی بەرهەمەکانی پەیوەندیدار بە بیرکاریی و فەلەکناسی لە زمانی سانسکریتەوە بۆ عەرەبی وەرگێڕا. لەنێو ئەم بەرهەمانەدا، سیددانتا کە بەرهەمێکی فەلەکناسیی بەرفراوانە، لەلایەن محمد بن ئیبراهیم الفزاری، یەکێک لە گەنجترین ڕیزبەندەکانی فەلەکناسی ساسانی لە ئیسلامدا، لە ساڵی ( ١٥٤/ک ٧٧١ ز. یان ١٥٦ک/ ٧٧٣ ز) لەژێر ناوی سند-هیند، بە ڕستەسازی بەتلیمۆس، یان ئەلیستی نووسراوە، بۆ زمانی عەرەبی وەرگێڕدراوە.

چالاکییەکی تری وەرگێڕان کە لەم ماوەیەدا ئەنجامدرا، ئەویش بانگهێشتی کورچیس ب.سیبریل ب. بوختیشۆ، بەڕێوەبەری قوتابخانەی پزیشکی جیندیشاپور بوو بۆئەوەی بێتە بەغدا و ببێتە پزیشک لە کۆشکی خەلیفە مەنصور و توانیویەتی بەرهەمەکانی بواری پزیشکی لە زمانی یۆنانی و فارسییەوە وەربگێڕێتە سەر زمانی عەرەبی. مەنصور کتێبخانەیەکی تایبەتی لە کۆشکەکەیدا بۆ بەرهەمە وەرگێڕدراوەکانی پەیوەست بە بوارە جیاوازەکان دروستکرد، ناوی ئەم کتێبخانەیە بەناوی (حزانة الشام) ناوناوە. لە بنەڕەتدا ناوەندی زانستی بەناوی «بیت الحسبة« لە ڕێگەی ئەم کتێبخانەیەوە دروستکراوە، کە لە بەغدا دامەزراوە.

## . سەردەمی سیستماتیزەکردن (سەدەی نۆیەم).

ئەمە قۆناغێکە کە چالاکییەکانی وەرگێڕان بەردەوامبوون و ئەو داتایانەی لە ئەنجامی چالاکی وەرگێڕان بەدەستهێنرابوون سیستماتیک دەکرێن، لەم قۆناغەدا مەبەست لە خزمەتکردنی کۆمەڵگە بە دروستکردنی زانستە نوێیەکان و بەکارهێنانیان دەخرێنەڕوو. لەم قۆناغەدا مەعریفە برەوی پێدرا و حاکم و زانایانی زانستی ئەو سەردەمە پێیانوابوو کە زانست هێزی چارەسەرکردنی هەموو کێشەکانی هەیە و هەندێک هەنگاوی باش لەو ئاڕاستەدا نرا، تاقیگەی زانستی بەرهەمی ئەم سەردەمەیە.

لە سەردەمی هارونە ڕەشید (١٧٠ک/ ٧٨٦ ز ـ ١٩٣ ک/ ٨٠٩ ز.)دا، بە شێوەیەکی بەرچاو چالاکییەکانی وەرگێڕان زیادی کرد، بەتایبەتی لە بواری پزیشکیدا. بەدیاریکراوی دوای داگیرکردنی ئەنقەرە و عەموریا، کتێبەکانی ئەم ناوچانە هێنرانە بەغدا و لەلایەن

لیژنەیەکەوە بە سەرۆکایەتی جۆن ماسیڤیچ وەرگێڕدرانە سەر زمانی عەرەبی. لە هەمان کاتدا ئەبو سەهلی کوڕی نەوابەختی ئێرانیش بە فەرمانی خەلیفە، نووسراوی سەدەکانی پێشوو لە فارسییەوە بۆ عەرەبی وەرگێڕاوە. ساڵانی کۆتایی هارونە ڕەشید و ساڵانی سەرەتای مەئمونی کوڕی، واتە پێنج ساڵی یەکەمی سەدەی نۆیەم، قۆناغێکە خاوەن تایبەتمەندی نوێیە، کە دەتوانرێت بەسەرەتای قۆناغی داهێنان دابنرێت لە ڕوانگەی گەشەسەندنی زانینەوە.

خەلیفەی عەباسی مەئمون (١٩٨-٢١٨ ک/٨١٣-٨٣٣ ز) قوتابخانەی «بيت الشام»ی دروستکرد کە بە گەورەترین ئەکادیمیای زانستی لە سەدەکانی ناوەڕاست دادەنرێت. لەو ماوەیەدا بەرهەمە زانستی و فەلسەفییەکانی سەر بە کولتووورە کۆنەکانی یۆنانی، هیندۆسی، فارسی و نەباتایی (ئارامیی) وەرگێڕدرانە سەر زمانی عەرەبی. لە ساڵی (٢١٥ ک/٨٣٠ ز) مەئمون بەتوندی شکستی بە هێزەکانی ئیمپراتۆریەتی بیزەنتی هێنا، چەندین بەرهەمی لە خاکە دەستبەسەرداگیراوەکانی بیزەنتی کۆکردەوە و لە کتێبخانەی کۆشکەکەی خۆیدا بەناوی (بەیتولحەکیم) داینا. هەروەها برە پارەیەکی زۆری بۆ فراوانکردنی کتێبخانەی ناو کۆشک تەرخانکرد بۆ زیادکردنی ژمارەی کتێبەکان، هەروەها مەئمون لیژنەیەکی نارد بۆ ناو دەوڵەتی بیزەنتی بەمەبەستی هێنانی کتێب، لیژنەکە پێکهاتبوو لە حەنین بن ئیسحاق الحراني، بەڕێوەبەری کتێبخانەی ناو کۆشکەکە و حەجاج بن یوسف بن مەتەر و ئیبنول بەتریق.

مەئمون کتێبخانەی پڕ کرد لە نامەی زانستی و کتێب، کە لە دەرەوەی دەوڵەتی عەباسییەوە هێنرابوون. بەپێی داتاکانی ئیبن نەدیم کە لێکۆڵینەوەی لەسەر (بەیتولحسوکتە) کردووە و کتێبخانەکەیان بەکارهێناوە، ژمارەی ئەو کەسانەی دەیانتوانی لە یۆنانییەوە وەربگێڕن بۆ سریانی، لە سریانییەوە بۆ عەرەبی یان ڕاستەوخۆ لە یۆنانییەوە بۆ عەرەبی ٤٧ کەس بوون، ژمارەی وەرگێڕاوان لە فارسییەوە بۆ عەرەبی ١٦ کەس بوو، ژمارەی ئەو کەسانەی ک بەرهەمەکانی سانسکریتیان بۆ عەرەبی وەردەگێڕاوە ٣ کەس بوون.

لە سەردەمی مەئموندا، دوای وەرگێڕان و کۆکردنەوە، لێکۆڵینەوەیان بۆ ڕوانگەی ئەو شوێنانە دەکرد کە زۆربەی چالاکییە زانستییەکانی تێدا ئەنجام دەدرا. مەئمون زۆر حەزی لە فەلەکناسی بوو، هەروەها ڕووگەناسیی لە ئەشکەوتی شەمماسیەی بەغدا و پاشان لە گردی قاسیون لە نزیک دیمەشق دروستکردووە، هەر لەبەر ئەم هۆکارەش مەئمون یەکەم کەس بووە لە مێژووی فەلەکناسیدا کە ڕووگەناسیی ڕاستەقینەی دروستکردووە. بە بەکارهێنانی ئامێرە پێشکەوتووەکان و بەردەوامبوون لە چاودێریکردنی تەنە

ئاسمانییەکان، ویستویەتی ئەنجامێکی وردتر بەدەستبهێنێت لەوەی کە لەلایەن کەسانی کۆنەوە حیسابیان بۆ کردووە. تەنانەت داتاکانی «Syntax-Algest-Mekisti»ی بەتلیمۆس و ئەو ئامێرانەی کە بۆ حیسابات لە بواری فەلەکناسیدا بەکارهێنراون، بەس نین بۆ ئەم ئەرکە. هەروەها خۆر و مانگ و هەندێک هەسارە بەدرێژایی ساڵ لە ڕووگەی کاسیون کە یەکێکە لەو دوو ڕوانگەیەی لەو کاتەدا دامەزرابوو، چاودێری کران. ئەم جۆرە تێبینییە تەنیا لە سەدەی ١٦ لە جیهانی ڕۆژئاوا دەستیپێکردووە.

مەئمون پارەیەکی زۆری بۆ کڕینی کتێب خەرج کرد. هەندێک جار بەقەد قورسایی بەرهەمە وەرگێڕدراوەکان زێڕ بە وەرگێڕان دەدرا. بەپێی ئەوەی لە سەرچاوەکاندا ئاماژەی پێکراوە، مەئمون ٣٠٠ هەزار دیناری خەرج کردووە تەنها بۆ ئەو بەرهەمانەی کە لە زمانی یۆنانییەوە وەرگێڕدراون. هەروەها دەگوترێت کە هەندێک بەرهەمی وەرگێڕدراو لەلایەکی تەرازوو و لەلایەکی ترەوە بە زێڕ کێش دەکران و وەرگێڕەکان بەم زێڕە پاداشتیان پێدەدرا.

لە ئەنجامی بەردەوامی چالاکییەکانی وەرگێڕان لە سەردەمی موعتەسەم (٢١٨-٢٢٧ک/٨٣٣-٨٤٢ز) و موتەوەکیل (٢٣٢-٢٤٧ک/٨٤٧-٨٦١ز) دوای مەئمون، فەلسەفە و لۆژیک و بیرکاری لە سەدەکانی دوای دامەزراندنی شاری بەغدا (١٤٤-١٤٩ک/٧٦٢-٧٦٦ز) زۆرێک لە بەرهەمەکانی بوارەکانی فەلەکناسی، فیزیا، کیمیا، پزیشکی، ڕووەکناسی و ئاژەڵناسی وەرگێڕدراونەتە سەر زمانی عەرەبی. لە بواری فەلسەفە و لۆژیکدا، کتێبی»ئۆرگانۆن» و کتێبی « نەفس»ی ئەرستۆ، «دەوڵەت- کتێبی «پۆلیتیک» و «یاساکان کتێبی ناڤامیس»ی ئەفلاتون وەرگێڕدراون. هەروەها بەرهەمی فەیلەسوفانی تری یۆنانی وەک تیۆفریستۆس و ئامۆنیۆس و هیرۆکلۆس وەرگێڕدراونەتە سەر زمانی عەرەبی. کتێبەکانی گالین سەبارەت بە فەلسەفە، کتێبی ئەلمیراکە، کتێبی ئەبجوب، کتێبی کۆماری ئەفلاتون لە بەرهەمە وەرگێڕدراوەکانی ئەم بوارانەدابوو.

هەروەها لە بوارەکانی بیرکاری، فەلەکناسی، فیزیا و کیمیادا، «ئەندازەیی میتۆدیی» ئەفلاتون، شرۆڤەی ئەرستۆ لەسەر «فیزیا»، «توخمەکان»ی ئیوکلید (ئەندازەیی میتۆدیک) و بەرهەمەکانی دیکە وەرگێڕدراون. کتێبی ئیوکلید، کە بناغەی ئەندازەیی لە جیهانی ئیسلامیدا پێکدەهێنێت. بەهەمان شێوە بەرهەمەکانی ئەرکیمیدس، سینتاکس/ئەڵگێست (المجستی)ی بەتلیمۆس، هایپێگێزی جوگرافی (جوگرافیا) و کتێبەکانی دیکە وەرگێڕانە سەر زمانی عەرەبی.

لە بواری پزیشکیدا، کتێبەکانی وەک: «ود بوقارات» «طبيات الرجل» «فصول»،

«تقديمات المعرفه»، «امبرازول حده»، «ئەحلات» و بەتايبەتی کتێبەکانی گالینۆس و پۆلۆمپۆی پەیوەست بە فەلەکناسی. جگە لەوەش زۆر بەرهەمی دیکەی حەکیم وەرگێڕدراونەتە سەر زمانی عەرەبی. هەروەها کتێبەکانی ڕۆژهەڵاتی ناوەڕاست لە زمانی هیندیی و فارسییەوە وەرگێڕدراونەتە سەر زمانی عەرەبی.

ئەو بەرهەمانەی کە بە زمانی یۆنانی و «نەباتیی» ئارامیی، لە بواری ڕووەکناسیدا نووسراون، وەرگێڕدراون بۆ سەر زمانی عەرەبی. «ڕووەک»ی ئەرستۆ، کتێبی»فیلاهاس»ی تیانالی ئەپۆلۆنیۆس، «اسباب النبات»ی تیۆفراستۆس، کتێبی «هاشاییش»ی دیۆسکۆریدس، «ئەلفیلاهەتور ڕومیە»ی دیمۆکریتس ئەو بەرهەمانەن کە وەرگێڕدراونەتە سەر زمانی عەرەبی.

لە بواری ئاژەڵناسیدا، «Historia Animalium» و «De Generatione Animalium» و «De Partibus Animalium»ی ئەرستۆ لەژێر ناوی «کتێبی ئاژەڵان»دا کۆکراونەتەوە و وەرگێڕدراون. بەرهەمێکی بەنرخ کە وەرگێڕدراوەتە سەر زمانی عەرەبی، کتێبی مەنافیل، کە دەگەڕێتەوە بۆ هیپۆکرات و هێرمێس و دیموکریتس.

هەندێک لەو کەس و خێزانانەی کە پشتیوانی دەوڵەت بۆ چالاکییەکانی وەرگێڕان وەردەگرن وەک وەرگێڕ ئەرکی گرنگ ئەنجام دەدەن. لەنێویاندا یوحەننا بن مەساوییە (٨٥٧/٢٤٣)، حونەین ئیسحاق بن (٨٧٣/٢٦٠)، حوبەیش بن حەسەن، منداڵەکانی موسا، سابیت بن قورە (کوڕ و نەوە)ی، بنەماڵەی بوختیشو، ئەبولسەهل بن نەوبەخت، حەجاج بن مەتەر، کیندی (٨٦٦/٢٥٢) و قوستا بن لۆقا (٩١٢/٣٠٠).

**. قۆناغی سێیەمی داهێنانی زانستی (سەدەی ٣-٥ك/٩-١١ز)**

ئەم قۆناغە بە قۆناغی داهێنان لە بواری زانست ناودەبرێت، هەندێک زانا کە لەو ماوەیەدا زۆر دیاربوون، دواتر لەلایەن جیهانی ئەوروپییەوە بەسەرچاوەی مەعریفە و زانست ناسران، لەو بوارانەی کە سەرقاڵی بوون، لەسەر بنەمای تێگەیشتن لە ئاستی زانستی ئەو قۆناغە و پێگەیشتنەکەنیان جێگەی سەرنج بوون. لەم ماوەیەدا لەلایەک چالاکییەکانی وەرگێڕان بەخێرایی بەردەوامی هەبوو (لە سەدەی هەشتەم- ١٠)، لەلایەکی دیکەشەوە لێکۆڵینەوەکان سیمای پرەنسیپ و میتۆد و چەمکی هەبوو.

لە سەدەکانی ناوەڕاستدا مسوڵمانان گرنگییەکی تایبەتیان بە زانستی فەلەکناسی دەدا بەناوی «زانستی زیندەوەرزانی»، «زانستی گەردوون» و «زانستی ئەستێرەکان». هۆکاری ئەوەی مسوڵمانان زۆر گرنگییان بەم بوارە دابوو، ئەو باوەڕە بوو کە فەلەکناسی

دەتوانێت بەشێوەیەکی دروست زانیاری پێویست بۆ ژیانی ئایینی و کۆمەڵایەتی دابین بکات. بۆ نموونە دەتوانرا داتای فەلەکی بۆ دیاریکردنی قیبلە و کاتی نوێژکردن و دیاریکردنی ئاراستەکان لە ڕێگەی وشکانی و دەریاوە و دیاریکردنی سەرەتای مانگی ڕەمەزان و دیاریکردنی کاتی پێشکەوتنی کشتوکاڵی بەکاربهێنرێت.

زانایانی مسوڵمان بوون کە فەلەکناسییان بەرەو ئاستێکی تری زانستی برد کە لەسەر بنەمای چاودێری و لێکۆڵینەوە بێت. زانایانی مسوڵمان جگە لە داهێنانی شێوازی نوێ بۆ چاودێریکردنی تەنە ئاسمانییەکان، ئامێری پێشکەوتوویان پەرەپێدا و ڕووگە و ئامێری باشیان دروستکرد.

## زانا دیارەکانی ئیسلام و ڕۆڵ و کاریگەریان لە بوارەکانی وەرگێراندا:

### یەکەم/ زانایانی فەلەکناسی ئیسلامی

یەکێک لە کەسایەتییە دیارەکانی بواری فەلەکناسی لە مێژووی ئیسلامیدا، ئەلفەزاری (١٩٠ک/٨٠٦ز مردووە) بوو، یەکەم کەسە کە لە زانستی فەلەکناسی ئوسترولابی دروستکردووە. فەزاری لە ساڵی ١٥٤ک/٧٧١ز یان ١٥٦ک/٧٧٣ز دا لەسەر بەرهەماکانی زانای هیندۆسی براهماگوپتا سیددانتای بەشێوەیەکی فراوانتر کاری وەرگێڕانی کرد. ئەم بەرهەمەی کە هێڵکاری فەلەکناسیی هەسارەکان لەخۆدەگرێت و ناوی ئوسترولاب لەڕووی زاراوەیی ڕەچەڵەکی «سند-هیندی»ی هەیە، ڕۆڵێکی گرنگی هەبووە لە پەرەپێدانی زانستی فەلەکناسی و لە ڕۆژهەڵاتی جیهانی ئیسلامی تا سەدەی ١٠ و لە ئەندەلوس تا سەدەی ١٢ درێژەی هەبوو. هەروەها کتێبی «الزیج علی سنی العرب»ی فەزاری کە داتای فەلەکیی تێکڕای جوڵەی هەسارەکان لەخۆدەگرێت، داتا و شێوازەکانی پەیوەست بە حیسابکردنی خشتەی فەلەکناسی کە بۆ حیسابکردنی ڕۆژە ئاینییەکان بە پشتبەستن بە ساڵنامەی مانگ بەکاردەهێنرێن، دیاریکردنی پێشبینییەکان دەخاتە ڕوو، ئەستڕۆلابەکان نەتەوە جۆراوجۆرەکان بەکارهێنانهێناوە، بەرهەمی پەیوەندیدار بە ساڵنامەی گەلانەوە هەیە.

فەرغان (٢٤٧ک/٨٦١ز مردووە)، یەکێک لە زانایانی فەلەکناسی و بیرکارە کاریگەرەکانی خەلیفەکانی عەباسی، لەوانە مەئمون، موعتەسەم، وەسیق و موتەوەکیل. بەرهەمێکی پەیوەست بە فەلەکناسی بەناوی کتێبی ئەستێرەکانی زانست و جووڵەی ئاسمانی. «جوامع علم النجوم وأصول الحركات السماويه:» نووسیوە « و «Syntax/Algest/ ی بەتلیمۆس جگەلەوەی کورتەیەک لە ئەلمەجیستییە، هەروەها گرنگە بۆ زانیارییەکانی لەسەر ساڵنامە و ڕۆژەکان و ناڕەزایەتییەکەی بەرامبەر بە بەتلیمۆس. جوامع کە بە لاتینی بە (Elementa Astronomica) کورتکراوەتەوە، یەکێک بووە لە کاریگەرترین

بەرهەمەکان کە لەلایەن فەلەکناسە مسوڵمانەکانەوە زۆرترین کاریگەری لەسەر ڕۆژئاوا داناوە، هەروەها تا کۆتایی سەدەی پازدەهەم زۆرترین ڕاوێژکاری لە بواری فەلەکناسیدا بووە. کارەکە بریتییە لە ساڵنامەی ڕۆمانی، سوری، میسری، ئێرانی و عەرەبی، پێگە و جووڵەی زەوی لە هەسارەکانی دەرەوە، تەختەی سەرهەڵدان، ناوچە و شارە گرنگەکان، قەبارەی زەوی، پێگە و جووڵەی مانگ، خۆر، هەسارەکان و تەنە ئاسمانییەکان، شوێنی مانگ و ئەستێرەکان، چەندین بابەت دەخرێنە ڕوو، وەک ڕووی مانگ و مانگگیران و خۆرگیران. هەروەها فەرغانی کتێبێکی هەیە بەناوی «رسالە فی الاسطرلاب» کە باس لە ئەندازەیی و حیساباتی تەنە ئاسمانییەکان و سەرووتر و تیۆرییە بیرکارییەکان و چەندین بەرهەمی دیکە دەکات.

أبو عبدالله محمد بن جابر بن سينان البتاني الحراني (٣١٧ک/٩٢٩ز) کە بە دەسەڵاتدارترین فەلەکناسی مسوڵمان دادەنرێت و لە ڕۆژئاوا بە ئەلباتانیۆس، ئەلباتێگونوس یان ئەلباتێگنی ناسراوە، پێگەیەکی تایبەتی هەیە لە بواری فەلەکناسیدا. بیتانی لە بوارەکانی ئەندازەیی و ئەستێرەناسی زانایەکی ناسراوە. جگە لە فەلەکناسی تیۆریی و پراکتیکی، لەگەڵ کێشانی خشتە سەبارەت بە جوڵەی مانگ و خۆر، پێداچوونەوەی بە داتاکانی «سینتاکس/ئەلجەست/ ئەلمەجیستی»ی بەتلیمۆسدا کردووە. کارەکەی لەڕووی ناوەڕۆکەوە دەوڵەمەندتر کرد. ئەو لە بەرهەمەکەیدا بەناوی «کتێبی زیج» باس ئەنجامە زانستییەکان و داهێنانەکانی بواری فەلەکناسی دەکات. لەم بەرهەمەدا تیشک دەخاتە سەر جوڵەی پێنج هەسارەکە و حیساباتی فەلەکییان. کارەکەی بیتانی کە مامناوەندی جوڵەی مانگی بە درێژایی میریدانی دیاری کرد، هەروەها تیرەی خۆر و مانگ پێوانە دەکرد. کاریگەرییەکی زۆری لەسەر پەرەسەندنی فەلەکناسی و سێگۆشەی هەسارەکان هەبوو، ئەم بەرهەمە لەلایەن ڕۆبێرتۆس ڕێتینێنسیس وەرگێڕدراوە بۆ سەر زمانی لاتینی، لە سەدەی دوازدەهەمدا لە ڕۆژئاوا سێ سەدە دوای ئەو لەسەری نووسراوە. هەرچەندە وەرگێڕانی یەکەمی بەرهەمەکە لەدەستچووە، بەڵام وەرگێڕانی ڕێتینێنسیس بۆ یەکەمجار لە ساڵی ١٥٣٧ز لە شاری نورنبێرگ و ساڵی ١٦٤٥ ز لە پۆلۆنیا چاپکراوە و کاریگەرییەکەی تا ناوەڕاستی سەدەی ١٧ بەردەوام بووە.

برونی (٤٥٣ک/١٠٦١ز مردووە)، محمد بن محمد بن حسن اليحصبي البروني التلمساني کە بەرهەمی گرنگی لە زۆر بواردا بەرهەمهێناوە، لەوانە پزیشکی، فیزیا، بیرکاری، مێژوو، مێژووی ئایینەکان و جوگرافیا، بەڵام لە بواری فەلەکناسیدا لە هەموویان بەرچاوتر بووە، کە بەرهەمێکی بنەڕەتییە بووە بۆ نووسینەکانی کە بەشێوەیەکی سیستماتیکی وەسفی

قۆناغەکانی پێشووتر و گەشەکردنی بواری زانستیی و  مەعریفە تا سەردەمی خۆی دەکات. دواتر بەرهەمێکی تری نووسی، کە شێوەی ئینسایکلۆپیدیای فەلەکیی وەرگرت. هەروەها برۆنی ئەو زانایەیە کە جوگرافیای بیرکاری وەک دیسیپلینێکی سەربەخۆ دامەزراندووە. ئەو کتێبەی کە لەم بوارەدا نووسیویەتی و تا ئەمرۆش ماوەتەوە، بەرهەمی سەرەکی ئەم زانستەیە.

**دووەم: بیرکاریناسانی ئیسلامی**

یەکێک لەو زانستانەی کە مسوڵمانان لە ساڵانی سەرەتای کۆچییەوە گرنگەیان پێداوە و بەتەنگییەوە بوون، زانستی بیرکارییە، زانستی بیرکاری و دیسپلینەکانی بیرکاریی، بۆ مسووڵمانان هەمیشە پێویست بوون لە بابەتەکانی وەک دیاریکردنی ئاڕاستەی قیبلە، دیاریکردنی کاتەکانی نوێژ، دابەشکردنی میرات. جگە لەوەی کە لە سەردەمی جاهیلییەت و تەنانەت سەردەمی پێغەمبەردا هیچ زانیاریی و چالاکیەکی پەیوەست بە بیرکاری بەمانای زانستی نەبووە، کۆمەڵێک بیرکاری ئێرانی لە سەردەمی عومەری کوڕی خەتاب و لەسەر پێشنیازی حەزرەتی عەلی هاتنە مەدینە، خەلیفە داوای لێکردن کە هەندێک هاوەڵان فێری «چۆنیەتی حیساب» بکەن.  مسوڵمانان دەستیان کرد بە لێکۆڵینەوە لە مێژووی بیرکاری کۆنی هیندۆسی و یۆنانی و وەرگێڕانی کتێب بۆ زمانی عەرەبی کە ڕەنگدانەوەی دەستکەوتە زانستییەکانی ئەو گەلانە بوون لە بواری بیرکاریدا، ئەمەش بە تێپەڕبوونی کات ئارەزووی مسوڵمانان بۆ بیرکاری بەهێزتر کرد.

ماتماتیکزانی ناودار ئەبو عەبدوڵڵا محەمەد کوڕی موسا الخوارزمی بیرکار و فەلەکناسی و جوگرافیناسێکی مسوڵمانە. نازناوی ئەبو جەعفەری لێنراوە. (٢٣٢ک/٨٤٧ز مردووە) کە لە جیهانی ئیسلامیدا بە دامەزرێنەری جەبر دادەنرێت و ناوەکەی لە سەرچاوە لاتینیەکانیشدا بە ئەلکاریسمی یان ئەلگۆریتم هاتووە. لە بواری بیرکاریدا پێگەیەکی گرنگی هەبووە. خوارزمی جگە لە بیرکاری، فەلەکناسی و جوگرافیاشی خوێندووە، هەرچەندە لە خوارەزم لەدایکبووە، بەڵام لە بەغدا ژیاوە. ئەو بەرهەمانەی کە نووسیویەتی تا ئەمرۆش ماونەتەوە و لە سەردەمی عەباسیدا پێشکەشی مەئمونی کردووە. کتێبەکەی (الکتاب المختصر فی حساب الجبر والمقابلة) بەشێوەیەکی زۆر سیستماتیک نووسراوە و یەکەم بەرهەمی بیرکاری بوو کە جەبری لەخۆگرتبوو.

زانستی جەبر کە لە ڕێگەی ئەم کارەوە پێگەیەکی تایبەتی لە مێژووی مەعریفەدا بەدەستهێناوە، بەشێوەیەکی سەربەخۆ لە حیسابات پێی دەوترێت زانستی جەبر. دواتر زانایانی مسوڵمان بە بەکارهێنانی ئەم کتێبە، کتێبیان دەنووسی. هەروەها لە سەدەی

دوازدەهەمدا کتێبەکەی وەرگێڕدراوە بۆ سەر زمانی لاتینی، ئەم کارە لە قوتابخانەکاندا وەک کتێبی بیرکاری لە ڕۆژئاوا تا سەدەی ١٦ دەوترایەوە. خوارەزمی لە بەرهەمەکانیدا چارەسەری هاوکێشەی یەکەم و دووەم بەشێوەیەکی سیستماتیک دەخاتە ڕوو. تا ٧٠٠ ساڵ دواتر فۆرمولێک بۆ حیسابکردنی ڕەگی هاوکێشە چوارگۆشەکان هاتە ئاراوە. بۆ یەکەمجار خوارەزمی جەبری وەک بنەما بۆ جێبەجێکاری فەرمانی شەریعەتی ئیسلامی بەکارهێنا لە بواری میرات و هاوکێشە حسابییەکانی دیکەی پەیوەست بە شەریعەتی ئیسلامی کە بۆ چارەسەری کێشەکانی تاکەکان بەکاردێت. هەروەها ژمارەکانی هیندۆسی و سیستمی ژمارە دەهەمییەکان بە بەرهەمێک بەناوی «کیتاب الهندوسی» لەلایەن ئەلخوارەزمییەوە هاتنە ناو جیهانی ئیسلامییەوە کە لە سەدەی ١٢دا وەرگێڕدرایە سەر زمانی لاتینی.

زانایەکی تری کاریگەر لە بواری بیرکاریدا، ئەبولوەفا بوزجانی ئەبو الوەفا محمد بن محمد بن یەحیا بن ئیسماعیل بن العباس البوزجانی (٣٨٨ک/٩٩٨ز مردووە) بوو. بوزجانی کە بە دامەزرێنەری زانستی سێگۆشەیی دادەنرێت، وەک کاریگەرترین زانای مسوڵمان لە بواری بیرکاریی و ئەندازەیی و فەلەکناسی دادەنرێت و بەنازناوی «ئەندازیار» و «ژمێریار» ناسراوە. بوزجانی کە لە شاری بوزجانی لەدایکبووە کە دەکەوێتە نێوان شارەکانی هەرات و نیشابوور لە ناوچەی خۆراسان، دوای ئەوەی لە دوو مامەکەیەوە زانستە سەرەکییەکانی بواری بیرکاری فێربووە، بۆ خوێندنی زانست لای زانایە بەناوبانگەکانی ئەو سەردەمە، چووەتە بەغدا. لە بەرهەمەکانیدا یەکەم بەڵگەکانی تیۆرمی سێگۆشەیی وەسف کردووە، تەسکی بەناوی «زیل» و سێکانتەکەی بەناوی «قوتری زیل» پێناسە کردووە، هەروەها خشتەی هەستیاری بۆ کارکردی دابەشکردنی فەنکشنەکانی سێگۆشەیی بە هەنگاوی ١٥ خولەکی پەرەپێداوە لە کێشە فرە ڕووییەکان دەکۆڵێتەوە، لەوانە گۆشەی سێگۆشە و شەشگۆشە.

**سێیەم: پزیشکانی ئیسلامی**

لە مێژووی زانستی ئیسلامیدا، پزیشکی یەکێکە لە زانستە پێشکەوتووەکان کە سەرنجی زۆری لای مسوڵمانانی بۆ لای خۆی دەوروژاند. نموونەیەکی تایبەتی ئەمە چارەسەرکردنی ئەو برینانەیە کە لە کاتی شەڕی فتوحات و شەڕی نێوان هۆزەکاندا تووشی دەبوون، ئەمە جگە لە نەخۆشییەکانی هاوشێوەی هەوکردنی چاو و کۆکە، هەرچەندە هەندێک ئامێری پزیشکی لە پزیشکانی یۆنانی قەرزکراوە وەک کۆتەڕی لەلایەن مسووڵمانەکانەوە بەکارهێنران، بەڵام شێوازەکانی چارەسەکردنی ئەو سەردەم

زۆر سادە و ساکار بوون.

عەلی بن ڕەبان بن سەهل ئەلئەزدی (٢٤٧ک/٨٦١ز مردووە) یەکێکە لە یەکەمینەکانی نووسەرانی ئەم بوارە. هەروەک «فردوس الحسنات»ی لە ساڵی ٨٥٠ لەژێر ناوی خەلیفە موتەوەکیل نووسیوە، کە کۆنترین بەرهەمی عەرەبی کۆن لە بواری پزیشکی و دەرمانسازیدا نووسراوە. ئەم بەرهەمە کە ماددەی پزیشکی هیندۆسی، ئێرانی، یۆنانی و عەرەبی تێدایە، تایبەتمەندی ئەوەی هەیە کە سەرچاوەیەک بووە بۆ زۆرێک لە پزیشکان و مێژوونووسان، وەک ئیبن سینا، ڕازی و برونی.

ئەبوبەکر ڕازی ئەبوبەکر محمد بن یەحیا بن زەکەریا الرازی (٣١٣ک/٩٢٥ز مردووە)، یەکێک بووە لە نوێنەرە تایبەتەکانی بواری پزیشکی لە مێژووی زانستی ئیسلامدا و لە ڕۆژئاوا بە ڕەزاس ناودەبرێت، هەروەها یەکێکە لەو کەسایەتییە گرنگانەی کە پزیشکی لەنێوا مسوڵمانان پەرە پێ داوە. دوای هیپۆکرات و گالین، بەهۆی دابەشکاری لە بواری پزیشکیدا، نازناوی «گالینی عەرەب»ی پێدەبەخشرێت، نزیکەی ٦٥ یان ١٠٠ بەرهەمی پزیشکیدا هەیە، بەتایبەتی لە بەرهەمی ناوی «الحاوی فی الطب». (عەلی جمیل کبیر) کە بە ئینسایکلۆپیدیای پزیشکی دادەنرێت. بەرهەمی «لیبەر کۆنتینیس» دەڵێت (ڕازی ڕەخنە لە گالێن دەگرێت و کتێبێک بەناوی «کتێبی شوق» دەنووسێت. بەرهەمی «لیبەر کۆنتینیس» (١٢٧٩ز) لە ژێر ناوی لیبەر کۆنتینێنس لە سەلیم (فاراگوت)ەوە وەرگێڕدراوە بۆ سەر زمانی لاتینی و پێنج جار لە نێوان ساڵانی ١٤٤٨ز - ١٥٤٢ ز، چاپ کراوە. ڕازی کە بە یەکەم پزیشک دادەنرێت بە شێوەیەکی دروست نەخۆشییەکانی وەک تای سوور دەستنیشان بکات، بەرهەمێکی لەم بوارەدا نووسیوە بەناوی «الجدری والحسبة» کە وەرگێڕدراوەتە سەر زمانی لاتینی و لە نێوان ساڵانی ١٤٩٨ ز- ١٨٦٦ ز چل جار چاپ کراوە. ڕازی لە بەرهەمەکەیدا بە ناوی «أخلاق الطبیب» ئەو یاسا و بنەمایانە باس دەکات کە پێویستە لە پەیوەندی نەخۆش و پزیشکدا ڕەچاو بکرێن.

ئیبن سینا ئەبو عەلی ئەلحسێن بن عەبدوڵلا بن ئەلحسن بن عەلی بن سینا البلخی (٤٢٨ک/١٠٣٧ز)، بەتایبەتترین پزیشکی سەدەکانی ناوەڕاست و گەورەترین فەیلەسوفی قوتابخانەی پزیشکی ئیسلامی، وەک پزیشکێکی دەسەڵاتدار لە مێژووی پزیشکیدا چ لە جیهانی ئیسلامی و چ لە ڕۆژئاوا ناسراوە. ژمارەی ئەو بەرهەمانەی کە ئیبن سینا نووسیویەتی و پەیوەندییان بە پزیشکییەوە هەیە، نزیکەی ٤٠ بەرهەمە، کە گرنگترینیان بریتین لە «أرجوزه فی التشریح»، «أرجوزه المجربات فی الطب»، « القانون فی الطب». ئیبن سینا بە نووسینەکانی کاریگەری زۆری لەسەر

پزیشکی ئیسلامی و ئەورووپی هەبوو. بەشێوەیەکی بەرفراوان دان بەوەدا دەنرێت کە کاریگەرییەکەی لە ڕۆژئاوا تا سەدەی ١٧ بەردەوام بووە و ناوبانگی پزیشکە کۆنەکانی یۆنانی هیپۆکرات و گالین تێپەڕاندووە. تەنانەت چەند سەدەیەک دوای مردنی، بەرهەمە بەناوبانگەکەی بە ناوی (القانون فی الطب) بوو بە «کانۆن» لە ئیسپانیا.کانۆن) وەرگێڕدراوە بۆ زمانی لاتینی و وەک کتێبی دەرسی لە فاکەڵتییە پزیشکییەکانی زانکۆکانی ئەوروپا لە سەدەی ١٣ و دامەزراندنی کورسییەکی سینا/ئەڤیسێنا ئیبن لە زانکۆی ڤایادۆلید لە سەدەی ١٧دا دەوترایەوە. بەرهەمەکانی زانیارییەکی زۆر لەسەر بوارە سەرەکییەکانی پزیشکی وەک ئەناتۆمی، فیزیۆلۆژی، بافتزانی، دەرماننناسی و بایۆکیمیا دەخەنە ڕوو. بۆ دەستنیشانکردنی نەخۆشییەکان ڕێگاکانی وەک پشکنینی خوێن و پشکنینی میز بەکاردەهێنێت. ئیبن سینا لە بەرهەمەکەیدا بەناوی (القانون فی الطب) بەشێوەیەکی سیستماتیک سەرچاوە پزیشکییە پەرشوبڵاوەکانی هێلینیستی و بیزەنتین و سریانی سەردەمی خۆی ڕێکدەخات و شیکاریان دەکات.

کەحەلی شرف الدين علی بن عيسى بن علی الموصلی ناسراوە بە ئەلکەحال (٤٣٠ک/١٠٣٩ز مردووە)، لە ڕۆژئاوا بە عیسا حالی (عیسا هالی) ناسراوە، یەکێکە لە پزیشکە پێشەنگەکانی جیهانی ئیسلامی لە سەدەکانی ناوەڕاستدا، بە توێژینەوەکانی لە بواری چاودا بەناوبانگە. زانراوە عەلی بن عیسا ئەلکەحال لە بەغدا زانستی خوێندووە و لەوێ پزیشکی کردووە. تذكرة الكحالين کە کورتکراوەی تەزکیرا یە، گشتگیرترین و تەمەن درێژترین بەرهەمی عەرەبییە لەسەر بواری چاو. نەشتەرگەری چاو کە یەکێکە نەشتەرگەرییە ئاڵۆزەکان بەهاوکاری دەرمانی بێهۆشکەری گشتی وەک ماندراک و هەڵمی تلیاک ئەجامدراوە. «تذكرة الكحالين» کە یەکێکە لە کتێبەکانی تایبەتمەندی ئەم کارە لە سەدەی ١١دا نووسراوە، تەنانەت لە قۆناغەکانی دواتریشدا کاریگەریی خۆی لەدەست نەداوە و چەندین تەفسیر لەسەر ئەم بەرهەمە نووسراوە. هەروەها بەرهەمەکە لە سەدەکانی ناوەڕاستدا وەرگێڕدراوە بۆ زمانی عیبریی و دووجار بە ناوی «Tractus de oculis Jesu b.» وەرگێڕدراوە بۆ زمانی لاتینی لەژێر ناوی هالی. هەروەها ئەم بەرهەمە لە سەرەتای سەدەی بیستەمدا وەرگێڕدرایەوە سەر زمانی عیبری بەم شێوەیە: "Epistola Ihesu filii Haly de cognitione infirmitatum oculorum sive memoriale oculariorum quod compilavit Ali b. عیسا" (پاریس، ١٩٠٣).

**چوارەم: زانایانی کیماناسی ئیسلامی**

یەکێک لەو بوارانەی زانست کە مسوڵمانان سەرنجیان لەسەری بوو، زانستی کیمیا بوو. تەنانەت ئەگەر بڵێین بناغەی کیمیای مۆدێرن بە کولتووری ئیسلامی بنیاتنراوە زیادەڕەوی نابێت، خالید بن یەزید لە ئەسکەندەرییە زانستی خوێندووە و لە ڕەبەنێکی ڕۆمانی بەناوی ماریانۆس فێری پزیشکی و کیمیازانی بووە، کە یەکێک بووە لە کیمیاگەرە پێشەنگەکانی سەردەمی خۆی. دواتر بەرهەمەکانی لەم بوارەدا وەرگێڕاونەتە سەر زمانی عەرەبی، یەکەم مەشخەڵی لە بواری زانستی سروشتی لە جیهانی ئیسلامیدا داگیرساند. داوا لە ڕەبەنێکی وەک ماریناس دەکات، کە کتێبێکی کیمیا وەربگێڕێتە سەر زمانی عەرەبی.

جابیر بن حەیان بن عەبدوڵڵا الکوفی ئەلئەزدی (٢٠٠ک/٨١٥ز مردووە)، فەیلەسوف و پۆلیماتێکی سروشتی، بە دەسەڵاتدارترین کەس دادەنرێت لە بواری کیمیا لە جیهانی ئیسلامیدا. جابر کە پێگەیەکی گرنگی هەیە لە مێژووی کیمیادا، کیمیا دەگەیەنێتە پێگەی زانستێکی تاقیکاری سیستماتیکی. لای زانایانی ڕۆژئاوا، جابیر بن حەیان کە بە زمانی لاتینی بە گابر ناسراوە، شارەزایی بە هەمان دەسەڵاتی مێژووی کیمیا دادەنێن کە زانایانی مۆدێرن کاریان لەسەر کردووە. ئەو زانایە بۆ یەکەمجار ترشی سۆدیۆمی دۆزییەوە و تیۆری «سیڤا- گۆگرد»ی پێشنیاز کرد کە یەکێکە لە تیۆرییە سەرەکییەکانی کیمیای مۆدێرن. بەشێک لە بەرهەمەکانی جابیر بن حەیان لەلایەن ڕۆبەرت چێستەرەوە وەرگێڕدراون بۆ سەر زمانی لاتینی. بەرهەمەکەی بەناوی کتاب «الرسائل السبعين» و پێکهاتووە لە ٧٠ ڕیسالە، لەلایەن کرێمێنۆلۆ جیراردەوە لەژێر ناوی «Liber divinitatis de LXX» وەرگێڕدراوە.

**پێنجەم: زانا فیزیازانەکانی ئیسلامی**

لە جیهانی ئیسلامیدا توێژینەوەکردن لە بواری فیزیادا لە چوارچێوەی فەلسەفەی سروشتیدا دەستیپێکرد، سروشتی لێکۆڵینەوە لەم بوارەدا زیاتر لە چوارچێوەی ڕوانگەی ئەرستۆدا ئەنجامدراوە. مسوڵمانان زیاتر سەرنجیان لەسەر بواری میکانیکی (فیزیای تەنە جوڵاو و وەستاوەکان) و بینایی (زانستی ڕووناکی)ی فیزیا بوو کە بە ئیلمولمەنازیر ناسراوە.

ئیبن الهیثم ئەبو عەلی حەسەنی کوڕی حەسەنی کوڕی هەیثم البسری (٤٣٢ک/١٠٤٠ز مردووە) کاریگەرترین فیزیازان بوو لە سەدەکانی ناوەڕاستدا، کە بە بەشدارییەکانی ڕۆڵی لە پەرەپێدانی زانستی هەبووە. جگە لە فیزیا، ئیبن الهیثم لێکۆڵینەوەی قووڵی لە بوارەکانی وەک بیرکاری، فەلەکناسی و فەلسەفەدا کردووە، تەنانەت الهیثم، وەک یەکێک لە زانا کاریگەرەکانی مێژووی فیزیای بینایی تا سەدەی ١٧ دادەنرا. کارێکی گرنگ

لەم بوارەدا بەرهەمەکەیەتی بەناوی (دیدگای بەهەشت) کە لە کۆتایی سەدەی ١٢ یان سەرەتای سەدەی ١٣ لە لایەن زانایانی ئەوروپی وەک جۆن پیچام، رۆجەر بیکۆن، ڤیتیلۆس، یۆهانس کێپلەر، سنێل ڤان رۆگن، پییێر دی، بۆ سەر زمانی لاتینی وەرگێڕدراوە.

الهیثم لەو بەرهەمەدا بانگەشەی ئەوە دەکات کە ئەو ڕووناکییەی بۆ بینین بەسوودە لە چاوەوە نایەت، بەڵکو لەو شتەوە دێت کە دەبینرێت و بەم شێوەیەش کردەی بینین بەدی دێت. هەروەها پێش ئەوەی زانایانی ڕۆژئاوا وا بیربکەنەوە کە ڕووناکی بە ئاڕاستەیەکی ڕاستدا دەڕوات، بۆ سەلماندنی ئەمە ڕۆژئاواییەکان بە ««Camera Obscure camera obscure)) ناویان ناوە ژووری تاریک یان تاقیکردنەوەی کامێرای تاریک. ئەو ژوورە تاریکەی کە تاقیکردنەوەکانی تێدا ئەنجام دەدرا، دەبێتە هۆی پەرەپێدانی هەندێک ئامێری بینایی دوای چەند سەدەیەک، بەتایبەت ئامێری فۆتۆگرافی و فیلم.

## پوختەیی کۆتایی:

فەتحەکانی سەرەتای ئیسلامی ڕۆڵێکی گرنگی هەبوو لە فراوانبوونی جوگرافیا کولتوورییەکانی مسوڵمانان و سەرهەڵدانی بیرکردنەوە لە جیهانی ئیسلامیدا پەرەی سەند، لە سەدەی هەشتەم چالاکی چڕ و پڕی وەرگێڕان دەگاتە لوتکە.

مسوڵمانان زیاتر لە پەیوەندییەکانیان لەگەڵ کولتوورە بیانییەکان ئەزموونی زانستی لایەنی بەرامبەریان بەکارهێناوە. بەتایبەت دوای فەتحکردنی شارەکانی وەک ئەسکەندەرییە، حەڕان و جوندیشاپور، وەرچەرخانێکی گرنگ بوو بۆ مسوڵمانان کە لەڕێگەی وەرگێڕانەوە ئاشنای بوارەکانی پزیشکی، فەلسەفە، فەلەکناسی، بیرکاریی و کیمیا بن. لە سەدەی نۆیەمدا کە سەردەمی سیستماتیزەکردنی داتای زانستی بوو، مسوڵمانان توانیان ئەو زانست و ئەزموونە زانستییانەی لە ڕێگەی وەرگێڕانەوە بەدەستیان هێنابوو، وەربگرن و دواتر لە سەدەکانی دواتردا، توانیان پەرەی پێبدەن و بیخەنە بەردەم گەلانی دیکە. بەتایبەت لە ماوەی نێوان سەدەی نۆ و یازدەهەمدا کە قۆناغی داهێنان بوو لە بواری زانستدا.

ئەگەر سەیری ئەو بەرهەمە زانستییانە بکەین کە مسوڵمانان بەرهەمیان هێناوە، بۆمان دەردەکەوێت زاراوە و چەمکەکانی زمانی عەرەبی بوونەتە زمانی زانست، سەردەمی زێڕینی مێژووی زانستی ئیسلامی، دیارترین بەرهەمە زانستییەکانی ئەم قۆناغە لە بوارەکانی بیرکاری، فیزیا، کیمیا، پزیشکی و فەلەکناسیدا بوون.

## سەرچاوەکان


**عەرەبی**

١ – الاغانيا لطبعه الأولى (مصر، ١٩٦٣ م)۔ ابن أبى اصيبعة: موفق الدين أبى العباس احمد بن القاسم بن خليفة بن يونس (ت ٦٦٨ هـ / ١٢٧٠ م)

٢ – عيون الانباء فى طبقات الاطباء دار الفكر، بيروت، ١٩٥٦ م) ـ البيرونى : أبو الريحان محمد بن احمد (ت ٤٤٠هـ / ١٠٥٢ م ).

٣ –الجماهر فى معرفة الجواهرعالم الكتب الجاحض : أبو عثمان عمر بن بحر (ت ٢٥٥ هـ / ٨٦٨ م ).

**فارسی**

ـ نهضت ترجمه در جهان اسلام. نويسندگان: على بيگدلى. منبع: معرفت ١٣٧٢ شماره ٥. حوزه هاى تخصصى: جامع علوم انسانى.

ـ پديد اورندگان : نويسنده: برتولد اشپولر، مترجم: قمر اريان. موضوع : كشورهاى اسلامى – تاريخ، خلافت. ناشر : مؤسسه انتشارات اميركبير. محل نشر : تهران. زبان اصلى : المانى.

**ئینگلیزی**

- Symbols of Authority in Medieval Islam: History, Religion and Muslim Legitimacy in the Delhi Sultanate. Profile image of Blain AuerBlain Auer.2012, I. B. Tauris

-The Caliph›s Heirs, Brothers at War : the Fall of Baghdad ,By Jirjī Zaydān

**تورکی**

- İslam Uygarlığında Mimari Geometri Fizik Kimya Tıp. Saatler, Optik, Mineraller, Savaş Tekniği, Antik Objeler، Yazar: Fuat Sezgin. Yayınevi : Boyut Yayın Grubu 2018.

# بەرهەمەکانی ڕێکخراوی خاڵ




## ناساندنی کتێب:الامة في الرؤية الاسلامية

لەسەروبەندی پێشەنگەی نێودەوڵەتی کتێب لە هەولێر ڕێکخراوی خاڵ کتێبێکی لە ژێرناوی «الأمة في الرؤية الاسلامية» بە چاپ گەیاند، لە بنەڕەتدا کتێبەکە نامەیەکی ئەکادیمییە و وەک بەشێک لە پێداویستییەکانی وەرگرتنی بڕوانامەی ماستەر نووسراوە، ئەمە چاپی دووەمیشیەتی، چاپی یەکەمی لە «دار الكتب القانونيية» لە قاهیرە و «دار الشتات لە شاريقة» بە هاوبەشی چاپکراوە. ئەم کتێبە لە چواربەش پێکهاتووە، لە بەشی یەکەم شیکردنەوەیەکی ووردی چەمکەکانی ئوممەت و قەوم و قەومییەت و پەیوەندیان بە یەکەوە لەهەردوو دیدگای ئیسلامی و خۆرئاویی بە قوتابخانە جیاوازییەکانییەوە کراوە، لەم بەشە نووسەر گەیشتۆتە ئەو ئەنجامەی کە چەمکی ئوممەت دەلالەت و ماناکانی زۆر جیاواز و فراوانترن لە چەمکەکانی قەوم قەومییەت، ئوممەت بە تەنها چەمکێکی سیاسی نییە، لە رووی دەلالەتەوە پەیوەست نییە بە بوون و نەبوونی دەوڵەتەوە، بەڵکو چەمکێکی ژیارییە «الحضاري»، بان هەر پێکهاتەیەکی ترە وەک نەتەوە و نەتەوایەتی و گەل و ...هتد، ئەنجا تایبەتیشە بە ئوممەتی ئیسلامی و ئەو ووشەیە لەگەڵ هاتنە خوارەوەی قورئان ئەم دەلالەتانەی وەرگرتووە، ووشەی ئوممەت نە خۆی و نە هاوواتاکەی لەهیچ زمانێکدا نییە، و بە تەنها ووشەیەکیش تەرجەمە ناکرێت بۆ زمانی تر، بەڵکو دەبێت خۆی پێناسە بکرێت.

لە بەشی دووەم تیشکی خستۆتە سەر پایە و تایبەتمەندیەکانی ئوممەت، پایەکان

بریتین لە هەر یەک لە «یەک ئینتمایی» و «یەک ئامانجی» و «بوونی یەک هەست و سۆز و مەشاعیر»، تایبەتمەندییەکانیش بریتین لە میانڕەوی «أمة وسطا» و باشترینی «خير أمة» و یەکییەتی «أمة واحدة».

لە بەشێکی تر ئەمە ڕوونکراوەتەوە کە گوتاری شەرعی، وەک لە قورئاندا هاتووە ڕووی لە ئوممەتە، نەوەک دەوڵەت و دەستەڵاتی سیاسی، جێبەجێکی کردنی شەرع و ئەحکامی ئیسلام ئوممەت لێی بەرپرسیارە، بەڵام لە ڕێگەی دەزگا و دامەزاوەکانی دەوڵەت کە دەوڵەت خۆیشی جگە لە دامەزاوەیەکی ئوممەت شتێکی تر نییە، لەڕێگەی گرێبەستێکەوە ئەرکەکانی خۆی بەو دەسپێرێت. هەر لەم بەشە بەراوردێکی وورد کراوە لە نێوان هەردوو دیدگای ئیسلام و خۆرئاوا سەبارەت بە گرێبەستی کۆمەڵاییەتی، ئەوە سەلماوە کە ئەگەرچی دیدگای خۆرئاوا لەم بابەتە بە تایبەت لای جان جاک ڕۆسۆ زۆر سودی لە ژیاننامەی پێغەمبەر و فقهی ئیسلامی وەرگرتووە، ڕۆسۆ خۆیشی ئەمەی نەشاردۆتەوە و لە چەندین شوێن لە کتێبەکەیدا ئاماژەی بە گرنگی شەریعەتی محەممەد سەلامی خودای لەسەر بێت کردووە، بەڵام لەگەڵ ئەوەش هێشتا دیدگای ئیسلام بۆ بابەتەکە زۆر پێشکەوتوو تر و ڕوونترە. لە کۆتا بەشدا باس لە زەرورەتی بوونی قەوارەیەکی سیاسی دەکات کە لە میانیدا ئوممەت بتوانێت گوزارشت لە شهودی ژیاری خۆی بکات، بۆ ئەوەی ئوممەت بتوانێت گوزارشت لە بوونی تەواوی خۆی بکات و ببێتە شاهید و گەواهێدەر لەسەر مرۆڤایەتی پێویستی بە دورستکردنی قەوارەیەکی سیاسی هەیە، کە بریتییە لە دەوڵەت، لەم بەشەدا بە درێژی بۆچوونی زانایانی پێشین و شەرعناسەکان سەبارەت بە فۆرم و چۆنییەتی ئەو دەوڵەتە و ڕەوایەتی ئاخۆ شەکلێکی نەگۆڕی هەیە یان دەکرێت بە پێی پێشکەوتنی هزر و فەرهەنگ و ئاڵۆزی کۆمەڵگە مرۆییەکان بگۆڕێت خراوەتە ڕوو و گفتوگۆی لەبارەوە کراوە، هەروەها موناقەشەیەکی زانستیانە و مەنهەجیانەی بۆچوونی زانایان کراوە سەبارەت دورستی و نادورستی فرەیی دەوڵەت لە ناو ئوممەتدا، واتە بوونی زیاد لە یەک دەوڵەت لە ناوخۆی ئوممەتی ئیسلامی، ئایا پێچەوانەی وەحدەی ئوممەتە یان نا، توێژەر ترجیحی فرەیی داوە و وەڵامی بەڵگەکانی بۆچوونەکەی تریشی داوەتەوە، باسی لەو چوارچێوانەش کردووە کە دەکرێت وەحدەتی ئوممەتی تێدا بپارێزرێت، هەر لەم بەشدا تەئصیلێکی زانستی لە میانی ئایەتەکانی قورئانی پیرۆز بۆ پرنسیپی مافی چارەی خۆنووسین «حق تقرير المصير» کراوە.

**گۆڤاری خاڵ**




## بەرچنە

بەرچنە کتێبێکی ٣٣٦ لاپەڕەیی، ئیبراهیم عەبدوڵڵا ئاڵییە، کە تیایدا لێکدانەوەی بۆ ریشەی ٢٦٧ وشە و دەستەواژەی کوردی کردووە، ئەوەش پاش ورد خوێندنەوەیەکی زۆر لەو بوارە دا، دیدار و گفتوگۆی لەگەڵ سەدان دایک و باوکی بەتەمەندا و ئەزموونی دەیان ساڵی گەڕانی خۆی بە دوای ئەو وشە و دەستەواژانەدا. کە لە ئەنجامدا توانیویەتی مەڵۆیەکی پڕ سود لە خزمەت بخاتە سەر خەرمانیی ریشەناسیی وشە و دەستەواژە کوردیەکان. بۆیە رێکخراوی خاڵ بە خۆشحاڵیەوە لە زنجیرە (٥٣)ی کتێبەکانی خۆیدا جێگەی کردەوە و بەچاپی گەیاند.

**ئێستا لە کتێبخانەکان دەستدەکەوێت.**




## کۆبەرهەمی د.حەسەن پێنجوێنی

دکتۆر حەسەن پێنجوێنی لە سەرەتای هەشتاکانەوە خزمەتی بە زمان و ئاینەکەی دەکات و خاوەنی خەرمانێک نووسینی ناوازەیە، بۆیە پاش مۆڵەت لێوەرگرتنی، ڕێکخراوی خاڵ و ناوەندی ڕێنوێن سەرجەم بەرهەمەکان کۆدەکەنەوە و ڕێکیان دەخەنەوە و لە چاپیان دەدەن، کە پێکدێت لە:

١ - بیرەوەرییەکانی بانگخوازێک.

٢ - کۆی چیرۆکەکان.

٣ - بابەتە فیقهی و شەرعیەکان.

٤ - بابەتە گشتییەکان.

ئێستا کتێبی یەکەم (بیرەوەرییەکانی بانگخوازێک) لە چاپخانەیە، ئەم بەرگە بە سوپاسەوە لەسەر ئەرکی سەنتەری زەهاوی بۆلێکۆڵینەوەی فیکری چاپ دەکرێت.

# مەبەستەکانی شەریعەت




مەبەستەکانی شەریعەت نوێترین بڵاوکراوەی هەردوو ڕێکخراوی خاڵ و ناوەندی ڕێنوێنە، کە وەرگێڕانی حەوت کتێبی زانای گەورە دکتۆر ئەحمەد ڕەیسیونی سەرۆکی پێشووی یەکیتی زانایانی جیهانی موسڵمانە. کتێبەکان سەرجەمیان باس لە مەبەستەکانی شەریعەت دەکەن لە بوارە جیاوازەکاندا، دەستی خوێنەر دەگرن تا زیاتر شۆڕ بێتەوە و ڕایمێنێت لە دەقەکانی قورئان و فەرموودە و بە تێگەیشتنێکی ڕووکەش وازنەهێنێت. ئەم حەوت بەرهەمە بە دیزاین و چاپێکی زۆر جوان لە بۆکسێکدا کۆکراونەتەوە، کە ئەم بەرگانەن:

١. فیکری ئیسلامی و بابەتە سیاسیە هاوچەرخەکان، وەرگێڕانی ئەرکان ڕەشید معروف.

٢. خوێندنەوەیەک لەسەرئەخلاق (ئەرکان ڕەشید معروف)

٣. گەل سەرچاوەیە، وەرگێڕانی (ئەرکان ڕەشید معروف)

٤. چەند وانەیەک لە مەبەستەکانی شەریعەت (یاسین ئەحمەد زەنگەنە)

٥. بە خۆداچوونەوە و بەرگریەکان (زانا ڕۆستایی)

٦. مەبەستی مەبەستەکان (عومەر ڕەشید)

٧. بنەما سەرەکیەکانی شەریعەتی ئیسلامی (مەحموود حەمەئەمین)

ئێستا لە کتێبخانەکان دەستدەکەوێت.

# ئاگاداری و ڕوونکردنەوە

## بەرەو کۆکردنەوەی (کۆبەرهەمی نووسەر و بیریاری گەورە مەسعود محەممەد)




ڕێکخراوی خاڵ بۆ هزر و ڕۆشنبیری، بە هاوکاریی بژاردەیەک لە نووسەران و خەمخۆرانی بیر و وشە و زمانی کوردی، پاش وەرگرتنی مۆڵەت لە بنەماڵە بەڕێزەکەیان، سەرقاڵی کۆکردنەوەی سەرجەم نووسین و دیمانە و وتار و نامەکانی نووسەر و بیریاری گەورە مەسعوود محەممەدە، کە سامانێکی گەورەی لە بوارەکانی هزر و ئەدەب و زمان و ڕۆشنبیری و سیاسەتدا لە دوای خۆی بۆ بەجێ هێشتووین.

دیارە مامۆستا مەسعود محەمەد زیاتر لە نیو سەدە شۆڕەسواری ئەو بوارانە بووە، زۆر لە بەرهەمەکانی ( جگە لە کتێبە بڵاوکراوەکانی) وەک: وتار، دیمانە، نامەکانی ،تا ئێستا لە ناو ڕۆژنامە و گۆڤارە کوردی و عەرەبیەکان یا لە لای بنەماڵە و دۆستانی یان لە ناو ئەرشیفی دەزگا و کەسەکاندا بە پرش و بڵاوی ماونەتەوە، کۆکردنەوەی هەموو ئەمانەش پێویستی بە هاوکاری سەرجەم شارەزا و ئاشنایان و دڵسۆزانی مامۆستا مەسعود محەمەد و کەلتووری کوردییە. بۆیە داوا لە هەموو ئەو بەڕێزانە دەکەین کە زانیارییان هەیە لەسەر هەر بەرهەمێکی نووسین و دەنگیی ،لە نامە ،وتار،دیمانەی مامۆستا هاوکارمان بێت بۆ سەرخستن و تێر و تەواو بوونی پرۆژەکە، بە دڵنیاییەوە ئەرک و ماندووبوون و هاوکاریانمان لەبەر چاو دەبێت و ڕێزیان لێدەگرین.

**ڕێکخراوی هزری و ڕۆشنبیری خاڵ**

**٢٠٢٣/٥/١**

# ئینسایكلۆپیدیای پارێزگای هەڵەبجە

**پرۆژەیەكی هاوبەشی نێوان زانكۆی هەڵەبجە و ڕێكخراوی خاڵ بۆ هزر و رۆشنبیری . یە.**




ئامانجی ئەم پرۆژەیە كۆكردنەوەی زانیارییە لەسەر لایەكانی (جوگرافی، مێژوو، یاسی، سەربازی، ئابووری، كۆمەڵایەتی، ڕۆشنبیری، دامودەزگا)ی ئێستای سنووری پارێزگای هەڵەبجە، بەشێوەیەكی زانستی كورت و پوخت. پاشان چاپكردنیانە لە چەند بەرگێكدا و بڵاوكردنەوەیانە لە پێگەی ئەلەكترۆنیدا.

ئەم پرۆژەیە لە مانگی ئابی ٢٠٢٢ دەستی بەكارەكانی كردووە، بڕیارە لە ماوەی دوو ساڵ و نیودا كۆتایی بەكارەكانی بهێنرێت. پرۆژەكە پەیكەری ئیداری بۆ پێكهێنراوە و بەپێی پسپۆڕی كارەكانی بە سەر پێنج بۆردی جیاوازدا دابەشكراوە، كە زیاتر لە سی مامۆستای زانكۆ و نوسەر و ڕۆشنبیر تیایاندا بەشدارن. تا ئێستا زیاتر لە نیو ملیۆن وشە لەكۆی بابەتەكان كۆكراوەتەوە و نووسەرانمان بەرۆحێكی زانستییەوە بەردەوامن لە كاركردن...

**جێگای ڕێز و پێزانینە كە خێرخواز (شێخ عەلی شێخ عیززەدین) ئەركی دارایی ئەم پرۆژەیەی لەئەستۆگرتووە.**

# دواخاڵ

نووسینی: هێمن عەبدولقادر

## (خواردنی خێرا) و (ئاگاهی خێرا)

## (fast awareness) و (fast food)

### له نووسینی قوڵەوه، بۆ لایف و کورته ڤیدیۆ

**پێشەکی:**

ڕۆشنبیر و نووسەر ئەرکێتی که به زمانێکی ساده بێته ئاخاوتن و نووسین، بۆئەوەی پەیامەکانی بەسادەیی بگەن و زۆرترین کەس سوودیان لێببینێت، بەڵام ئەرکی نووسەر و ڕۆشنبیر نییه بەخواستی بازاڕ بنوسێت و بێتەگۆ چونکه ئەوه کاری بازرگانه نەک (خوێنەوار)، بازرگان له بازاڕدا بەدوای قازانجەوەیه، بەڵام نووسەر بەدوای هۆشیاری دەستەجەمعییەوەیه، بازرگان گوێناداته کوالیتی کاڵا و دەرهاویشتەکانی، چونکه تەنها پارەکۆکردنەوه ئامانجەکەیەتی، بەڵام ڕۆشنبیر دەبێت ئاگای له وشه به وشەی نوسینەکانی بێت، چونکه کۆمەڵگه بەگشتی ئامانجەکەیەتی، ئەرکی نووسەره ئاستی هۆشیاری خوێنەر و خەڵکه سادەکه بەرزکاتەوه بۆ ئاستی خۆی، بەڵام ئەرکی نووسەر نییه دابەزێت بۆ ئاستی هۆشیاری ئەوانی تر.

دەردەکه لێرەوه دەست پێدەکات که سەرلەبەری (دەزگاکانی میدیا و میدیاکار و مامۆستای ئایینی و توێژەر و پارێزەر و نوسەر و مامۆستای زانکۆ و ماستەر و دکتۆرا ... تاد) بەگوێرەی خواستی (بازاڕ-بینەر) بێنەگۆ.

کاتێک بازاڕی مەعریفه کۆکردنەوەی لایک و کۆمێنت و ڤیو هەڵیدەسوڕێنێت، نووسەری ساخته و ڕاهێنەری ساخته و ئامۆژگاریکەری ساخته و میدیاکاری ساخته و له دەرەنجامیشدا پەرلەمانتاری ساخته و یاسای ساخته و کۆمەڵگەی ساخته دێته ئاراوه.

# (خواردنی خێرا) و (ئاگاهی خێرا)

## (fast awareness) و (fast food)

### لە نووسینی قوڵەوە، بۆ لایف و کورتە ڤیدیۆ

**پێشەکی:**

ڕۆشنبیر و نووسەر ئەرکێتی کە بە زمانێکی سادە بێتە ئاخاوتن و نووسین، بۆئەوەی پەیامەکانی بەسادەیی بگەن و زۆرترین کەس سوودیان لێببینێت، بەڵام ئەرکی نووسەر و ڕۆشنبیر نییە بەخواستی بازاڕ بنوسێت و بێتەگۆ چونکە ئەوە کاری بازرگانە نەک (خوێنەوار)، بازرگان لە بازاڕدا بەدوای قازانجەوەیە، بەڵام نووسەر بەدوای هۆشیاری دەستەجەمعییەوەیە، بازرگان گوێناداتە کوالیتی کاڵا و دەرهاویشتەکانی، چونکە تەنها پارەکۆکردنەوە ئامانجەکەیەتی، بەڵام ڕۆشنبیر دەبێت ئاگای لە وشە بە وشەی نوسینەکانی بێت، چونکە کۆمەڵگە بەگشتی ئامانجەکەیەتی، ئەرکی نووسەرە ئاستی هۆشیاری خوێنەر و خەڵکە سادەکە بەرزکاتەوە بۆ ئاستی خۆی، بەڵام ئەرکی نووسەر نییە دابەزێت بۆ ئاستی هۆشیاری ئەوانی تر.

دەردەکە لێرەوە دەست پێدەکات کە سەرلەبەری (دەزگاکانی میدیا و میدیاکار و مامۆستای ئایینی و توێژەر و پارێزەر و نوسەر و مامۆستای زانکۆ و ماستەر و دکتۆرا ... تاد) بەگوێرەی خواستی (بازاڕ-بینەر) بێنەگۆ.

کاتێک بازاڕی مەعریفە کۆکردنەوەی لایک و کۆمێنت و ڤیو هەڵیدەسوڕێنێت، نووسەری ساختە و ڕاهێنەری ساختە و ئامۆژگاریکەری ساختە و میدیاکاری ساختە و لە دەرەنجامیشدا پەرلەمانتاری ساختە و یاسای ساختە و کۆمەڵگەی ساختە دێتە ئاراوە.

**چۆن بە دوو خاڵ ژیانت دەگۆڕیت؟**

**چۆن بە سێ خاڵ هاوسەرەکەت عاشقت ئەبێت؟**

چۆن بە خاڵ و نیوێک ئاگات لە تەندروستی دڵت بێت؟ چۆن بە چوار خاڵ خەوێکی باشمان هەبێت؟ پێنج خاڵ سەبارەت بە دانانی کەوچک و قاپ لە میوانی؟ حەوت خاڵ چۆن دەستمان دانێین لەکاتی چاوپێکەوتن؟ سێ خاڵ بۆ ئەوانەی دڵیان تەنگە؟ ئەم هەموو خاڵە زیاتر سەروکاری لەگەڵ ئەزنیف و دۆمینەدا دێتەوە نەک

لەگەڵ مەعریفە یان هۆشیاری قوڵ.
خوێنەری ئێستا خوێنەرێکی خێرا و تێپەرە، حەوسەڵەی چوار دێڕ زیاتری نیە وەک ئەو کەسەی کە حەوسەڵەی ئامادەکردنی برنجێکی نیە. خواردنی خێرا پاساوەکەی نەبوونی کاتە، ئاگاهی خێراش بەهەمان شێوە، لە خواردنی خێرادا بڕێکی زۆر لە چەوری و شەکری ناپێویست هەیە، لە ئاگاهی خێراشدا بڕێکی زۆر ژەهری کوشندە هەیە کە وەرگر هەستی پێناکات، خواردنی خێرا لاشەی مرۆڤ تێکدەدات، هەر بەو چەشنەی کە مەعریفەی خێراش ئاستی گفتوگۆ و مامەڵەکردن و هزرمان لەگەڵ یەکتر تێک دەدات.
ئەوە هەر بەتەنها ماتۆڕەکانی دیلیڤەری نین کە بە شەقامەکاندا بەخێڕایی تێدەپەڕن تا خواردنەکان بگەیەنن بە ماڵەکان، بەڵکو ئەمڕۆ هۆشیاری خێرا لە ماتۆڕەکان خێراتر بە مێشکماندا گوزەر دەکەن، خواردنی خێرا ورگ و کەمەر و ژێر چەناگەت شۆڕ دەکاتەوە، مەعریفەی خێراش ئاستی زانین و بیرکردنەوەت شۆڕ ئەکاتەوە.
بەپاساوی نەبوونی کاتەوە مرۆڤ دەستی لەوە هەڵگرتووە کە خواردنێکی گەرم و بەچێژ لە چێشتخانەکەیدا ئامادە بکات، بەردەوام پاکەتێک پێچراوە یان لەسەر مێزەکەیەتی یان لەبەردەرگاکەی، هەر بەوچەشنەی کە مرۆڤ دەستی هەڵگرتووە لە خوێندنەوەی چواردێڕی قوڵی تێکستێکی باش، کتێبێکی دووسەد لاپەڕەیی، بۆیە هەمیشە دەبینیت ڤیدیۆیەکی کورت، لایڤێکی چەند دەقیقەیی لەسەر شاشەی مۆبایل و لە ئارگۆمێنتی گفتوگۆکانیدا ئامادەیە.
چونکە لەڕاستیدا (ئاگاهی خێرا) ئیش لەسەر کۆکردنەوەی (حەشامات) دەکات، ئەوانەی کە بەشوێن ئاگاهی خێراوەن، پێیان خۆشە میدیایەک، دەزگایەک، کەسێک، نوسەرێکیان دەستکەوێت، بەئەندازەی ئاگاهی و عەقڵ و ژیری خۆیان بۆیان بدوێت، نەک بەئەندازەی (قوڵی کێشەکان)، هەربۆیە کاتێک ڕۆژێکی نوێ هەڵدێت ئاگاهییەکەشی بەخێرای تێدەپەڕێت، ئەوکات نەک چوار خاڵ و پێنج خاڵ، نەک کورتە پەیام و کورتە ڤیدیۆ و سیمینار و